# توێژینەوە

گۆڤارێکە بایەخ بە کۆمەڵگا, سیاسەت و مەعریفە دەدات

ژمارەی (١)ساڵی یەکەم, نیسانی ٢٠٠٥



. گۆڤاری توێژینەوە لەلایەن ( بنکەی توێژینەوە)

لە (دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی) دەردەچێت

هەولێر - کوردستان

ناوی گۆڤار : توێژینەوە

ژمارە (١) ساڵی یەکەم- نیسانی ٢٠٠٥

تایپ: هاوار

هەڵەچنی: فازڵ عمر رەشید, دلاوەری رەحیمی

نەخشەی بەرگ و دەرهێنانی هونەریی: هونەر مەرجان, سلێمان یاسین

سەرپەرشتیاری چاپ: هێمن نەجات

چاپخانەی پەروەردە - هەولێر

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخی: ٢٠٠٠ دینار

ئەدرەس: هەولێر, دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی, نزیک رۆژنامەی خەبات

تەلەفۆن: ٢٢٦٢٥٤٥

E-Mail: Mukriyani@yahoo.com
azahasib@ yahoo.com

تکا لە توێژەرەوان و نووسەران و وەرگێڕە بەڕێزەکان دەکەین ئەو بابەتانەی بۆمانی دەنێرن ئەگەر بە چاپی کۆمپیوتەر بێت باشترە, ئەگەر نا با بە خەتێکی جوان و شاش لە یەك دیوی لاپەڕەدا نووسرا بێت. بابەتە وەرگێڕدراوەکان دەبێت دەقە ئەسڵەکەی لەگەڵدا بێت و ئاماژەی تەواو بە سەرچاوە کرابێت.

## ناوەڕۆك



**لە ژمارەی داهاتوودا:**

* مافی چارەی خۆنووسین و ریفراندۆم لە نووسینی ( ئاسۆ کەریم).
* دیمانەیەك سەرنووسەر لەگەڵ بیرمەندی کورد دکتۆر ( عەباسی وەلی) سازی کردووە.
* پلۆرالیزم و توندوتیژی لە روانگەی ( هانا ئارنت)ەوە شێرکۆ سەردار کردوویەتی بە کوردی
* چەمکی گەشەپێدان.. گەڕانەوەی رێز بۆ مرۆڤ (شەماڵ نوری) کردوویەتی بەکوردی

## ناساندن

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی لە چوارچێوەی کارەکانیدا ئەم گۆڤارە دەردەکات, بایەخ بە بابەتەکانی کۆمەڵگا, سیاسەت و مەعریفە دەدات.

ئەم گۆڤارە لە سەرەتادا دوو مانگ جارێ دەردەچێ, بەشدارییەکە لە پرۆسەی پێشکەوتن و گەشەی مەعریفە و رۆشنبیری لە کۆمەڵگای کوردستان لە رێی بڵاوکردنەوەی بابەتی نووسراو و وەرگێڕدراوەوە کە سیما و خەسڵەتە سەرەکییەکانی توێژینەوەی زانستییان هەبێ. جگە لە بایەخدان بە ئەسڵە فەلسەفییە کلاسیك و نوێیەکان و بەرهەمە هزرییەکانی مێژووی کۆن و هاوچەرخی مرۆڤایەتی لە کایە جۆراوجۆرەکاندا, ئەم گۆڤارە بایەخ دەدات بە لێکۆڵینەوە و کێومالّی زانیاری لەبارەی کێشە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و یاسایی و رۆشنبیرییەکانی کۆمەڵگای کوردستان.

ئەم گۆڤارە پشتئەستوورە بە تواناکانی توێژەرەوان و نووسەران و وەرگێڕە بەڕێزەکانی خۆمان کە هاوکاری بکەن و پێکەوە لەم ئەرکەدا سەرکەوتوو بن.

ئەمەیان ژمارەی یەکەمی ( توێژینەوە) یە و چاوەڕێی سەرنج و تێبینییەکانی ئێوەیە بۆ هەڵسەنگاندن و دەوڵەمەندکردنی بەو ئاراستەیەدا کە ژمارەکانی داهاتوو رووی لە سەرکەوتنی زیاتر بێ.

# هێورکردنەوەی دڵەڕاوکێکانی تورکیا لەبارەی ئاواتەکانی کوردەوە

ئامادەکردنی:
ئازا حەسیب قەرەداخی

---

ئەنتەرناشیۆناڵ کرایسز گروپ (Crisis Group) ڕێکخراوێکی بێلایەنی فرەرەگەزە بەمەستی قازانج کار ناکات. بۆ ئیش کردن لە پێنج کیشوەرەکەدا ١٠٠ کارمەندی هەیە.

بارەگای سەرەکی گروپ لە برۆکسلە, نووسینگەی راوێژکاریی لە واشنتۆن و نیۆیۆرك و مۆسکۆ و لەندەن هەیە. ئێستا لە ١٧ناوەندی مەیدانیی کاردەکات و توێژەرەکانیشی لە ٤٠ ناوچە کاردەکەن کە ئەگەری ئەوەیان لێ دەکرێ تووشی قیران بن.

ئەنجوومەنی بەڕێوەبەرایەتی ئەم ڕێکخراوە کەسایەتی بەرچاوی سیاسیی و دبلۆماسی و بزنس و ڕاگەیاندنی تێدایە کە مەبەستیانە بە بوونی خۆیان سەرنجی داڕێژەرانی سیاسەت لە سەرانسەری جیهاندا ڕاکێشن بۆ ئەو ڕاپۆرت و ڕاسپاردانەی کرایسز گروپ پێشکەشیان دەکات. سەرۆکی ئەم ڕێکخراوە سەرۆکی پێشووی فیللەندا (مارتی هتساری)ـەو بەڕێوەبەری کارگێڕییەکەیشی (گارپ ئیفانز) وەزیری پێشووی دەرەوەی ئوسترالیایە.

کرایسز گروپ هاوکاری لە حکومەت و دامەزراوە خێرخوازەکان و کۆمپانیا و خەڵکی بەخشندە وەردەگرێ.

شێوازی کارکردنی گروپی کرایسز توێژینەوەی مەیدانییە و, تیمەکانی بۆ توێژینەوەی سیاسی لەو جێگە و دەوڵەتانەن, یان لەو نزیکانە دەبن کە ئەگەری هەڵگیرسانی شەڕ و پێکدادان و ئاژاوەیان لێ دەکرێ. بەپێی ئەو ڕاپۆرت و زانیارییانەی دەستی کرایسز دەکەوێ, ڕاپۆرتە توێژینەوەی شیکاریی ئامادە دەکرێ کە ڕاسپاردەیان تێدایە بۆ بڕیاردەرە نێودەوڵەتییە سەرەکییەکان و لایەنانی پەیوەندیدار بەو کێشە دیراسەکراوانەوە.

ئەم ڕێکخراوە بایەخی زۆری بە کورد و مەسەلەکەی داوە لە عێراقدا, بە تایبەتیش پاشی ڕووخانی ڕژێمی سەددام, زیاتریش لە سۆنگەی مەسەلەی کەرکووکەوە کە بە لای ئەوەوە " ئاڵۆزترین لایەنی ڕێکخستنەوەیە". تا ئێستا ئەم ڕاپۆرتانەی لەمبارەیەوە ئامادەکردووە:

**١- ڕاپۆرتی ژمارە ١٠ لە١٩ی ئاداری ٢٠٠٣ دا بە ناونیشانی( جەنگی عێراق, هەنگاوی داهاتووی کوردەکان چییە؟).**

**٢- لاپەڕەکانی ١١ تا ١٧ لە ڕاپۆرتی ژمارە ١٩ کە لە١٣ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٣دا بە ناونیشانی (پرکێشییەکانی دەستوور لە عێراقدا) دەرچووە.**

**٣- ڕاپۆرتی ژمارە ٢٦ کە لە ٨ ی نیسانی ٢٠٠٤ دا بە ناونیشانی ( کوردەکانی عێراق: بەرەو چارەسەرێکی مێژوویی) دەرچووە.**

**٤- راپۆرتی ژمارە ٣٥ ی کرایسز گروپ کە لە ٢٠٠٥/١/٢٦ دا دەرکراوە تایبەتە بە بارودۆخی قەیرانگرتووی عێراق بە ناونیشانی : (هێورکردنەوەی دڵەڕاوکێکانی تورکیا لەبارەی ئاواتەکانی کوردەوە).**

ئەمەی لێرەدا بڵاوکراوەتەوە ئامادەکراوێکی گرنگترین لایەنەکانی ئەم راپۆرتەی چوارەمە بەو پەراوێزانەشەوە کە بۆ روونکردنەوە یان بەڵگەهێنانەوە لە راپۆرتەکەدا ئاماژەیان بۆ کراوە و زۆر گرنگ و پڕ زانیارین.

جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەم کە بڵاوکردنەوەی ئەم راپۆرتە, بەڵگەی ئەوە نییە خودی خۆم و گۆڤارەکەشمان هەموو شیکردنەوە و دەرەنجامەکان و پێشنیار و راسپاردەکانی دەسەلمێنین, بە تایبەتیش لەو لایەنانەوە کە دواتر ئێوەش دەیانخوێننەوە و پێشنیار دەکات کەرکووك بخرێتە ژێر سەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە و نیمچە ئینتیدابێکی بەسەردا بسەپێنرێ و حاکمێکی نەتەوە یەکگرتووەکانی هەبێت, ئەو حاکمە دامودەزگاکانی پۆلیس و دادگا و خزمەتگوزارییەکان و ئەوانی دیکە "پێکەوەبنێت و بەڕێوەیان ببات و یاسا بسەپێنێ". سەرەڕای ئەو جیاوازییانەش بەلامانەوە گرنگ بوو کە بۆ خوێنەران و سیاسەتمەدارانی خۆمانی بگوازینەوە کە غەیری خۆمان چ جۆرە توێژینەوەیەك لەبارەی مەسەلەی کوردەوە دەکەن و چەندی بۆ ماندوو دەبن و چەندیشی بۆ خەرج دەکەن و سەر بە چەند شوێندا دەکەن و بە چ دەرەنجامێك دەگەن کە دواجار لە دارشتنی سیاسەتی دەوڵەتەکانیاندا سەبارەت بەم ناوچەیەو هەڵوێستیان لە مەسەلەی کورد رۆڵی کاریگەری هەنووکەیی و ئایندەیی دەبێت. بێگومان لەناو راپۆرتەکەشدا زانیاری گرنگ و نوێ و ئاماژەو هێمای پڕ مانای تێدایە لەبارەی جۆری بیرکردنەوە و جموجوڵ و پلانی هەموو ئەو لایەن و دەوڵەت و پێکهاتانەی راستەوخۆ بێت یان ناراستەوخۆ پەیوەندیدارن بە ئایندەی عێراق و کوردستانەوە کە بۆ ئێمە بایەخی زۆریان هەیە و دەبێت لە دارشتنی ستراتیج و پلانەکانی کاری سیاسی و دیبلۆماسی و پەیوەندییەکانماندا رەچاویان بکەین و وەك

بنەما بۆ تێگەیشتن لە توخمەکانی ناو بازنەی ململانێیەکانمان و بەرژەوەندییەکانمان بە هەند هەڵیانگرین.

## ١. پێشەکی

نەوت لە کرۆکی ئەو بارگرژییانەدایە کە بەردەوام لە کەرکوکدا روو لە زیادبوون و هەڵچوونی زیاترن. ئەمە قەیرانێکە لەوانەیە تا رادەی شەڕێکی بەربڵاو پەرە بگرێ لە نێوانی هەموو ئەو کۆمەڵانەی پێکهاتەی شارەکە و ناوچەکانی دەوروبەری, تەنانەت لەوانەیە بگاتە رادەی شەڕێکی ناوخۆیی و تورکیای باکوورەهاوسێی عێراقیش دەخالەتی تێدا بکات(١). کەچی هاوکات پرسیاری جددیش لەبارەی بڕ و جۆری نەوتەکەی کەرکووکیش هەیە. ئەوەی بە وردی زانراوە ئەوەیە لەم ناوچەیەدا بڕی ١٠ بلیۆن بەرمیل نەوتی یەدەگ لە ژێر خاکەکەیدایە و دەکاتە نزیکەی ١٠٪ کۆی یەدەگی عێراق(٢). ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە بیرەنەوتەکانی کەرکوک و دەوروبەری دووەمە لە دوای بیرەکانی رومێلە لە باشووری عێراق(٣).

ئەم سامانە بەسەر ژیانی ئابووری ناوچەکەدا زاڵە و, کۆمپانیای نەوتی باکوور NOC لەدوای حکومەت گەورەترین ناوەندی دامەزراندنی دەستی کارە لە عێراقدا. بەم هۆیەشەوە کەرکووک بۆتە ناوەندی کێشکردنی کارگەران. هەروەها جێ نیشانەی بەرنامەکانی حکومەتەکانی پێشوو بووە کە بۆ ساڵانێکی زۆر ئیشیان لەسەر گۆڕینی هاوسەنگی دانیشتوانەکەیدا کردووە. لەم چوارچێوەیەشدا هەڵمەتی تەعریب کردنی ئەم شارە و دەوروبەری کراوە و بەهەر شێوەیەك بووە دەیان هەزار کورد و تورکمانی گوندەکانی ئەم شارە دوور خراونەتەوە یان ناچارکراون کە لە کۆمەڵگا زۆرەملێکاندا بژین و مافی موڵکایەتی زەوییان نەبێ(٤). هەروەها کوردەکان لەناو خودی شاری کەرکووک دەرکراون یان وەکوو تورکمانەکان رێگەیان پێ دراوە بمێننەوە بەو مەرجە کە ئینتیمای ئیتنی و نەتەوەییان بگۆڕن بۆ عەرەب. ئەم کارە بە زاراوەی بەعسیان پێی گوتراوە "تصحيح قوميه". پارێزگای کەرکووک کە ناوەکەی ئەمیشیان گۆڕی بوو بۆ

"التأميم" دووچاری تصحيح قوميەیەکی تايبەت بە خۆی بووە بەوەی رژێم بەشی گەورەو فراوانی خاکەکەی, کە کورد و تورکمان زۆرینەی دانیشتوانەکەی بوون, لکاندوويەتی بە پارێزگای دیکەوە(٥).

## ٢- قەیرانی پەرەگرتوو لە کەرکووك

### أ- سیاسەتی گەڕانەوە

لەماوەی سالانی ٢٠٠٣ و ٢٠٠٤ دا ئەو کورد و تورکمانانەی پێشتر راگوێزرابوون و لە کەرکوك و دەوروبەرەکەی دەرکرابوون, ئەو دەرفەتەیان قۆستەوە کە رژێم رووخێنرا بگەرێنەوە بۆ زێدی خۆیان, یان ئەگەر گوند و ناوچەکانیان وێرانکرابن یاخود مینرێژ کرابن ئەوا بچنەوە ناو کەرکووك و لەژێر دەواردا بۆ ماوەی چەندین مانگ لە بێبەشی و پیسوپۆخلێدا بژین(٦). گوندییەکان هەر ئەوەندە نییە کە ماڵ و حاڵیان نەماوە بگەڕێنەوە سەری بەڵکو لەوەش زیاتر بەشێکی زۆر کەمیان حەزیان بەوە ماوە بچنەوە سەر کاری کشتوکاڵ کە ساڵانێکی زۆرە لێی دوورخراونەتەوە(٧).

گەڕانەوەی بە لێشاوی ئەمان بۆتە هۆی تێکچوونی پارسەنگی دیموگرافی شارەکە و, رێکخراوی نێودەوڵەتی کۆچ(IOM) لە ئەیلوولی ٢٠٠٤دا رایگەیاندووە کە ١٢هەزار و١٣٥خێزانی کورد و٣هەزار و ٩٢٥خێزانی تورکمان گەڕاونەتەوە بۆ کەرکووك و دەوروبەر(٨).

گەڕانەوەی راگوێزراوەکان لە کاریگەرییەکانی سیاسەت بێبەش نەبووە, ئەمە لەپاڵ ئەوەدا کە هەردوو حزبە کوردییە سەرەکییەکە- پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئیدارەی شارەکە و دامودەزگا ئەمنییەکانیان قۆرخ کردووە, بووەتە هۆکارێکی سەرەکی ئەو بارگرژییەی لەنێوانی کورد و تورکماندا هەیە سەرباری ئەوەی کە هەردووکیان قوربانیی دەستی رژێمی پێشوون. بە قسەی دانیشتوانە غیرە کوردەکەی کەرکووك بێتKDP و PUK هانی کوردە دوورخراوەکانیان داوە لە پارێزگا کوردییەکان و تەنانەت لە ئێران و تورکیاشەوە بگەڕێنەوە بۆ کەرکووك ئەگەرچی

کەرکووکیش نەبن بۆئەوەی بەر لە سەرژمێری یان هەڵبژاردن یاخود ریفراندومێکی پێشبینیکراو بۆ چۆنێتی بەڕێوەبردنی ناوچەکە ژمارەی کورد لە شارەکە زیاد بکات(٩).

بە پێچەوانەی ئەوەشەوە حزبە کوردییەکان دەڵێن ئەوان هەوڵیانداوە نەهێڵن گەڕانەوە بە لێشاو بێ و، ئەوەیشی گەڕاوەتەوە ئەگەر هەموویشی نەبێ بەڵام زوربەی هەرەزۆریان خەڵکی رەسەنی شاری کەرکووک و پارێزگاکەن.

لەوانەیە بەڵگە و بنەما بۆ قسەی هەردوو تەرەفەکە هەبێ, لەلایەکەوە بەڵگەی ئەوە هەیە کە لە کۆتایی هاوینی ٢٠٠٤دا کاریگەرییەکی زۆری سیاسەت لەسەر پرۆسەی گەرانەوە هەیە. کاتێك ساڵی نوێی خوێندن دەستی پێکرد و خێزانە کوردەکان زانیان مناڵەکانیان ناتوانن درێژە بە خوێندن بدەن چونکە قوتابخانەو مامۆستا و کەرەستەو کتێبی کوردی کەمن, ئەو کەلوپەلە کەمەی هەیان بوو پێچایانەوە و گەڕانەوە بۆ هەولێر یان سلێمانی. لە هەمان ماوەدا راگەیەنرا کە ئەو سەرژمێرییەی بڕیاربوو لە ١٢ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤دا بکرێ دواخراوە بۆ کاتێکی نادیار و ئیتر ئەوەی کە دەبێت کورد دەستبەجێ بگەڕێنەوە بۆ کەرکووك خاو بۆوە. لەسەر ئەم بنەمایەیە کە غەیرە کوردەکانی کەرکووك دەڵێن:" سەرنج بدەن حزبە کوردییەکان بۆ ئەوەیان نەبوو کورد بگەڕێتەوە لە کەرکووك بژین بەڵکو هەر بۆ ئەوەیان بوو لە سەرژمێرییەکەدا لە کەرکووك تۆمار بکرێن"(١٠).

لەلایەکی ترەوە ئەو کوردانەی لە نەهامەتییەکی زۆردا لە کەرکووك دەژین و ئەوانەشیان کە راگوێزرابوون و هێشتا لە پارێزگاکانی دیکە دەژین بە سوێوە گلەیان لە سەرکردایەتی کورد دەکرد کە نەیتوانیوە پشتگیری لۆجیستی و سیاسی و مرۆیی بۆ گەڕانەوەی ئەمان دابین بکات, لەکاتێکدا ئەمان زۆریان خەون بەوەوە بینیوە کە عەرەبە هاوردەکان دەربکرێن و ئەمان بگەڕێنەوە بۆ کەرکووك. ئەمەش لەلانی کەمیدا نیشانەی ئەوەیە کە حزبە کوردییەکان بە تەحەفوزەوە کاردەکەن چونکە لەلایەنی نوێنەرانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە بە وردی چاودێری دەکرێن(١١).

گەڕانەوەی کوردە ڕاگوێزراوەکان, بە زۆری نەبووە هۆی ناکۆکی و شەڕ لەگەڵ عەرەبە نیشتەجێیەکاندا لەسەر موڵکایەتی(١٢). زوربەی کوردە دەرکراوەکان لە بنەڕەتەوە کرێچی بوون نەك خاوەن موڵك, ئەوانەش کە دەرکراون بەرلەوە بە چاوی خۆیان دیتوویانە کە ماڵەکانیان وێرانکراوە یان فریا کەوتوون داویانە بە خزمێکی خۆیان. وەلێ گوندە کوردییەکان هەموویان کاولکراون و نەهێڵراون( بە(١٢) قوتابخانە و مزگەوت و بیری ئاوەکانیانەوە). هەندێ حاڵەت نەبێ کە عەرەبە هاوردەکان خانووی سادەو ساکاریان لەو شوێنانە دروست کردۆتەوە کە کوردەکان گەڕانەوە وێرانیان کردن. ڕژێمی پێشوو کە دەستی بەسەر موڵکی کوردەکاندا دەگرت دەیکرن بە دامودەزگای گشتی لەوانەش نووسینگە و بارەگای حزبەکەی, کەواتە هەر لە بناغەوە ناکۆکییەك نەماوە سەبارەت بە موڵکایەتی ئەوانە بەڵکو کێشەیەك هەیە ئەویش کێشەی گەڕانەوەیە بۆ سەر ماڵێك کە نەماوە. زوربەی عەرەبە هاوردەکان گواستوویانەتەوە بۆ گەڕەکی دیکە(١٣). ئەو حاڵەتانەش کە عەرەبەکان ( بە شێوەیەکی ڕەوا بووبێ یان ناڕوا) موڵکیان دەستکەوتبێ کە بە ئەسڵ هی کورد یان تورکمان بووبێ پاشی رووخانی رژێم دانیان بەوەدا ناوە کە بەهانەکانیان لاوازە و ئامادەن چۆڵی بکەن ( هەندێ جار لەژێر فشاردا ئەم ئامادەییەیان نیشانداوە) (١٤).

تا هەنووکە کێشەی سیاسی و مرۆیی پەیوەندیدار بە گەڕاندنەوەی دەیان هەزار کوردی دەرکراوەوە هەیە کە مەسەلەیەکی کڵپەکردووە و بە شێوەیەکی مەترسیدار بارگرژی دەنێتەوە, دەبێت دان بە بوونیدا بنرێ و چارەسەر بکرێ.

### ب- مەترسی بەرپابوونی ناکۆکی کۆمەڵایەتی

باڵادەستیی کورد لە کەرکووك لە سەرلەنوێ ناونانەوەی شەقام و دامودەزگاکاندا دەردەکەوێ ( بۆنموونە نەخۆشخانەی صدامیان گۆڕیوە بە ئازادی), ئاڵای کوردستانیان هەڵکردووە, حزبە کوردییەکان دەستیان بەسەر خانوبەرە گشتییەکان و بارەگاکانی حزبی بەعسدا گرتووە و, ئەوەندش ئیجرائی رەمزی و راشکاوانەیان کردووە کە بوونەتە

هۆی ناڕەزاییەکی زۆری ناوەندە غەیرە کوردەکان(١٥). حزبە کوردییەکان و نوێنەرانی دیکەی کورد لە ئەنجوومەنی پارێزگا و فەرمانگەکان و لیژنەی عەقاراتی عێراقی و لیژنەی دوورخراوەکان ( غەیرە کوردەکان ئەم نوێنەرایەتییە بە زۆر لەقەڵەم دەدەن) دەستیان بەسەر ژیانی سیاسیدا گرتووە و, بەرپرسە کوردەکانیش بە ئاشکرا ئەوە رادەگەیەنن کە نیازیانە دەست بەسەر کەرکووکدا بگرن و بیلکێنن بە ناوچە کوردییەکەوە(١٦).

کلدانە ئاشووریيە مەسیحییەکان رۆڵێکی بنەڕەتی دەگێڕن لە هێورکردنەوەی بارگرژییەکاندا. بە بێ لایەنانە خۆیان هێشتۆتەوە و سێ گەورەکۆمەڵە رکابەرەکە ترسیان لێیان نییە, بێدەنگن و هەرکاتێکیش داوایان لێ کرابێ ناوبژییان کردووە (١٧). تەنانەت چاودێرێکی رۆژئاوایی دەڵێ:" کە کۆمەڵەکانی ناو کەرکووك لەسەر هیچ رێکبکەون لەسەر ئەوە رێکدەکەون کە مەسیحییەك نوێنەرایەتییان بکات"(١٨).

یەکێك لە رکابەرە سەرەکییەکانی کورد تورکمانە کە هەندێکیان بۆ نموونە ئەو چوار حزبە نوێنەرایەتیان دەکەن کە پێیان دەوترێت " نیشتمانی" و لە بەرەی تورکمانیدا کۆبوونەتەوە. ئەم بەرەیە دەستکردی تورکیایە و بە زۆری تورکمانە سوننە مەزهەبەکانی تێدایە و لە لایەنی زۆرینەی تورکمانەوە بە چاوی گومانەوە سەیر دەکرێ چونکە گومان لە کۆڵەگە نیشتمانییەکانی رێکخراوێك دەکەن کە بیانی دروستی کردبێ. هەرچەندە هەندێ لە تورکمانە شیعەکانیش هاتوونەتە ریزی ئەم بەرەیەوە بەڵام بەشە هەرە زۆرەکەی بە سەرۆکایەتی رابەری روحییان ئایەتوڵا عوزما عەلی حسین سیستانی حزبی خۆیان دامەزراندووە و وا پێ دەچێ لەوەوە رێنمایی وەرگرن(١٩).

عەرەبەکان تەواو لێکترترازاون و دابەشی دوو پۆل بوون. یەکەمیان عەرەبە رەسەنەکانی کەرکووك کە لە ناوچەکانی الحدیدی و عبید و الجبوردان, دووەمیشیان عەرەبە هاوردەکان کە رژێمی بەعس هێناونی و لێرە نیشتەجێی کردوون. ئەوانەی یەکەم سوننەن و دووەمیشیان شیعەی باشوورن.

دانیشتووانە رەسەنەکەی کەرکووك هەر هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە دەبێ عەرەبە هاوردەکان هەرچییەکیان لە موڵك و ماڵ بە ناهەقی دەست کەوتووە بیگەڕێننەوە بۆ خاوەنەکانیان. هەروەها زوربەشیان لەسەر ئەوە کۆکن کە دەبێ خۆشیان بگەڕێنەوە بۆ سەر زێدی رەسەنی خۆیان جا لەهەر جێیەك بێت و خانووی لەوێ هەبێت یان نەبێت ( لانی زۆر وا پێ دەچێت خانووبەرەیان نەمابیت). بەڵام سەرەڕای ئەم کۆکییە ئەمان لەبارەی چۆنێتی و کاتی گەڕاندنەوەی ئەم هاوردانە رای جیاوازیان هەیە. کوردەکان سوورن لەسەر ئەوەی ئەمڕۆ بەر لە سبەی بگەڕێنرێنەوە, دەکرێ قەرەبووش بکرێنەوە و ئامرازەکانی گواستنەوەشیان بۆ مەیسەر بکرێ, بەڵام بە دڵنیاییەوە دەبێت بەر لە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی پارێزگاکان یان سەرژمێریی یان ریفراندوم بێ. کەچی لەلایەکی دیکەوە عەرەبی رەسەن و تورکمانیش هەن چونکە خانووەکانی خۆیان بەمان بەکرێ داوە و هێزێکی هەرزانی کارن کە لە ئایندەیەکی نزیکدا پێویستیان پێیان دەبێت بۆ ئیش کردن لە بینا و ئاوەدانکردنەوەدا, لەمانەش گرنگتر ئەوەیە کە بەشداری دەنگدان دەکەن لە هەڵبژاردنەکاندا و لە توانای کورد کەم دەکەنەوە.

هەوڵی کوردەکان هەر بۆ ئەوەندە نییە کە دیفاکتۆیانە یان شەرعییانە زاڵ بن بەسەر شارەکەدا, بەڵکو ئەوان دەیانەوێ دەسەڵاتیان بەسەر زوربەی هەرە زۆری شوێنەکانی پارێزگاکەدا هەبێ. ئەوان کار بۆ ئەوە دەکەن کە ئەو دابەشکردنە ئیدارییەی رژێم کردوویەتی هەڵیوەشێننەوە و پارێزگاکە بگەڕێننەوە سەر سنوورە ئیدارییەکەی پێش ساڵی ١٩٧٥و بەمەش ژمارەی کورد لە پارێزگاکە زیاد بکەنەوە. ئەم جموجووڵە بە ئاشکرا لەو ناوچانەدا دیارە کە پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی لە کەرکووك جیادەکەنەوە. ئەم ناوچانە ئەرزی حەرام بوون و رژێمی پێشوو هەموو خەڵکە کوردەکەی لێ دەرکردبوون و بە تەواوەتی چۆڵ کرابوون و پێی دەوترا "هێڵی سەوز". ئێستا کوردەکان دەگەڕێنەوە و خانوو گوندەکانیان لەوێ ئاوەدان دەکەنەوە. دانیشتوانە غەیرە کوردەکەو تەنانەت حکومەتی کاتی عێراقیش تەماشای ئەم

جموجووڵە دەکەن و پێیان وایە جووڵە پێکردنێکی راستەقینە و تۆقێنەری هێڵی سەوزە بەرەو ناوەوەی کەرکوک(٢٠).

سەرباری ئەوانەش جەلال تالەبانی سەرۆکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان(PUK) هەمیشە ئەوە دووپات دەکاتەوە کە دەبێت دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان زۆر زیاتر لە کەرکووکیش تێپەڕێت تا دەگاتە پارێزگای دیالە. مەڵبەندی یەکێتی نیشتمانیش لە خانەقین بەوە تۆمەتبارە کە " پاکتاوی رەگەزیی پێچەوانە"ی پیادە کردووە وەختێ سەدان خێزانی شیعەی عەرەبی لە ٢٠٠٣دا دەرکردووە.

ئەم رەفتارە یەکلایەنانە هاوسەنگی دیمۆگرافی تێکدەدەن و بارگرژییەکە توند و تیژتر دەکەنەوە.

### ٣- هەڵوێستی هەڕەشەییانەی تورکیا

گۆڕانکارییەکانی ناو کەرکووک زەنگی خەتەریان لەناو تورکیا لێدا کە کوردێکی زۆری لێ دەژی. تەنانەت لە کاتی خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگی ئازادی عێراق تورکیا بە شێوەیەکی گەورە لە ئەگەری جموجووڵی کورد نیگەران بوو کە بەرەو کەرکووک ببزوێ، دواتر ئەم ئەگەرە بە هاوپەیمانێتی کورد و ئەمەریکا یەکلابۆوە کە روودەدات، بۆیە پەرلەمانی تورکیا رازی نەبوو لە تورکیاوە هیچ ئاسانکارییەك بۆ ئەمەریکا بکرێ کە بەرەی باکوور لە دژی سەدام بکاتەوە(٢١). لەو کاتەوە ئیتر بە شێوەیەکی گشتی سیاسەتی تورکیا لەبارەی کەرکووك و باکووری عێراق و کوردەکانەوە تا رادەیەکی زۆر پەرچەکردارانەیە و کاردانەوەی زۆری پێوە دیارە(٢٢). تورکیا خۆیشی دەزانێ کە ئەگەر کار لە کارترازا زۆر زەرەر دەکات.

#### أ- بەرژەوەندی زیندوو و هێڵی سووری گۆڕاو

ئەو کاتەی لە پاشماوەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی دەوڵەتی تورکیا دروستکرا ناچارکرا کە واز لە هەموو داخوازییەکانی سەبارەت بە "ویلایەتی موسڵ" بهێنێت و،

هێزی زاڵی بەریتانیا کە دەیزانی چ سامانیکی سروشتی لەو ناوچەیەدا هەیە لکاندی بە دەوڵەتی نوێی عێراقەوە. بەم کارە هەر ئەوەی لێ نەکەوتەوە کە عێراق سامانێکی نەوتینەی دەست کەوت بەڵکو گەلی کوردیش پارچەپارچەتر کرا کە پێشتر بەپێی پەیماننامەی سیڤەر(Sevres) لە ١٩٢٠دا بەڵێنی ئەوەی پێ درابوو دەوڵەتی بۆ دروست بکرێ کەچی دوای سێ ساڵ بەپێی پەیماننامەی لۆزان لێی بێبەش کرا(٢٢).

ئەمڕۆ ١٢ تا ١٥ ملیۆن کورد لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیادا و, نزیکەی ٥ملیۆنیش لە باکووری عێراقدا دەژین کە سەرەڕای ئەوەی ئومێدیشیان کەم بۆتەوە بەڵام هەر خەون بەوەوە دەبینن کە دەوڵەتی سەربەخۆیان هەبێت. بوون و ڕۆڵی دەوڵەتی عێراق لە باشووری تورکیادا و ئاواتە نەتەوەییەکانی کورد لەمبەر و ئەوبەری سنوورەکەی دوو بزوێنەرە ستراتیجییەکەی تورکیا بوون کە پاڵیان پێوەنا ئەو ڕێبازەی هەبێ لە پەرەسەندنەکانی ساڵی ١٩٩١ و بە تایبەتیش لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٣دا. تورکیا سنووری بە ئەورووپاوەیە و دوا تخوبی هاوپەیمانێتی باکووری ئەتڵەسییە و چەند دەیەیەکە چاوی بریوەتە ڕۆژئاوا و خەون بەوەوە دەبینێ کە بە تەواوەتی تێکەڵی دامەزراوەکانی ڕۆژئاوا بێت بۆیە حەزی نەکردووە خۆی بگلێنێتە کێشەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەڵام هەوڵیشی داوە کە بازرگانی و سەرمایەگوزارییەکانیشی بەو لایەدا فراوان بکات. سەرنج دەدەین کە شەڕی عێراق – ئێران لە (١٩٨٠–١٩٨٨) بەرپا بوو تورکیا زۆر بە وریاییەوە چاودێری دەکرد بەڵام بێلایەنانە مایەوە(٢٤).

ئەنقەرە وای دەبینێ کە هێزی عێراق و یەکێتی خاکەکەی لەو مەترسییانەی کەم کردۆتەوە کە دەشێ لە ڕێی گەمەکەرە هەرێمایەتییەکانەوە توشی ببێ بە تایبەتیش لەلایەنی ئێران و سعودیەوە. بەرپرسێکی گەورە لە وەزارەتی دەرەوەی تورکیا لە دیمانەیەکدا لەگەڵ کرایسز گروپ ڕۆژی ٢٧ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤ ئەم مەسەلەیەی بەمجۆرە روون کردەوە کە: "هەمیشە عێراق لە ناوچەکەدا توخمی هاوسەنگی بووە و دەوڵەتەکانی دیکەی ناچارکردووە کە لە حاڵەتی دیفاع دا بن.. نیگەرانیی هەرە گەورەی تورکیا لەوەیە کە عێراق لەبەریەك هەڵوەشێ یان نەمێنێ و تورکیاش بە ئومێدی ئەوە

نییە کە ئەو هاوسەنگییە بکات هەرچەندە ئەڵتەرناتیڤێکیش بۆ خۆی لە ناوچەکەدا نابینێتەوە.

تورکیا سیناریۆیەکی بە مۆتەکەی لە خەیاڵدایە سەبارەت بە عێراق ئەویش ئەوەیە کە یا ئەوەتا شەڕێکی ناوخۆیی لە عێراقدا بەرپا دەبێت و کورد لە باکوور دەوڵەتێك بۆ خۆیان پێکدەهێنن, یان شتێکی دیکەی لەوجۆرە کە کوردەکان بۆ ئەوەی ناوچەکەی خۆیان بپارێزن لە ناوەندی روخاو جیا دەبنەوە و ئینجا بەبیانووی مێژوویی و پێویستی ئابووری کەرکووکیشی پێوە دەلکێنن و کوردستانی سەربەخۆ پێکدەهێنن جا ئەگەر بەناویش وانەبێ بەڵام لە راستیدا وا دەبێت, وەلێ کوردەکان یەککگرتوو نین و ئەنقەرە پێی وایە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەسەر حوکمڕانێتی ئەم قەوارە نوێیە دەبێتە شەڕیان و ئیتر لەوێش ئاژاوە بەرپا دەبێت. لەمەش زیاتر ئەنقەرە لەو بڕوایەدایە کە دروست بوونی دەوڵەتی کوردی با شلۆق و ناجێگیریش بێت, هانی شیعەکانی باشوور دەدات کە گەورەترین یەدەگی نەوتی عێراق لە ژێر خاکەکەیاندایە ئەوانیش سەربەخۆیی خۆیان راگەیەنن. ئەمەش دێوەزمەی ئازادبوونی شیعە زیندوو دەکاتەوە کە لە هەشتاکانی سەدەی بیستدا بارگرژی زۆری لە ناوچەکەدا دروستکردو و ئەو هۆکارەش بوو کە وای لە عەرەب کرد هاوکاری گەورە وزۆری عێراق بکەن لە جەنگەکەیدا لەگەڵ ئێران(٢٥).

چاودێرێکی تورکیش پێی وایە دروست بوونی دەوڵەتێکی کوردی لە باکووری عێراق کەرکووك چەقە ئابوورییەکەی بێت دەبێتە هۆی:" دەساڵ ئاژاوە و ناجێگیریی... بە هۆی نەوتەوە چونکە سەرکەوتنی ئابوورییانەی قەوارەیەکی وا دەبێتە جێ بایەخی کوردەکانی تورکیا"(٢٦). توێژەرەوەیەکی دیکە دەڵێ:" کوردەکانی تورکیا کە هەندێکیان لاگیری لە مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان دەکەن لانی زۆر مەیلیان بە لای برا کوردەکنی عێراقیاندا دەچێت کاتێ کە بایەخی ئابووری ئەوێ بەهۆی نەوت و بازرگانییەوە گەورە دەبێت و, خۆشگوزەرانی باکووری عێراق بە شێوەکی زەق ناکۆك دەوەستێ لەگەڵ هەژاری باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا"(٢٧). بە

واتایەکی دیکە مەترسییەکە لەوەدایە کە سەرکەوتنی کورد کلّپە لە هەستی جیاخوازی کوردان لە باشووری رۆژهەلاتی تورکیا هەلّدەستێنێ(٢٨).

بەم هۆیانەوە دامەزراندنی دەولّەتێکی کوردی کە کەرکووکیش یەکێك بێت لە پێکهاتەکانی هێلّی سوورە بەلای تورکیاوە(٢٩). تا ئێستاش روون نییە کە ئایا دروست کردنی دەولّەتێکی کوردی سەربەخۆ بەبێ کەرکووکیش ( واتە لەسەر ئەو خاکەی کە حکومەتی هەرێمی کوردستان لە سالّی ١٩٩٢وە بەرێوەی دەبات) هەر جێی رەزامەندی نییە ؟ (٣٠).

هێلّە سوورەکانی تورکیا هەرگیز جێگیر نەبوون و زوو زوو گۆڕاون بە تایبەتیش کە ئەم ولاتە هەولّ دەدات ئەندامێتی یەکێتی ئەورووپای دەست بکەوێ. پێشتر تەنانەت فیدرالییەتیش بۆ تورکیا هێلّی سوور بوو کەچی پاش ئالّوگۆڕەکانی دوای جەنگ و کە تورکیا خۆیشی زانی دەسەلاتێکی ئەو تۆی نییە کە کار لە پەرەسەندنەکانی ئەو دیو سنوور بکات, زۆر بێدەنگانە ئەم هێلّە سوورە هەلگیرا.

بەرپرسێکی گەورە دەلّێت:" راستە ئێستا حکومەتی تورکیا بە رێگەچارەی فیدرالی رازییە. هێلّە سوورەکانمان کەمێك زیادەڕۆیی تێدا بوو. سەرلیستی ئەرکەکانی ئەمرۆمان پاراستنی یەکیێتی خاکی عێراقە ئەمەش بە دیدی ئێمە مانای وایە بە فیدرالییەت رازین". لەمە زیاتر وتی کە دەبێت کەرکووك بارێکی تایبەت و ئیدارەیەکی جیاوازی هەبێت تەرتیباتی دەستووری بۆ کرابێت و لە ریفراندۆمێکی گشتیدا پەسەند بکرێ(٣١). دیبلۆماتێکی رۆژئاوایی هاوهەلّوێستە لەمبارەیەوە و دەلّێ:" حکومەتی تورکیا وای لێهاتووە کە بە بیرۆکەی قەوارەیەکی کوردی لە باکووری عێراق رازی بێت, بەلام ناتوانێت بەوە رازی بێت کە دەولّەتێکی سەربەخۆی کوردی هەبێت زالّ بێت بەسەر سەرچاوەکانی وزەدا( واتە کەرکووکی تێدا بێت). دەولّەتێکی لەو جۆرە مەترسییەکی کوشندەیە بۆ ئاسایشی دەولّەتی تورکیا" ئینجا ئەو دیبلۆماتکارە رۆژئاواییە بە کرایسز گرووپی وت:" لەوانەیە ئەم تێڕوانینە زیادەڕۆیی تێدا بێت بەلام جەنەڕالّە تورکەکان بەمجۆرەی دەبینن"(٣٢).

هەر لەم ڕێچکەیەدا بوو کە تورکیا پێی وابوو لێدوانەکەی بارزانی, سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤دا کە وتی:( کوردەکان بۆ مافەکانیان لە کەرکوك دەجەنگن) بە شێوەیەکی زۆر تایبەت ئیستیفزازی بوو. هەروەها بەو جۆرە لێکدرایەوە کە ڕاگەیاندنی نیازی شەڕ کردنە لە پێناوی کەرکوك و هەنگاوێکە بۆنی ئەوەی لێ دەکرێ کورد هەوڵی سەربەخۆیی بدات(٣٣). هەرچەندە هەندێك بایەخی ئەم لێدوانەی بارزانییان کەم کردەوە بەو مانایەی کە هەڵوێستگەلێکن لە چوارچێوەی پێویستییەکانی هەڵبژاردندا, کەچی قسەیەکی واش بڵاو بۆوە کە پێدەچێ نیشانەی زاڵ بوونی سەربازانە بەسەر سیاسەتدا لە تورکیا, گوایە هێزێکی تورکیا کە لە ٢٠ هەزار سەرباز پێکهاتووە لەسەر سنوورن و ئامادەن بۆ جەنگ ئەگەر بارزانی قسەکانی خۆی جێبەجێ کرد(٣٤).

ب- گەمەکردن بە کارتی تورکمان

کاریگەری تورکیا لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەگەرەکانی پەرەسندنی بارودۆخی عێراقدا بە تایبەتیش بە هەڕەشەی لەشکرکێشی زۆر سنووردارە بەڵام بۆ نموونە دەتوانێ مەرزی خاپوور دابخات و ئابووری کورد بخنکێنێ. کارێکی لەمجۆرە زۆر زیاتر کاریگەر ئەبێت ئەگەر سووریا و ئێرانیش وەك تورکیا بکەن. هەروەها دەتوانێت ئەو بۆرییە نەوتە دابخات کە باکووری عێراق بە دەریای سپی ناوەڕاستەوە دەبەستێتەوە(٣٥).

بۆ پتەوکردن و فراوان کردنی تواناکانی مانۆری خۆی تورکیا پەرەی بە پەیوەندییەکانی داوە لەگەڵ تورکمانەکانی عێراق. ئەم جالییەیە لە ڕیشە و ڕەسەندا جیاوازن لە نەتەوەی تورك بەڵام زۆر بە توندی گوزارشت لە هەستی نەتەوایەتی لاگیری تورکیا دەکەن(٣٦).

هەرچەندە ژمارەی ڕاستەقینەی ئەم کۆمەڵە ئەتنییە نەزانراوە بەڵام بە دووەمین کەمایەتی دێت لە پاشی کورد(٣٧). یەکێك لە چاودێران دەڵێ:" لە تورکیا کەرکووك

هەمیشە وەك شارێکی تورکمانی ناسراوە و کورد لە گوندەکان وەك دەخیل هاتوونەتە شارەکە(٣٨).

لەماوەی سالآنی سەدەی بیستدا نیگەرانی و دلەڕاوکێی تورکمانەکان زیاتر بوو کە کوردەکان لەو شارانەدا جێگیر بوون کە پشت بە ئابووری پترۆڵ دەبەستن, هەروەها بە لووتبەرزیشەوە تەماشای کوردیان دەکرد. رۆژنامەنووسێکی تورك ئەم حالەتی خۆبەزلزانیینە چینایەتییەی تورکمانەکان لە دژی کوردەکان بەوە تەفسیر دەکات کە دواجار تورکمانەکان لە سەردەمی عوسمانیدا ئەسیاد و گەورەئەفسەر و بازرگان و پیشەوەر بوون کەچی زوربەی هەرە زۆری کوردەکان جووتیار و سەپان و سەربازی پیادە بوون(٣٩). پیرەمێردێکی تورکمانیش دەڵێ:" کوردەکان وەك ئەفریقاییەکان لە ئەمەریکا ئەمان لە عێراق خزمەتکار و بەردەست بوون. وردە وردە لەم شارانە نیشتەجێ بوون و کە حکومەتی عێراقی گوندەکانیانی بۆردومان کرد بە ژمارەی زیاتر کۆچیان بۆ ناو شارەکان کرد(٤٠) و, لە هەنگاوێکیشدا کە بە هەنگاوێکی ئازاربەخشی دەزانین حکومەتی ئینتیداب زمانی خوێندنی لە تورکییەوە کرد بە کوردی " زمانی خزمەتکاران"(٤١).

بە رای چندین چاودێر تورکیا تورکمانی وەك بەهانە بەکارهێناوە بۆ دەخالەت کردن لە عێراقدا تا بەرژەوەندییە زیندووەکانی لە باکوور بپارێزێ. لەمەدا ئیشی لەسەر ئەو تورەبوون و دلەڕاوکەیە کردووە کە لای تورکمانەکان بەرامبەر لێشاوی کوردە گەڕاوەکان دروست بووە و بەکاری هێناوە بۆ وروژاندنی ئەو هەست و سۆزە لاگیرەی لە ناو تورکیا هەیە بۆ دەخالەتی سەربازی. رۆژنامەنووسێکی تورك دەڵێ:" تورکیا تەنیا دە ساڵ دەبێت بایەخ بە مەسەلەی تورکمان دەدات بە تایبەتی کە شەڕی ناوخۆ لە کوردستان بەرپا بوو." هەروەها دەڵێ:" ئەوکاتە مەسەلەی تورکمان بەلای هێزی راستڕەوی تورکیاوە رەهەندێکی ئایدیۆلۆجی وەرگرت(٤٢). بە گوتەی دیبلۆماتێکی رۆژئاواییش بێت:" ئەمە مانای وانییە کە بایەخدانی تورکیا بە تورکمان هەڵبەستراو بێت بەڵکو ئیستیغلال کرا. تورکەکان بە درێژایی حوکمڕانێتی صدام و دەورانی تەعریب

دەرهەق بە تورکمانەکان بێدەنگ بوون و دەستپێشخەرییەکیان نەکردووە بۆ هەنگاوێکی تایبەت لەو بارەیەوە, کەچی ئەمڕۆ دەزانن مەسەلەکە لەلای جەماوەری تورکی جێ دەکاتەوە و, هەر لە راستیشدا فشارێکی راستەقینەش هەیە".

بەرەی تورکمانی عێراقی ئەو ئامڕازە سەرەکییەیە کە تورکیا بەکاری هێنا بۆ کردنەوەی دۆسێی تورکمانەکان. بەرە رێکخراوێکە دەزگاکانی ئاسایشی تورکیا بە پارە و پولی حکومەتی تورکیا لە ناوەڕاستی نەوەدەکانی سەدەی بیستدا دروستیان کرد(٤٣). بەرەی تورکمانی هەر هەوڵی ئەوەی داوە کە تورکمانەکان لەژێر یەك چەتردا کۆبکاتەوە بەو رێیە کە گوزارشت لە دڵەڕاوکەی ئەوان بکات و داوا لە تورکیا بکەن دەخالەت بکات . ئەندامێکی سەرکرداتی بەرەش وتی:" دەمانەوێ هێزەکانی تورکیا بێنە کەرکووکەوە چونکە کوردەکان ناکشێنەوە. چۆن دەکرێ بەوە رازی بین کە ئەوەی هی ئێمە بوو لێمان زەوت کراوە؟ ئەوان هەرگیزاو هەرگیز خۆبەخۆ لە کەرکووك ناکشێنەوە بەڵام کە تورکیا هات هەڵدێن(٤٤).

چونکە بەرە بە دەستی دەرەکی دروست کراوە تەنانەت لەناو خودی تورکمانەکانی عێراقیش دا رۆڵی ئەو لە باکوور مایەی مشتومڕ بووە(٤٥). بەڵام لەناو تورکیادا بە پێچەوانەوە وا پێدەچێ جەماوەر ئاگای لەوە نەبێت کە حکومەتەکەیان رۆڵی هەیە لە ئاژاوەنانەوەدا لە باکووری عێراق یان ئەم جەماوەرە هەر لە بناغەوە بایەخ بەم مەسەلەیە نادەن(٤٦).

جالییەی تورکمان دەزانن رای باو ئەوەیە کە ریشەی بەرە ریشەیەکی بیانییە و, ئەم سیفەتە بەسەر هەموو تورکمانیشدا شکاوەتەوە, بۆیە تورکمانێکی هەڵسوڕاوی سەربەخۆ دەڵێت:" ئێمە پێویستمان بە تورکیایە کە بمانپارێزێ, بەڵام کە ئێمە ببینە لقێکی حکومەتی تورکیا ئیتر راستگۆییمان لە عێراقدا نامێنێ". (تحسین کهیە) ئەندامی یەکگرتووی ئیسلامی تورکمان نیگەرانی خۆی لەو ریعایەت کردنەی تورکیا بۆ بەرەی تورکمانی دەربڕی کە دەشێ لەشکرکێشی لێ بکەوێتەوە و وتی:" من دژی دەخالەتی سەربازی تورکیام, ئێمە عێراقین و دەبێت کێشەکانمان خۆمان چارەسەریان بکەین,

ئەگەر هێزەکانی تورکیا هاتنە عێراقەوە سوریا و ئێرانیش وا دەکەن. ئێمە تەنیا پێویستمان بە هاریکاری تورکیایە و هیچی دیکە نا".

ج- مشتومڕ لەبارەی لەشکرکێشییەوە

بە شێوەیەکی گشتی لە تورکیا وا تەماشای لەشکرکێشی تورکیا دەکەن بۆ ناو عێراق وەك پرۆژەوەلامێك بۆ دەستبەسەرداگرتنی پێشبینیکراو یان راستەقینەی کوردەکان بەسەر کەرکووکدا کە هەمووش لەسەر ئەوە کۆکن ئەم زاڵ بوونە هەڕەشە لە مافەکانی تورکمان دەکات. لە راستیدا هەڵبەستنی "مەسەلە" ی تورکمان خۆی لە خۆیدا لەشکرکێشی تورکیا خێراتر دەکات.

دیبلۆماتێکی رۆژئاوایی لە ئەنقەرە بە کرایسز گروپی وت:" ١٥٠٠ تا ٣٠٠٠سەربازی هێزی تایبەتی تورکیا لە باکووری عێراقدان بەلام لەبارەی ئەرك و چالاکییەکانیانەوە زانیاری زۆر کەمە. ئەم هێزە لە نزیك سنوورە و لە ئاداری ٢٠٠٣ەوە بە بیانووی ئەوەوە هاتووە کە رێ لەو کوردانە بگرێ کە لەوانەیە وەکوو ١٩٩١ بەهۆی جەنگەوە کۆچڕەو بکەن بەرەو تورکیا. بەلام هەندێك راپۆرت ئاماژە بەوە دەکەن کە بەشێك لەم هێزە لە نزیك موسڵ و کەرکووك و تەلەعفەرە و ئەگەر پێویستی کرد زۆرتریش دەکرێ.

وەکوو چاوەڕوانکراو بوو, بەبوونی ئەم هێزە هەستی کوردەکان کڵپەی سەند.ئەوە بوو لە تەممووزی ٢٠٠٣ دا رووداوێك روویدا شەرمەزارییەکی زۆری بۆ تورکیا دروست کرد. پۆلیسی کورد لە سلێمانی ژمارەیەك چەکداری دەستگیر کرد چونکە گومانی لێ کردبوون کە خۆیان ئامادە کردووە بۆ تیرۆر کردنی پارێزگاری کەرکووك دوایی دەرکەوت هەموویان سەربازی هێزی تایبەتی تورکیان. پاش ئەم گورزە ئینجا حکومەتی تورکیا هەندێ دەسەلاتی لە سوپا سەندەوە سەبارەت بە و سیاسەتەی لە باکووری عێراقدا پیادە دەکرێ. بەلام تەواجودە سەربازییەکەی تورکیا لە باکووری عێراق هەوەکوو خۆی مایەوە. جارێکی دیکە لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣دا تروسکایی دەرفەتێکی دیکە دەرکەوت, بەتایبەتیش کە باری ئەمنی عێراق تێکچوو و ئەمەریکاش هەوڵی دەدا

دەوڵەتانی دراوسێ سەربازی خۆیان بنێرن بۆ هاریکاری کردنی لە سەقامگیریی وەزعەکەدا, ئەوە بوو پەرلەمان پێشنیارەکەی حکومەتی قبوڵ کرد کە ١٠ هەزار سەرباز رەوانەی عێراق بکات بەڵام ئەم پێشنیارە سەرکردە کوردەکانی زۆر تورە کرد بە هوشیار زێباری وەزیری دەرەوەی عێراق و هەندێ لە ئەندامانی ئەنجوومەنی حوکمیشەوە کە تورکیایان بەوە تاوانبار کرد کە پیلانی داڕێژراوی لە کۆنەوەی هەیە بۆ داگیرکردنی کانە نەوتەکانی موسڵ و کەرکووک.

لە کاتی رووداوەکانی تەلەعفەردا لە ئەیلوولی ٢٠٠٤دا کە ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانی ئەمەریکا هەوڵیان دەدا کارو کردارەکانی مقاوەمە راگرن بووە هۆی کوشتن و ئاوارەکردنی خەڵکی سڤیل, هێزەکانی تورکیا کە لەو ناوچەیە بوون بێلایەنانە مانەوە سەرەڕای ئەو دەگ و هەلایەی لەناو تورکیادا بەرز ببوەوە کە گوایە لە تەلەعفەر " پاکتاوی رەگەزیی" لەدژی تورکمانەکان بەرپایە.

ئەم ئەزموونانە بەڵگەی ئەوەن کە باجی سیاسی بوونی هێزە تایبەتەکانی تورکیا لە باکووری عێراق کە گوایە نێردراون بۆ پاراستنی تورکمانەکان و لە راستیشدا ئامانجەکەی ئەوەیە رێ نەدەن دەوڵەتی کوردی دروست ببێ, باجێکی زۆرە و ئەم هێزانە رووبەڕووی مقاوەمەتێکی جەسوورانەی جەنگاوەرە کوردەکان دەبنەوە کە لە شەڕە جۆراوجۆرەکاندا شارەزاییەکی زۆریان کۆکردۆتەوە. هەروەها لەبەر رۆشنایی چاکبوونی پەیوەندی تورکیا لەگەڵ یەکێتی ئەورووپا ئەو گۆڕانکارییە گرنگانەی سەبارەت بە پێگەی نێودەوڵەتی تورکیا روویانداوە وا پێدەچێ هاندەر نەبن کە تورکیا خۆی لە کردەوەیەکی لەوە فراوانتری سەربازی بگلێنێ.

دیبلۆماتێك لەمبارەیەوە وتی:" مەیلی سەرکێشی تورکیا بۆتە پاشماوەیەکی رابردوو, تورکیا ئێستا دەزانێ کە لێی خۆش نابن. پرووپوچی هەموو هەڕەشەکانی دەخالەت کردن لە باکووری عێراقیش سەلمێنران و, ئێستا چاودێرییەکی مەدەنی زۆر زیاتر لەوەی رابردوو بەسەر رەفتارەکانی سوپاوەیە و, سوپاش خەریکە متمانەی

سیاسی پەیدا دەکاتەوە, سوپا بیروڕای تایبەتی خۆی هەیە سەبارەت بە عێراق بەڵام سیاسەتێکی تایبەتی نییە".

هاوکات کۆبوونەوەیەکی چاودێران و توێژەرەوان لە ئەستەنبوول ئەی دووپات کردەوە کە:" داوای راستڕەوەکان کە تورکیا لەشکرکێشی بکات دیدوبۆچوونی سوپا عەکس ناکاتەوە و تورکیا هەروا بەردەوام لە هەموو بۆنەیەکدا باسی لەشکرکێشی دەکات بەڵام هەر خۆیشی باش دەزانێ کە لەسەر ئەرز باجەکەی یەکجار گەورە دەبێت واتە قوبرسێکی دیکەی تووش دەبێت(٤٧).

بەڵام هەمووان هەست بەم متمانەیە ناکەن و لێدوانەکانی حکومەت مەزەندەی بەیەکتر ناکۆك و هەندێ جار دڵەڕاوکەریش دروست دەکەن.

کردەوەی توندڕۆ تەنانەت کە لە رووکەشیشدا وا دیار بن کە ناعەقڵانین بەڵام لەوانەیە هەر کاردانەوەی تونڕۆ دروست بکات و زیانیش بە بەرژەوەندییە دوورخایەنەکانی تورکیا بگەیەنن. حکومەتیش, وەك یەکێك لە توێژەرەوان ئاماژەی پێکرد, هەموو شتێك دەکات بۆ پاراستنی تورکمانەکان لە کەرکوك ئەگەر کوردەکات جووڵان بۆ داگیرکردنی شارەکە و ئامادەشە " بەتەواوەتی دەرەنجامەکانی ئەم کردەوەیەی لە ئەستۆ بگرێ وەك چۆن لە قوبرس کردوویەتی". دیبلۆماتێکی رۆژئاواییش لەمبارەیەوە وتی:" زیان بە خۆ گەیاندن مەسەلەیەکە تورکەکان زۆر شارەزان تێیدا".

د– رەهەندی نێودەوڵەتی:

تورکیا لە ناو خودی خۆیدا سەبارەت بەوەی لە باکووری عێراق چی بکات دابەشە بەسەر چەند تەوژمێکدا, هەڵوێستی ئەمەریکاش کە تەنیا هێزێکە دەتوانێ هاوکار بێت بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەیەکی ئاشتییانە بۆ کەرکووك بە هەڵوێستێکی نەگەتیف و رقهەڵسێن دەبینێت. بەلای تورکیاوە سیاسەتی ئەمەریکا لە باکووری عێراقدا نەبوونی سیاسەتە, چونکە لەلایەکەوە زۆر سەرقاڵی قەیرانی ئەوەدوای عێراقە(٤٨) و, لەلایەکی

دیکەشەوە قەرزاری کوردەکانە کە لە کاتی جەنگدا زۆریان هاریکاری کرد, هەروەها دوودڵە لەوەی پێش بە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بگرێ چونکە دوو حزبن ئایدیۆلۆجییەتی عەلمانیان هەیەو باشترین دوو خەیارن بۆ لە پەراوێزکردنی رەوتی ئیسلامی لە ناو کورداندا. هاوکات سیاسەتێکی چالاکی پیادەنەکردووە بۆ سووك کردنی ئەو بارگرژییەی لە کەرکووکدا هەیە ( دوای دامەزراندنی ئەنجوومەنی حوکم لە ساڵی ٢٠٠٣ دا). هەرچەندە ئەمەریکا ٥٠ ملیۆن دۆلاری بۆ کوردە راگوێزراوەکانی کەکووك تەرخان کردووە بەڵام پێویستی بە نەخشەیەکی سەرتاسەری هەیە و لە حاڵی حازردا شتێکی ئەوتۆ دیار نیە کە ئەمەریکا بۆ کەرکووك ئیشێکی جدی بکات(٤٩).

بارودۆخەکە بەوجۆرە کە دیبلۆماتێکی رۆژئاوایی  بە چڕ کراوەیی باسی دەکات بریتییە لەوەی کە:" تورکیا لەوە دەترسێ ئەمەریکا لە کێشەی کەرکووك بە ئاگا نەیەت تا ئەو کاتەی کار لە کار ترازاوە".

پرۆسەکەی تەلعەفەر ئاسەوارێکی نەگەتیڤی لەسەر پەیوەندی نێوان تورکیا و ئەمەریکا جێهێشتووە, ئەو کاتەی وڵاتە یەکگرتووەکان هێرشێکی ئاسمانی و پیادەیی لە ٩ی ئەیلوولی ٢٠٠٤دا بە رێخست بۆ ریشەکێشکردنی یاخی بووەکان وەزیری دەرەوەی تورکیا عبداللە گول ئەوەی مەحکوم کرد کە ناوی نابوو:" بەکار هێنانی زیادەرۆیی هێز دژی مەدەنییەکان" و هەڕەشەی ئەوەیشی کرد کە ئەگەر پرۆسەکە بەردەوام بێت" حکومەتی تورکیا لە هەموو بوارەکاندا شەراکەتی خۆی لەگەڵ ئەمەریکا لەناو عێراقدا کۆتایی پێدەهێنێت"(٥٠).

هەمان دیبلۆماتی رۆژئاوایی دەڵێ:" حکومەتی تورکیا تێناگات بۆچی ئەمەریکا کە زۆر باسی جەنگ لە دژی تیرۆر دەکات هیچی نەکردووە لە دژی پارتی کرێکارانی کوردستانPPK کە لە حوزەیرانەوە ١٥٠٠ جەنگاوەری لە سنوور پەڕیونەتەوە"(٥١).

تورکیا پشتی بە ئەمەریکا بەستبوو کە بەڵێنەکانی بکاتە کردار و سەربازەکانی بنێرێت بۆ تێکشکاندنی پارتی کرێکارانی کوردستان وەك ئەوەی کە جەنگاوەرەکانی

ئەنسارولئیسلامی لە ئاداری ٢٠٠٣ دا ریشەکێش کرد. بەر لە سەردانەکەیشی بۆ تورکیا سەرۆك بۆش بەڵێنی دا یارمەتی حکومەتی تورکیا و عێراق بدات بۆ لەناوبردنی ئەو رێکخراوە و وتی:" پێکەوە کاردەکەین بۆ لەناوبردنی پارتی کرێکارانی کوردستان. ئێمە راوەدووی تیرۆرستان دەکەین و کە رێکخراوێکیشمان ناو نا تیرۆریست ئەوە ئێمە دەزانین چیمان وتووە(٥٢). کەچی ئەمەریکا بەڵێنەکەی بەدی نەهێنا.

لە دوور مەودادا سەرکردایەتی تورکیا زۆر پشت بەوە دەبەستێ کە ئەندامێتی تورکیا لە یەکێتی ئەوروپادا چارەسەرێکی بۆ کێشەی کورد بۆ دەدۆزێتەوە_ لە تورکیا و لە باکووری عێراقیش.

هەرچەندە ئەمەریکا رۆڵی لەوەدا هەبوو کە لە ١٧ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤دا یەکێتی ئەوروپا دەنگی بەوە دا کە دانوستانی وەرگرتنی تورکیا دەست پێ بکرێ(٥٣), بەڵام خشتەیەکی زەمەنی بۆ ئەو دانوستانە دانەنراوە و دەرەنجامی دڵنیاکەرەوەشی دیار نییە بەڵام سەرچاوەیەکی سەرەکییە بۆ دڵنیایی دەروونیی تورکیا و پێی وایە کوردە هەژار و تورەکان روو لە ئەوروپا دەکەن بۆ ئیش و سەرمایەگوزاریی و لە داوی جیاخوازیی دوور دەکەونەوە کە دیاردەکانی پێشکەوتنی خزمەکانیان لەو دیو سنووری باشووریانەوە لە عێراق دایدەنێنەوە(٥٤).

### ٤- گەڕان بە دوای دەروازەیەکدا

لە رووبەڕووبوونەوەی هێزگەلێکدا کە تورکیا ناتوانێ کۆنترۆڵیان بکات, ئەمڕۆ ستراتیجیەتی خۆی بە جۆرێك ئاراستەکردووە بەرەو قەیرانی عێراق کە پابەند و گونجاو بێت لەگەڵ ئەو سەرکەوتنانەدا کە لە بەغدا بەدەست دەهێنرێن(٥٥) بەو چارەسەرەشەوە بۆ کەرکووك کە بناماکەی دانوستانە لە نێوانی هەموو لایەنەکانی عێراقدا. سەرەڕای ئەوەش تورکیا موجازەفە دەکات کە بۆ یەکجاری واز لەوە بهێنێت دەخالەتی سەربازی بکات لە حاڵەتێکدا پەرەسەندنێکی هەڵە لە عێراقدا روویدا یان عێراق دابەش دابەش کرا یان کوردەکان دەستیان بەسەر کەرکووکدا گرت وەك هەنگاوی یەکەم بۆ دامەزراندنی

دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان *(( سەرنج دەدەین کە کرایسز گروپ لەسەر ئەو رایەیە کە نابێت بۆ یەکجارەکی تورکیا واز لە خیاری لەشکرکێشی بهێنێت بە تایبەتی ئەگەر کورد ویستی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی دابەزرێنێ. کرایسز گروپ پێی وایە کە تورکیا وا بکات موجازەفە دەکات – ئامادەکار)).*

لە لانی کەمیدا ئەزموونی عێراق لە دوای رووخانی رژێمی سەدامەوە ئەوەندەی دەشێ بە رێی راستدا بڕوات ئەوەندەش دەشێ کە بە رێی چەوتا بڕوات. لەم حاڵەتەدا کرایسز گروپ پێی وایە:

تورکیا پێویستی بە ئارامی هەیە لە کوردستانی عێراقدا ( جا ئایندەی ئەم کوردستانە هەرچۆنێ بێت). تەنیا رێیەکیش بۆ ئاسانکردنی ئەمە ئەوەیە کە لەگەڵ سەرکردایەتی کوردی عێراقدا کاربکەن بۆ برەو دان بە بازرگانی و گەیاندنی پارە بۆ کاروباری سەرمایەگوزاری لە کوردستانی عێراقدا. دەکرێ ئەم کارە بەو جۆرە بکرێ ئەگەر بەرژەوەندییە هاوبەشەکان لەبەر چاو بگیرێن: تورکیا بۆ رێگرتن لە ئاژاوە پێویستی بە پەیوەندی باشە لەگەڵ کوردەکان, وەلێ قەوارەی ئابلۆقەدرا وو لاوازی کوردیش هیچ ئەڵتەرناتیڤێکی دیکەی نییە جگە لەوەی پشت بە تورکیا ببەستێ بۆ ئەوەی بیپارێزێ. هەڵبەت لەنێوانی  باکوورێکی پڕ ئاشووب و ئاژاوە و, باکوورێکی ئارامدا کە حزبە کوردییەکان بەرشێوەی ببەن ( تەنانەت ئەگەر سەربەخۆش بێت ), هەر وەکوو چاودێرێکی تورک پێشبینی دەکات, تورکیا ئارامەکە هەڵدەبژێرێ(٥٦).

هەندێ لە خاوەن سەرمایەکانی تورکیا لەو بڕوایەدان سەرمایەگوزاری لە باکووری عێراق شیاوە چونکە نەوت ئەو توانایە دەبەخشێ بە کوردەکانی عێراق بە پێچەوانەی کوردەکانی تورکیاوە کە قەرزەکانیان بدەنەوە.

پەیوەندی تورک – کورد لە بواری ئابووریدا لەماوەی یەك ساڵی رابردوودا باش بووە. لە تشرینی دووەمی ٢٠٠٣ دا تورکیا و عێراق پرۆتۆکۆلی هاریکارییان لە بواری کارەبادا مۆر کرد, لە ئابی ٢٠٠٤ دا هەدوو لا گفتوگۆیان لەبارەی دابەشکردنی ئاو و کردنەوەی مەرزێکی دیکە کرد, لە دوای جەنگیشەوە یەکەمین قەواڵەی ناردنە دەرەوەی

نەوتی خاوی کەرکوکیان مۆر کرد. زیاتر لە ١٠٠٠ کۆمپانیای تورکی لە عێراقدا کار دەکەن بە شێوەیەکی تایبەتی لە بواری بینا و گواستنەوەدا کە بە ترێلە تورکییەکان بە هەزاران تۆن شمەك بۆ سوپای ئەمەریکا دەگوازنەوە. هەن وای دەخەمڵێنن کە بڕی ئەم ئاڵوگۆڕە بازرگانییەی نێوان عێراق و تورکیا لە ٢٠٠٤ دا گەیوەتە ٢ بلیۆن دۆلار و تا ساڵی ٢٠٠٥ دەگاتە ٥ بلیۆن. لەگەڵ نزیك بوونەوەی تەواوبوونی فرۆکەخانەی نوێ و تاوەری چاودێری لە هەولێر پارتی دیموکراتی کوردستان و تورکیا کەوتوونەتە گفتوگۆ لەبارەی گەشتی ئاسمانی لەنێوانی ئەستەنبول و باکووری عێراقدا. پەیوەندی تورکیاش لەگەڵ دوو سەرکردەکەی کورددا مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی ئەگەرچی گەرمیش نییە بەڵام کارکردنی جدی و هەندێ جار لوتفی پێوە دیارە سەرەڕای لێدوان و دیدگا بەیەکتر ناکۆکەکان(٥٧).

لە پێناوی باشتر بوونێکی چلۆنایەتی پەیوەندی نێوانیان دەبێت هەردوولا هەنگاو بنێن بۆ گۆڕینی ڕەوشەکە و دانانی میکانزمگەلێك کە ڕێگر بن لە سەرهەڵدانی ناکۆکی نوێ.

بەرلە هەر شتێ دەبێت هەردوو لا لێدوانە حەماسییەکانیان ڕاگرن. ئینجا تورکیا هاوکاری کردنی دارایی بەرەی تورکمانی ڕاگرێ کە بە هۆیەوە بەکارهێنانی مەسەلەی تورکمان وەك بەهانەیەك بۆ لەشکرکێشی کەم دەکاتەوە و دەرەنجام دەرفەتەکانی دەخالەتی فعلیش کەم دەکاتەوە. سەرکردایەتی کوردیش دەبێت لە مەسەلەی کەرکووکدا دان بە خۆدا بگرێ و گەلەکەی بۆ چارەسەرێکی میانڕە و لە ئایندەدا بسازێنێ.

لەوانەیە دانانی چاودێرێکی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کەرکووك خزمەتی بەرژەوەندییەکانی هەردوولا بکات و, کاربکات بۆ هێورکردنەوەی بارگرژییەکان لە ڕێی گوێگرتن لە هەردوولا و چاودێری کردنی کارەکانی حکومەتی عێراق بۆ ڕاستکرنەوەی ئەو زوڵمەی لە ڕابردوودا کراوە و خانووبەرە و قوتابخانە و خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان بۆ گەڕاوەکان دابین بکات و گەشەی ئابووری و دروستکردنی

دامەزراوەکان دوور لە تایەفەگەری بەتایبەتیش پۆلیس برەو پێ بدات. لەبەر رۆشنایی ئەو بڕیارانەی لە کاتی پرۆسەی دەستووردا وەردەگیرێن دەکرێ بیر لە رۆڵێکی گەورەتری نەتەوە یەککگرتووەکان بکرێتەوە لە رێی دانانی چاودێرێکی خاوەن دەسەلات کە بتوانێ یاسا بسەپێنێ و پۆلیسی فرە رەگەز دادگای هەبێ و خزمەتگوزاری دیکەش بە هاوکاری و پارەی دەرەوە دابمەزرێنێ (٥٨).

دواجار کە تورکیا خۆی ئامادە دەکات بۆ دانوستانەکانی چوونە ناو یەکێتی ئەورووپاوە چاکتر وایە بیر لەو میکانیزمانە بکاتەوە کە فشار و پاڵەپەستۆیەکەی لە باشووری رۆژهەلات کەم بکاتەوە ئەوەش لە رێی دەرکردنی لێبوردنێکی گشتی و بەرفراوان بۆ جەنگاوەرەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان کە شمولی سەرکردایەتییەکەیشی بکات و داوا لەوانە نەکات کە خۆیان دەدەن بە دەستەوە ئیعتراف لەسەر هاورێکانیان نەکەن(٥٩).

بەرژەوەندی ئەمەریکا کە هاوپەیمانی ستراتیجی تورکیایەو , یەکێتی ئەورووپاش لەوەدایە کە هانی حکومەتی تورکیا بدەن کاری ئەوتۆ بکات دەرەنجامی پێچەوانەی ئەمانەی ئێستای لێ بکەوێتەوە لە باکووری عێراق و, هانی ئەوەی بدەن رۆڵێکی پۆزەتیف بگێڕێ لە بارودۆخێکدا کە رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر کڵپە دەسێنێ. دەبێت ئەو دووانە بە پەلە ئیش بکەن بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کەرکووك و, پشتگیری پەیوەندی نێوان تورکیا و سەرکردایەتی کورد بکەن و هانی سەرمایەگوزاری بدەن لە باشووری رۆژهەلاتی تورکیادا (بۆ ئەوەی کوردەکانی ئەوێ بە بەڵگە ببینن کە تورکیا دەچێتە ریزی یەکێتی ئەورووپاوە چەند سوودی زۆرە), بەمەش نامەیەکی تۆکمە بۆ تورکیا دەنێرن کە ئەمان تەواو پابەندن بەوەوە کە رێگەچارە بۆ داوخوازییە ئەمنییە رەواکانی تورکیا بدۆزنەوە. ئەمەشیان لای خۆیەوە ئەو متمانەیە بە حکومەتی تورکیا دەبەخشێ کە پێویستی پێیەتی بۆ پەرەپێدانی پەیوەندییە سیاسی و ئابوورییە تۆکمەکان بە سەرکردایەتی کوردەوە لە باکووری عێراق, لە رێی ئەم پەیوەندییەشەوە تورکیا دەکەوێتە بارێکی چاکترەوە کە رۆڵێکی پۆزەتیف لە مەسەلەی کەرکووکدا

بگێڕێ. هەر ئەمەیشە کە بەرژەوەندییەکانی تورکیا کاریگەرانەتر دەپارێزێ لە جیاتی هەڕەشەو گوڕەشەی پڕوپوچی لەشکرکێشی کە جگە لە نائارامی هیچ بەرهەمێکی دیکەی نییە.

## ٦- راسپاردەکان

**بۆ حکومەتی تورکیا:**

١) بەیاننامە حەماسولقێنەکان لەبارەی کەرکووك و کورد و تورکمانەوە راگرێ.

٢) هاوکاری دارایی بەرەی تورکمانی راگرێ.

٣) پابەند بێت بە چارەسەری ئاشتییانەی مەسەلەی کەرکووکەوە و رێز لە هەر چارەسەرێك بگرێ کە عێراقییەکان خۆیان لە نێوان خۆیاندا لەسەری رێکدەکەون.

٤) سنوور و مەرزەکان لەگەڵ عێراقدا بەکراوەیی بهێڵێتەوە و بەردەوام ئیش بە بۆرییەکانی نەوتی کەرکووك- سیحان بکرێ.

٥) هانی سەرمایەگوزاری بدات لە باکووری عێراق و لەم کایەیەدا هەرچەندی دەکرێ راستەوخۆ ئیش لەگەڵ سەرکردایەتی حزبە کوردییەکاندا بکات.

٦) پرۆژەی لێبووردنێکی گشتی بەرفراوان بۆ ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان دیراسە بکات کە شمولی سەرکردایەتی ئەو حزبەش بکات و گەڕاوەکان ناچار نەکات ئیعتیراف لەسەر هاوڕێکانیان بکەن.

**بۆ سەرکردایەتی کورد لە عێراق:**

٧) بەیاننامە حەماسخولقێنەکان لەبارەی کەرکووکەوە راگیرێن.

٨) دەستبکەن بە ئامادەکردنی جەماوەری کورد بۆ چارەسەرێکی میانڕەوانەی تەوافقی بۆ ئامانجە نیشتمانییە کوردییەکان بە پلەیەکی پێشکەوتووی ئۆتۆنۆمییەوە لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقی لامەرکەزیدا و, شار و پارێزگای کەرکووکیش بارێکی تایبەتی هەبێ.

٩) واز لەو دامودەزگایانە بهێنرێ کە حزبە کوردییەکان پاشی جەنگ لە کەرکوک دەستیان بەسەردا گرتووە و هاوکاری ئەوە بکەن کە سەرلەنوێ دەسەڵات بە شێوەیەکی هاوسەنگ دابەشبکرێتەوە و ئەو ئەنجوومەنە سەرکردایەتیان بکات کە لە رۆژی ٣٠ کانوونی دووەمی ٢٠٠٥دا هەڵدەبژێردرێت.

١٠) پشتگیری سەرمایەگوزاری و بازرگانیکردن لەگەڵ دراوسێکاندا بکەن.

**بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی ئەوروپا**

١١) بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان حکومەتی تورکیا و سەرکردایەتی کوردی عیراق.

١٢) هاندانی سەرمایەگوزاری لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا.

١٣) پێشکەش کردنی داوانامەیەك بە ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی سەبارەت بە:

أ- دانانی نوێنەرێکی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ چاودێری کردنی بارودۆخی کەرکوك ( شارەکە و پارێزگاکەش)، بەو مەرجە کە هەر سێمانگ جارێ راپۆرتێك بدات بە ئەمینداری گشتی لەبارەی ئەو پەرەسەندن و رەفتارانەی هەرەشە لە باری ئارامی بارودۆخەکە دەکەن.

ب- دیراسەی ئەوە بکات کە بە راوێژ لەگەڵ حکومەتی هەڵبژێردراوی عێراقدا سەرپەرشتیارێك لە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بۆ کەرکوك دابنرێ، رێگە پێدراو بێت کە یاساو بسەپێنێ و لە رەگەزە جۆراوجۆرەکان هێزی پۆلیس و دادگا و دامەزراوی دیکە پێکەوە بنێت( *سەرنج دەدەین کە ئەم پێشنیارە بۆ جۆرێك لە ئینتیدابە بەڵام بەناوی سەرپەرشتیارەوە- ئامادەکار).*

ج- هەوڵبدات پارە و پولی لە دەوڵەتانەوە دەستبکەوێ بۆ ئاسانکردنی کاری سەرپەرشتییەکە.

**ئەنقەرە، عەممان، برۆکسل**

**٢٦ کانوونی دووەمی ٢٠٠٥**

## پەراوێزەکان

[١]-بە پێی خەمڵاندنی پسپۆڕانی نەوت بێت ئەوا بیرەنەوتەکانی کەرکوک کۆنترین بیری ناو عێراقن و بە زۆری دۆشراون. چ ڕژێمی پێشوو، چ حکومەتی کاتی ئێستا جەختیان لەوە کردووە نەوتەکەی ئێرە بەزۆری دەربهێنرێت. ئەمەش وادەکات پرسیاری جددی لەوبارەیەوە بکرێ کە ئایا ئەگەر کار وا بڕوات کەرکووک دەتوانێ بە هەمان توانا بۆ ماوەیەکی درێژ بەرهەمی نەوت بکات؟

[٢]– لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤دا بەرهەمی ڕۆژانەی عێراق لە نەوتدا گەیبە ٢,٨ملیۆن بەرمیل. ئاژانسی ڕۆیتەرزیش لە راپۆرتێکی خۆیدا ڕۆژی ٢٠٠٤/١١/١٧ نووسیویەتی بەهۆی ئەو هێرشانەوە کە یاخیبووەکان کردوویانەتە سەر بیر و وێستگەکانی ناردن و بۆریە نەوەتەکان ڕێژەی ناردنی نەوت لە کەرکووکەوە بۆ تورکیا و لەوێشەوە ناردنی بۆ پاڵاوگەی بایشی و ئینجا ناردنی بۆ بەندەری سیحانی تورکی لەسەر کەناری دەریای سپی ناوەڕاست لە ٧٠٠٠٠٠بەرمیلەوە کەم بۆتەوە بۆ ٣٠٠٠٠٠ بەرمیل. هەروەها یەکێك لە پسپۆڕانی پیشەسازی نەوت بە گروپی کرایسزی ڕاگەیاندووە کە بەرهەمی ڕۆژانەی ئێستای بیرەنەوتەکانی کەرکوك بە ٣٥٠ تا ٥٠٠ هەزار بەرمیل دەخەمڵێنرێ کە زۆری کەمترە لەو تێکڕاییە هەرە بەرزەی لە پێش شەڕدا واتە لە نەوەتەکاندا گەیبە ٧٠٠ تا ٨٠٠ هەزار بەرمیل.

[٣]– بڕێکی زۆر نەوت لە کەرکووکدا هەیە بەجۆرێك کە ساڵی ٢٠٠٤ لە چوارچێوەی سەرلەنوێ ئاوەدانکردنەوەی قەرەهەنجیری وێرانکراو ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی غەیرەحکومی ویستبووی دوو بیری ئاو لێبدا نەوت وروژمی هێنابوو. قەرەهەنجیر گوندێکی کوردییە سەر بە پارێزگای کەرکووکە و کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی کەرکووکەوە لە لە دووری ١٠کیلۆمەتر لەسەر شەقامی نێوان کەرکوك و چەمچەماڵ. ساڵی١٩٨٨ لە چوارچێوەی شاڵاوێکدا دژی شۆڕشگێڕانی کورد ڕژێمی پێشووی عێراق وێرانی کرد.

[٤]– زۆر لە خەڵکەکە ڕاپانکردبوو بۆ قەزا و ناحیەکان کە وێران نەکرابوون کەچی ڕژێم لە نێوانی ساڵی ١٩٨٧تا١٩٨٩ ئەمانەیشی وێران کرد. هەندێکی دیکە ڕایان کردبوو بۆ سێ شارە کوردییەکە. بەڵام زۆربەی زۆرەکە بەناچاری بە کۆمەڵگاکان ڕازی بوونە کە خزمەتگوزارییەکانی تەندروستی و قوتابخانەیان تێدا بووە بەڵام چەندین باری خراپیشی هەبووە وەك بڵاوبوونەوەی بێکاری و دووری لە ناوەندب شارەکانەوە و جۆرێك لە بێ ئومێدی کە ئەو بارودۆخە چاك ببێ.

[٥]– دەتوانی بۆ زیاتر شارەزایی لە بارەی سیاسەتی تەعریبەوە کە ڕژێمی بەعس پیادەی کردووە بڕوانیتە ڕاپۆرتێکی هیومان ڕایتس وۆچ بە ناونیشانی "عێراق: بەزۆر ڕاکواستن و دەرکردنی کەمەنەتەوەییەکان" ئاداری ٢٠٠٣ لەسەر ئەم ئەدرەسە ئەلکترۆنییە: http://www.hrw.org/reprts/2003/iraq0303.tm

٦- بە پێی خەملاندنی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی کۆچ زۆربەی گەڕاوەکان بۆ پارێزگای کەرکوك ئەوانەن کە بۆ پارێزگاکانی باکووری عێراق دوورخرابوونەوە...زوربەی زۆری گەڕاوەکان نەچوونەتەوە زێدی ڕەسەنی خۆیان بەڵام وا بەنیازن. ئێستا لەژێر دەوار و لە خانووبەرەی کاول و یاریگا و کۆنە سەربازگاکاندا لەناو شاری کەرکووکدا دەژین. هەڵبەت کۆسپ و تەگەرە زۆرن کە ئەمان ناتوانن بگەڕێنەوە بە تایبەتی لە رووی ئەوەوە کە خزمەتگوزاری لە گوند و ناوچەکانی خۆیاندا نییە و زۆربەیشی مینرێژ کراون و لە هەندێکیشیاندا هێشتا عەرەبی هاوردە لە خانووەکانیاندا یان لەسەر ئەرزەکانیان ماون و دەرنەچوون.

٧- وەك فەرمانبەرێکی فریاگوزاری رۆژی ٣١ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤ بە کرایسیز گروپی راگەیاند: زۆربەی گوندییەکان پاش ئەوەی بیست ساڵە لە ئۆردوگاکاندا دەژین چیتر گوندیی نەماون و بنەما گوندییەکانی ژیان و پەیوەندییان بە کاروبار و چالاکی کشتوکاڵەوە نەماوە. ئەمان لە هەوڵی ئەوەدان قوتابخانە بۆ منداڵەکانیان و خزمەتگوزاری ئاوو ئاوەڕۆ و تەندروستی دابین بکەن. ئەمان کە لە گوندێتی خۆیان داماڵراون خوویان بە ژیانی ئەو ئۆردوگایانەوە گرتووە کە رژێم بۆی بیناکردبوون.

٨- خەملاندنی رێکخراوی نێودەوڵەتی کۆچ لە ئەیلوولی ٢٠٠٤دا لەمبارەیەوە بەمجۆرەیە: بە بەکارهێنانی ٦کەس وەك تێکڕایی ماماوەندیی بۆ هەرخێزانێك، دەکرێ بڵێین ٧٢هەزارو ٨١٠کورد و ٢٣هەزار و ٥٥٠تورکمان لەماوەی ساڵی رابردوودا گەڕاونەتەوە کەرکوك.

٩- یەکێك لە تورکمانە ئەندامەکانی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك کە سەربە بەرەی تورکومانی عێراقە دەڵێ لە سەردەمی صدام حسێندا تەنیا ٤٠٠ خێزانی کورد لە کەرکوك دەرکراون و گەڕەکی شۆرجەش هەرگیز تێکنەدراوە.( یەکێك لە ئەندامانی کرایسز گروپ لە نیسانی ١٩٩١دا بە سیفەتێکی دیکە چووبووە کەرکوك بە چاوی خۆی بینیبووی کە شۆفلْ گەڕەکی شۆرجەی لەناوبردبوو). هەر ئەو ئەندامە تورکومانە کە ناوی خضر غالب کهیە یە لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ گروپەکەمان لە ٢ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٤دا گووتبووی زوربەی هەرە زۆری ئەو کوردانەی دێن بۆ کەرکووك هەر لە ئەسڵەوە خەڵکی ئێرە نین و بەشێکیان گوندیەکانی دەوروبەرن و ئەوانی دیکە لە ئێران و تورکیا و سوریاوە هێنراون. ئەو کاتە گروپەکەمان لە حاڵێکدا نەبوو ئەم قسانە پشتڕاست بکاتەوە یان بە پێچەوانەوە بیسەلمێنێ وانییە بەڵام ئەو بەڵگانەی هەبوون بەڵێ دەیانسەلماند کە وایە هەندێ لەو کوردانە لە ئێرانەوە هاتبوون تەنانەت دەشێ هەر لەوێش لەدایك بووبن بەڵام لە رووی یاساییەوە مافی خۆیانە کە بە کەرکووکی لەقەڵەم بدرێن، چونکە بۆ نموونە گەنجێکی کوردی تەمەن بیست ساڵ لە دیمانەیەکدا رۆژی ١ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٤ بە ئێمەی وت لە ئۆردوگایەکی نزیك شاری کرمانشاهی ئێران لەدایك بووە کە خێزانەکەی لە ١٩٧٤ەوە لەوێ جێگیر بوون، ئەگینا بە رەسەن

کەرکووکیێن و خەڵکی چنگلاوەی کەرکووکن کە لە ١٩٩١دا رژێمی بەعس خاپووری کردووەو ئێستا هاتوونەتەوە لە شوێنەکەی خۆیدا ئاوەدانی بکەنەوە.

١٠- دبلۆماتکارێك رۆژی ٣ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٤دا لە دیمانەیەکدا لەگەڵ گروپەکەمان پێی راگەیاندین کە ژمارەی دانیشتوانی گریمانەکراوی کەرکووك ٨٠٠هەزارە( ژمارەی دروست و سەلمێنراومان لا نییە) ٢٠٠هەزاریان عەرەبی تەعریبن. لەوانەیە ٥٠هەزار لەمانە بەرلە تشرینی دووەمی ٢٠٠٤ رۆیشتبن, نزیکەی ١٠٠هەزار کوردی راگوێزراویش گەڕاونەتەوە و هاوین لە دەواری هەڵدراودا نیشتەجێ بوون تا ئەو کاتەی خوێندن دەستی پێکرد و راگەیەنرا کە سەرژمێریەکە دواخرا ئیتر نزیکەی٣٠هەزارێکیان گەڕانەوە بۆ سلێمانی و هەولێر.( لەو کاتەدا گروپەکەمان لە حاڵێکدا نەبوو کە ئەم ژمارانە بسەلمێنێ).

١١- لە دیمانەیەکدا لەگەڵ کرایسز گروپ رۆژی ٣ی تشرینی دووەم ی٢٠٠٤ د. نوری تاڵەبانی کە پسپۆڕێکی کوردەو بە رەسەن خەڵکی کەرکووکە دەڵێ, ئەگەر حزبە کوردییەکان لە نیسانی ٢٠٠٤دا نەچوونایەتە ناو کەرکووکەوەو کۆنترۆڵیان نەکردایە, ژمارەی کوردە دەرکراوە گەڕاوەکان زۆر زیاتر دەبوو, ئەو کاتە کێشەکانیش زۆرتر دەبوون. بۆیە بە رای ئەو " ئەمە ئەو هۆیەیە کە کوردە راگوێزراوەکان بە داخڵبوونی حزبە کوردییەکان خۆشحاڵ نەبوون و, ئەوان لەوێ نەبوونایە عەرەبە هاوردەکانیان دەردەپەڕاند".

بەرپرسێکی پێشووی هێزە هاوپەیمانەکانیش لە پەیوەندییەکی ئەلکترۆنیدا رۆژی ٧ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ پێی راگەیاندین کە" پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان شایستەی ئەوەن هەندێ تەقدیر بکرێن چونکە لە راستیدا ژمارەی ئیستای کوردە گەڕاوەکان لەوانەیە بەشێکی زۆر کەمی کۆی دەرکراوەکان بێ".

١٢- دیمانەی کرایسز گروپ لەگەڵ بەرپرسی کۆمەکە نیودەڵەتییەکان, هەولێر, ٢ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٤.

١٣- ئەم عەرەبانە خەڵك ناویان دەبەن بە "عەرەبی دە هەزاری" چونکە لە کاتی خۆیدا رژێم ١٠ هەزار دینار ( نزیکەی ٣٠ هەزار دۆلار بە نرخی ئەو کاتە) ی دەدانێ و, پارچە زەوییەکیشی لە کەرکووك دەدانێ کە خانووی لەسەر بکەن و نیشتەجێ ببن.

١٤- دبلۆماتکارێکی رۆژئاوایی ئەوە دووپات دەکاتەوە کە " شتێك نەماوە وا لە عەرەبەکانی تەعریب بکات لە کەرکووکدا بمێننەوە, چونکە کارو پیشە و ئەو سوود و قازانجەی دەیانکرد نەماوە. ئەوان ئێستا تەنیا چاوەڕێی ئەوە دەکەن قەرەبوو بکرێنەوە و لە جێیەك نیشتەجێ بکرێنەوە". دیمانە لەگەڵ کرایسز گروپ. کەرکووك, ٣ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

١٥- له دیمانەیەكدا لەگەڵ كرایسز گروپ, رۆژی ٢٨ی تشرینی یەكەمی ١٠٠٤ له ئەنقەره ئاوارەیەكی توركمان شكایەتی حاڵی بەوه دەكرد كه كوردەكان له كەركوك دوو پەیكەری توركمانیان شێواندووه و شكاندووه و ناوی شەقام و تەلارەكان له عەرەبییەوه دەكنه كوردی و ئاڵای كورد هەڵدەكەن و, لەمەش زیاتر وتی: "هەست دەكەم ئەوەی دەیكەن كاری داگیركاره".

یەكێك له توركمانه ئەندامەكانی ئەنجوومەنی شاری كەركوك سوور بوو لەسەر ئەوەی كه ناوی نەخۆشخانەی ئازادی هەر به نەخۆشخانەی صدام بهێڵرێتەوه. خضر غالب كهیه لەو دیمانەیەدا لەگەڵ كرایسز گروپ رۆژی ٢ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٤ حزبه كوردییەكانی بەوه تاوانبار كرد كه له نیسانی ٢٠٠٣دا هاتوونەته كەركووكەوه دامودەزگاكانیان تاڵان كردووه به قوتابخانەكانیشەوه, دەستیان بەسەر مەركەزەكانی پۆلیس و بینایەی پارێزگادا گرتووه و دواتر دەستیان بەسەر ئەنجوومەنی پارێزگاشدا گرتووه.

١٦- حەمید ئەفەندی وەزیری پێشمەرگه له پارتی دیموكراتی كوردستان وتوویەتی:" ئێمه ئامادەین شەڕی هەموو لایەك بكەین له پێناوی ئەوەدا دەست بەسەر كەركووكدا بگرین. بەشی ئێمه له كەركوك زۆر كەمه و هەوڵ دەدەین زۆرترمان دەست بكەوێ".

له هیرالد تریبیۆن دا رۆژی ٣ی كانوونی دووەمی٢٠٠٥ ریچارد أ. ئوپڵ جی ئار دەڵێ:" كوردەكان هەوڵ دەدەن درێژه به ئۆتۆنۆمییەكی فشەڵ بدەن".

١٧- د. سرود متی بەرپرسی پەیوەندیه گشتییەكان له كۆمیتەی هەولێری بزووتنەوەی دیموكراتی ئاشووری دەڵێ:" كەركووك ناوچەی ناكۆكییه له نێوانی دوو گەورەكۆمەڵەدا كه كورد و توركمانه, هەریەكەیان دەڵێن كەركووك هی خۆیەتی" هەوەها دەڵێ:" توركمان و عەرەب پشتیری یەك دەكەن بەڵام مەسیحییەكان چاودێرن. ململانێی ناو كەركووك ململانێیەكی نەتەوەییه و مەسیحیەكان لایەن نین تێیدا" .دیمانه لەگەڵ كرایسز گروپ. رۆژی ٢ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٤.

١٨- له دیمانەیەكدا لەگەڵ كرایسز گروپ. كەركووك, ٣ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٤.

19- كرایسز گروپ راپۆرتی پێشووتری هەیه لەبارەی دەسەڵاتی سیاسی گەورەی سیستانییەوه كه ئەو خۆی وا لەقەڵەم دەدات كه سیاسی نییه. هەرچەنده ئاماری بەڵگەدارمان نییه بەڵام سەرچاوه ناوخۆییەكان ئاماژه بۆ ئەوه دەكەن كه ٪٤٠ی توركمانەكان شیعەن و, یەكگرتووی ئیسلامی توركمانی كه شیعەیه چووه ریزی ئیئتیلافی یەكگرتووی عێراقییەوه بۆ بەشداری كردن له هەڵبژاردنەكانی ٣٠ی كانوونی دووەمی ٢٠٠٥ دا, سیستانی ئەم كارەی مورەكه كرد.

٢٠- هێڵی سەوز هێڵی ئاگربەسته ئەو ناوچانەی رژێم دەسەڵاتی بەسەریاندا هەبوو جیا دەكردەوه لەوانەیان كه كوردەكان پاش هەڵبژاردنی ئایاری١٩٩٢ حكومەتی هەرێمی كوردستانیان لێ دامەزراندووه.

٢١- پەرلەمانی تورکیا لە ١ی ئاداری ٢٠٠٣دا دەنگی دا کە نابێت هێزی سەربازیی ئەمەریکا کە ٦٠هەزار کەس بوو بە تورکیادا تێپەڕن بۆ کردنەوەی بەرەیەك لە باکووری عێراق. ئەم بڕیارە ئەمەریکای زۆر تورە کردو وەك چاودێرێکی تورك دەڵێ: " وای کرد ئەمڕۆ تورکیا هیچ ڕۆڵێکی لە باکووری عێراقدا نەبێ". بە واتایەکی دیکە تورکیا وای لە خۆی کرد کە ببێتە لایەنێکی "ناپەیوەندیدار". دیمانە لەگەڵ کرایسز گروپ, ئەنقەرە ٢٨ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

٢٢- دبلۆماتکارێکی ڕۆژئاوایی دەڵێ:" تورکیا ستراتیجییەتێکی نییە بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ سیناریۆ جۆراوجۆرە ئەگەرە کراوەکانی باکووری عێراقدا و, هەموو ڕەفتارەکانی پەرچەکردارن".

[23]- بۆ زانینی زیاتر لە بارەی ئەم زانیارییانەوە بڕوانە:

1- "Diary" Charles Glass
2- Kerim Yildiz, The Kurds in Iraq, Present and Future
3- David McDowall, A Modern History of the Kurds, London,2000

٢٤- بە پێچەوانەی دراوسێیەکانی دیکەی وەك ئەردەن و سعودیە و کوێتەوە تورکیا خۆی نەکردە کەنالێك بۆ تێپەڕ بوونی چەك و تەقەمەنی و بە درێژایی جەنگەکە بێلایەنێکی سروشتی بوو.

٢٥- بەرپرسێکی تورك دەڵێ:" ئەگەر عێراق ڕوخا کوردەکان بۆ دەسەڵات بەشەڕ دێن و باکوری عێراق ئاژاوەی تێدەکەوێ, هاوکات شیعەکان لە باشوور دەوڵەتی ئایینی رادەگەیەنن و بە حوکمی پەیوەندی ڕوو لە ئێران دەکات کە ئەویش لای خۆیەوە بانگەواز و بەیاننامە ووروژێنەرەکانی سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی شۆڕش لەناو شیعەکانی کەنداو زیندوو دەکاتەوە. ئەمەش دەبێتە کێشە بۆ ئیسرائیل و بە هەمووشییەوە دەبنە هۆی ئاژاوە وشڵەژان لە ناوچەکەدا. بۆیە بۆ تورکیا و ئیسرائیل وا باشە عێراق بە یەککرتوویی بمێنێتەوە. دیمانەیەکی کرایسز گروپ لەگەڵ بەرپرسێکی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا لە ئەنقەرە, ڕۆژی ٢٧ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤. هەرچەندە ئەگەری ڕوودانی ئەم سیناریۆیە زۆر کەمە بەڵام لە ناوچەکەدا راستگۆیەکی زۆری هەیە و ڕۆژگاری شەڕی عێراق-ئێران دێنێتەوە بیر کە گەورەهاوکاری عێراق سعودیە و ئەردەن و کوێت و دەوڵەتەکانی دیکەی کەنداو بوون کە هەموویان مەترسی ئەوەیان هەبوو ئێرانی (خومەینی) بیروباوەڕی شیعەگەرایی ڕەوانەی ناوچەکە بکات بە تایبەتیش بۆ ئەو وڵاتانەی شیعەیان تێدا دەژی و لە سعودییە هەرچەندە کەمینەن بەڵام بە کەناری کەنداوی پڕ لە نەوتدا کۆبوونەتەوە و لە بەحرەینیش زۆرینەن.

٢٦- دیمانەی کرایسز گروپ لەگەڵ ئومیت ئۆزداغ, لێکۆڵەرەوەی سەربەخۆ و دامەزرێنەری بنکەی توێژینەوە ستراتیجی و ئەوروپایی و ئاسیاییەکان, ئەنقەرە, ٢٨ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

٢٧- دیمانەی کرایسز گروپ لەگەڵ عوسمان کوالا کە لێکۆڵەرەوەیەکی سەربەخۆیە, ئەستەنبوول,٢٧یتشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

٢٨- بۆ نموونە چاودێرێك سەرنجی ئەوەی داوە کە دامەزرانی دەوڵەتێکی کوردی لە باکووری عێراق " لەوانەیە ببێتە هۆی دروست بوونی داواکاری سەربەخۆییانە لەو جێیانەی تورکیا کە زۆرینەی دانیشتوانەکەیان کوردن, یان وەك ئەگەرێکی دیکە

لەوانەیە هانی هەندێك لە کوردەکانی تورکیا بدات کە سوورتر بن لەسەر ئەوەی داوای جیابوونەوە بکەن".

",Kemal Kirisci, "Between Europe and the Middle East: The Transformation of Turkish Policy",Middle East Review of International Affairs, vol.8, العنوان علی http://meria.idc.ac.il/journal: .no.1(march2004)/2004/issue1/jv8n1a4.html

٢٩- بەرپرسێکی گەورەی تورکیا دەڵێ: " سەربەخۆیی کوردستان یەکێك نییە لە خەیارەکانی تورکیا" دیمانەیەك لەگەڵ کرایسز گروپ, ئەنقەرە, ٢٧ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

٣٠- یەکێك لە گەورە راوێژکارانی رەجەب تەیب ئۆردگانی سەرۆکی حزبی عەدالەت و گەشە ی حوکمڕان و سەرۆك وەزیرانی تورکیا ئاماژەیەکی بەوە دا کە لەوانەیە بە دەوڵەتێکی کوردی لە باکووری عێراق رازی بن, بەڵام ئەوەیشی بۆ قسەکەی زیاد کرد کە: ئەگەر کەرکووکی خرایە سەر ئەوە کێشە بۆ تورکیا دروست دەکات" دیمانە لەگەڵ کرایسز گروپ , ئەنقەرە, ٢٧ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

٣١- دیمانە لەگەڵ کرایسز گروپ , ئەنقەرە, ٢٧ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤. کەچی پێش جەنگ چاودێران و سیاسەتمەدارانی تورکیا هە هەموویان لەسەر ئەوە کۆك بوون کە" هەرگیز بە عێراقێکی فیدرالی رازی نابین". چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بوڵنت ئاگرجالی, سەرۆکی دامەزراوی دیموکراسی تورکیا و کۆنە وەزیر. ئەنقەرە,٣ی شوباتی ٢٠٠٣. یەکێکی دیکەش وتی:" ناتوانین جگە لەو ئۆتۆنۆمییەی لە دەستووری ١٩٧٤دا هاتووە بە هیچ شتێکی دیکە رازی بین". لە دیمانەیەکی کرایسز گروپدا لەگەلچ م. فاروق دیمیر جێگری سەرۆکی بنکەی ستراتیجییە پەرەسەندووەکان, ئەنقەرە ٤ی شوباتی ٢٠٠٣.دبلۆماتیچکی رۆژئاوایی سەرنجی ئەوەی داوە کە:" بەر لە جەنگ قسەوباسی زۆر لەبارەی هێڵە سوورەکانەوە دەکرا, کەچی لە نیسانمی ٢٠٠٣دا حزبە کوردییەکان چوونە ناو کەرکووك و موسڵەوە و تورکیاش هیچی نەکرد. لە کەناڵەکانی راگەیاندنی تورکیا زۆر نوکتە لەسەر ئەمە دروستکرا چونکە ئاشکرا بوو کە هەموو ئەو قسانە قسەی پروپووچ بوون". دیمانە لەگەڵ کرایسز گروپ , ئەنقەرە, ٢٨ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

٣٢- دیمانە لەگەڵ کرایسز گروپ , ئەنقەرە, ٢٧ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

٣٣- ئەم لێدوانەی بارزانی ئەو کاتە بوو کە چووبوو بۆ ئەنقەرە بەڵام لەمەی لێی وەرگیراوە کەمتر زەقاوزەق بوو. بەپێی ئەوەی لە ئاژانسی فرانس پرێسدا رۆژی ١٢یتشرینی یەکەمی ٢٠٠٤دا بڵاو کرابۆوە بارزانی وتوویەتی:"هەر کەسێك یان رژێمێك یان ئاژانسێك بیەوێت درێژە بە تەعریب بدات یان خەڵکی کەرکووك بچەوسێنێتەوە ئەوا ئێمە داکۆکی لە مافەکانیان دەکەین و ئامادەین لە پێناویاندا بجەنگین". هەوەها وتوویەتی:" کەرکووك شارێکی عێراقییە بەڵام ناسنامەکەی کوردستانییە. دەبێت هاندانی پێکەوەژیانی و برایەتی سەرلیستی ئەرکەکانی هەموومان بێت و ئێمە بەم ئاراستەیەدا کار دەکەین". دوای دوو مانگ لەمە بە رۆژنامەنووسێکی راگەیاندووە کە:" کەرکووك دڵی کوردستانە و ئێمە زۆری پێوە پابەندین. ئێستا ئێمە پشتمان بە دانوستان بەستووە بەڵام ئەگەر ئەو عەرەبانەی هێنراون و لە کەرکووك نیشتەجێکراون نەڕۆن دەریان دەکەین". لە وتارێکی OlivierWeber دایە بە ناونیشانی "Le Point " Kirkouk: Main basse sur I'or noir, ٢٣ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤.( وەك ئەوەی کە کرایسز گروپ لە فەرەنسییەوە تەرجەمەی کردووە).

٣٤- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی راپۆرتی رۆژنامەکانی تورکیاوە تەماشای کاسلین رۆدۆلفۆ بکە: " تورکیا پلانێك بۆ عێراق دادەنێ", رادیۆی ئەوروپار ئازاد/ رادیۆی الحرە, ٣ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٤. لە سەروتاری رۆژنامەی الصباح یشەوە ئەم برگەیەی وەرگرتووە" ئامانج و مەبەستگەلێك هەن لە یەکێتی ئەوروپا گرنگترن.. چونکە کەرکووك لە راستیدا دڵی کوردستان نییە بەڵکە دڵی سیاسەتی تورکیایە لە عێراقدا" کەچی سامی کۆهینی نووسەر لە رۆژنامەی (میللییەت) ئەم قسەیەی کەم بایەخ کرد کە پاشی لێدوانەکەی بارزانی بڵاو کرابۆوە. ئەم دەڵێ:" تا پێش ساڵێك کەرکووك لە نەخشەی گفتوگۆ سیاسییەکانی تورکیادا وجودی نەبووە".

٣٥- هەرچەندە هەندێك لە چاودێران بڕوایان بەم سیناریۆیەیە بەڵام هەشیانە گومان دەکەن چوکە دەڵێن:" ئەمەریکا هەرگیز رێگە نادات تورکیا سنوور دابخات". بە قسەی دیبلۆماتیکی رۆژئاواییش بێت ئەوا " پەراوێزی مانۆری تورکیا لە باکووری عێراقدا تا رادەیەکی زۆر تەسك کراوەتەوە" دیمانە لەگەڵ کرایسز گروپ لە ئەنقەرە ٢٨ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

٣٦- سەرەڕای ریشە و رەسەنییان, تورکمانەکانی عێراق لە ئاسیای ناوەراستەوە هاتوون نەك لە تورکیاوە. لەلایەنی ئیمپراتۆرییەکانی جارانی ئەم ناوچەیەوە وەك سەرباز و بەردەست هێنراون و لە باکووری رۆژئاوای موسڵدا نیشتەجێ بوونەو بڵاوبوونەتەوە بەرەو رۆژهەڵاتی بەغدا. ئەمانە بوونەتە گەورە ئەفسەران و پیشەوەران و بازرگانان و ئیدارییەکان لە مەڵبەندی شارەکانی ناوچە دەشتاییە بە

پیت و فراوانه‌كان و تێكه‌ڵاوی كورد و ئاشووری و عه‌ره‌ب بوون. توركمانه‌كان به‌ زۆری له‌ شاره‌كانی موسڵ و ته‌له‌عفه‌ر و كه‌ركووك و هه‌ولێر و ئاڵتون كۆپری و داقوق و توزخورماتوو كفری و خانه‌قین و مه‌نده‌لی دا نیشته‌جێن.

٣٧- به‌پێی هه‌ندێ سه‌رچاوه‌ی بڕوا پێ نه‌كراو (چونكه‌ سه‌رچاوه‌ی بڕوا پێكراومان نه‌بوو) نووسه‌ره‌ توركمانه‌كان پێیان وایه‌ ژماره‌ی توركمانه‌كان تا ساڵی ٢٠٠٢ دوو ملیۆن زیاتر نه‌بووه‌ واته‌ ٨٪ی دانیشتوانی عێراق. بۆ نموونه‌ ته‌ماشای كتێبه‌كه‌ی ئیرشاد هرمزی بكه‌ به‌ ناونیشانی "التركمان والموطن العراقي" ئه‌سته‌نبول ٢٠٠٣. هه‌ندێكی دیكه‌ له‌مه‌ی كه‌متر ده‌خه‌ملێنن و ده‌ڵێن ٢٥و١ملیۆنن. دیمانه‌ی كرایسز گروپ له‌گه‌ڵ جودت نجار سه‌رۆكی كۆمه‌ڵه‌ی رۆشنبیریی توركمان, هه‌لێر ٦ی حوزه‌یرانی ٢٠٠٣.

٣٨- له‌ دیمانه‌یه‌كدا عوسمان كاولا له‌ ئه‌سته‌نبول رۆژی٢٧ی تشرینی یه‌كه‌می ٢٠٠٤ ئاوای به‌ كرایسز گروپ وتووه‌ و, كه‌شكۆڵی به‌ریتانیش كه‌ باسی كه‌ركووك ده‌كات له‌ په‌نجاكان و شه‌سته‌كانی سه‌ده‌ی رابردوودا ده‌ڵێت شارێكه‌ زیاتر خه‌سڵه‌تی توركمانی هه‌یه‌ و خه‌ڵكی عه‌ره‌ب و كوردیشی لێیه‌.

٣٩- دیمانه‌ی كرایسز گروپ له‌گه‌ڵ جه‌نگیز جاندار له‌ ئه‌سته‌نبول رۆژی ٢٦ی تشرینی یه‌كه‌می ٢٠٠٤.

٤٠- ده‌سه‌ڵاتی ئینتیدابی به‌ریتانی و حكومه‌ته‌ یه‌ك له‌ دوای یه‌كه‌كانی عێراق به‌ درێژایی ساڵانی سه‌ده‌ی بیست گونده‌كانی كوردیان بۆردومان كردووه‌. ئه‌م ئۆپاراسیۆنه‌ درێژخایه‌نانه‌ به‌شێك بوون له‌و هه‌ڵمه‌تانه‌ی كراون بۆ راگرتنی یاخی بوونی چه‌ندباره‌ بۆوه‌ی كورده‌كان دژی ئه‌و سیاسه‌تانه‌ی حكومه‌ت كه‌ به‌ سیاسه‌تی سه‌ركوت و ره‌گه‌زپه‌رستیان زانیوه‌ و به‌رهه‌می " هه‌ڵه‌ی یه‌كه‌م" بوون كه‌ په‌یمانیان پێدرا ده‌وڵه‌تیان بۆ دروست بكرێ و دوایی له‌و په‌یمانه‌ په‌شیمان بوونه‌وه‌.

٤١- دیمانه‌ی (احسان دۆغره‌مه‌چی) له‌گه‌ڵ كرایسز گروپ له‌ ئه‌نقه‌ره‌ رۆژی ٢٧ی تشرینی یه‌كه‌می ٢٠٠٤. دۆغره‌مه‌چی هاووڵاتییه‌كی توركمانه‌ خه‌ڵكی هه‌ولێره‌ و دامه‌زرێنه‌ری زانكۆی Bilkent له‌مباره‌یه‌وه‌ وتی ئه‌و گۆڕانكارییه‌ی ئاماژه‌ی پێ كراوه‌ له‌ ناوچه‌ كوردییه‌كان بوو, له‌ كه‌ركووك زمانی توركی كرایه‌ عه‌ره‌بی وه‌ك زمانێكی سه‌ره‌كی له‌ خوێندن و حكومه‌تدا. له‌ ساڵی ١٩٥٠ دوا ده‌یه‌ی ده‌سه‌ڵاتی پادشایی به‌كارهێنانی زمانی توركی له‌ قوتابخانه‌كان قه‌ده‌غه‌ كرا و له‌ ساڵی ١٩٧٠ رژێمی نوێی به‌عس مافی رۆشنبیری و زمانی جێبه‌جێ كرد و دوای كه‌متر له‌ یه‌ك ساڵ به‌ بڕیاری ژماره‌ ٨٩ی ئه‌نجوومه‌نی سه‌ركردایه‌تی شۆڕش لێی پاشگه‌ز بۆوه‌ و پرۆگرامه‌كانی خوێندنی كردووه‌ به‌ عه‌ره‌بی و مافه‌ رۆشنبیرییه‌كانی توركمانی پێشێل كردووه‌.

٤٢- دیمانەی کرایسز گروپ لەگەڵ نوێنەری رۆژنامەی Radikal ( مرات یتکن) لە ئەنقەرە رۆژی ٢٩ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

٤٣- بەرەی تورکمانی ITF لە ئایاری ١٩٩٥دا دروست کرا و لە کۆنگرەی تورکمانی نێودەوڵەتی لە تشرینی دووەمی ٢٠٠٢دا بووە بەرەیەك چوار حزبی تورکمانی دیکەشی هاتە ریزەوە. ئیحسان دۆغرەمەچی کە بسزنز مانێکی عێراقی تورکمانی دەوڵەمەندو پەروەردەیی و سیاسییە و لە ئەنقەرە دەژی بە کرایسز گروپی وت کە ئەم رێی بە بەرە نیشان داوە کۆمپانیایەك بۆ پارە و پولی حکومەتی تورکیا دابمەزرێنێ تا لەو رێیەوە پارە بۆ بەرە بنێرێت.

٤٤- دیمانە لەگەڵ خضر غالب کهیە لە کەرکوك لە ٢ ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

٤٥- دەنگۆیەکی وا هەیە کە ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی بەرەی تورکمانی عێراقی نارازین لە حزبەکەیان. بەڵام لە ئێستادا ئەڵتەرناتیڤێکی نییە مەگەر یەککرتووی ئیسلامی تورکمانی کە هاوپەیمانێتییەکی بنکە شیعییە و توانای کێشکردنی ئەندامە سوننە مزهەبەکانی ناو بەرەی نییە. هەندێ لە ئەکتیڤانی تورکمان بیر لەوە دکەنەوە حزبێکی تورکمانی دابمەزرێنن و ببێتە " رێگای سێیەم", بەڵام هێشتا خەریکی پیکەوەنانین.

٤٦- بە قسەی ( جەنگیز جندار ) هێزە تایبەتەکانی تورکیا بەرەیان دروست کردووە و دەستیان بەسەردا گرتووە: " ئەو راستییەی کە رێکخراوێکی سەربەخۆ نییە و پاشکۆی سوپای تورکیایە نهێنییەکی ( راگەیەنراو) ە بۆ ئەوانەی لە پەرەسەندنەکانی ناوچەکە دەکۆڵنەوە, بەڵام دەشێ جەماوەری تورکیا بەم رادەیە مەسەلەکەی لا روون نەبێت". دیمانە لەگەڵ کرایسز گروپ, ئەستەنبول ٢٦ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

٤٧- لە کۆبوونەوەیەکدا رۆژی ٢٦ ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤ دا ئاماژە بە نموونەی تورکیا کرا وەك هۆشدارییەك بۆ تورکیا لەبارەی رۆڵی بەرەی تورکمانی عێراقەوە کە هەوڵ دەدات تورکیا کێش بکات بۆ یارمەتیدانی تورکمانەکانی عێراق کە ئەمە بە رای زوربەی چاودێران و سیاسەتمەدارانی دژی لەشکرکێشی, وەك سیناریۆ تۆقێنەرەکەی قوبرسە و دەبێت تورکیا ئومێد بخوازێ روونەداتەوە. ئەمان دەڵێن: تورکیا هیچشتا ئەرکی ئەوەی بە ئەستۆوەیە کە خۆی لەو " قەیران"ە رزگار بکات کە خۆی بۆ خۆی دروست کرد کاتێ دەخالەتی سەربازیی لە قوبرس کرد. هەڵبەت ئەمڕۆ کە دەیەوێت بچێتە ریزی یەکێتی ئەورووپاوە مەترسییەکان یەکجار گەورەترن.

٤٨- یەکێك لە لێکۆڵەرەوان وتی: " ئەمریکییەکان ئەوە قبوڵ ناکەن کە فشاریان بۆ بهێنرێت لە مەسەلەی کەرکووکدا, وەك ئەوی کە ببێتە ناوبژیوان لە نێوانی لایەنەکاندا و فشاری زۆرتریان بۆ ببەن.

ئەوان بەدوای دەرگایەکدا دەگەڕێن لە عێراق دەریان بکات". دیمانە، ئەستەنبول ٢٦ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

٤٩- سەرچاوەکان دەڵێن لە واشنتۆن دەزانن مەسەلەکان چۆنن بەڵام لەسەر ئەوە کۆك نین کە ئایا باشتر وایە وڵاتە یەکگرتووەکان سیاسەتێکی بەهێز لە کەرکووك پیادە بکات یان لێی بگەڕێ بۆ عێراقییەکان خۆیان کێشەکانی خۆیان چارەسەر بکەن؟. لە ئاسۆدا هەندێ جموجوڵ هەن وا پێدەچێ سیاسەتس واشنتۆن رووی لە گۆڕان کردبێ لەبارەی سەرلەنوێ پیادەکردنەوەی تەعریبەوە. جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا ( ریچارد ئارمیتاج) لە ئەنقەرە لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٥٤ دا وتی:" شتگەلێك لە یاسای حکومەتی ئینتیقالیدا هەن دەبێت بگۆڕدرێن بۆ ئەوەی ئەو هەڵانە چارەسەر بکرێن کە دووچاری هەرکەسێ بووە کە دەرکرابێ یان راگوێزرا بێ" . بێگومان ئەمە هەرۆ ئاماژەیەکی راشکاوانە نییە بۆ کورد و تورکمانەکان بەڵکو بۆ عەرەبە ( هاوردەکان)یشە لە کەرکووك کە لەوانەیە ببنە قوربانی دەرکردنێکی بێ تەرتیب لەبەر ئەوەی چاودێرییەکی نێودەوڵەتی کاریگەر نییە. بە پێی ماددەی ٥٨ لە یاسای کاتیی ئیدارەی عێراق کە پەیوەندیدارە بەم بابەتەوە، دەستووری عێراق ئەو هەنگاوانە دیاری دەکات بۆ" راستکردنەوەی ئەو زوڵمەی رەفتارەکانی رژێمی پێشوو گەیاندوویانە بە هۆی گۆڕینی دیمۆگرافیای هەندێ ناوچەوە لەناویاندا کەرکووك". ئەم ماددەیە ناڕۆشنە و واڵایە بەسەر چەندین لێکدانەوەی دژ بە یەکدا کە لەوانەیە ببێتە هۆی پێشێلکردنی مافەکانی عەرەبە ( هاوردەکان) لە کاتێکدا کە ئەمەریکا دەیەوێت دەلاقەی نێوان خۆی و عەرەب پڕ بکاتەوە. دیبلۆماتێی رۆژئاوایی بە کرایسز گرووپی وت: وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ناتوانێ ماددەی ٥٨ وا نەبینێت وەك ئەوەی کە ئەمیش رازی بووە بەوەی پاکتاوی رەگەزیی عەرەبەکانی کەرکووك بکرێ. ٨ی کانوونی یەکەمی٢٠٠٤.

بۆ مەسەلەی هەموارکردنی ئەو ماددەیە لەوانەیە هەڵمەتێك لە داواکردنی هەموارکردنی ماددەی دیکە بەرپا بکات کە بارێك بخولقێنێ لە کۆتاییدا بگات بەوەی هەموو یاساکە ئیلغا بکرێ.

٥٠- ئاژانسی رۆژنامەگەریی فەرەنسا ١٣ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

٥١- ژمارەی جەنگاوەرانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە زنجیرە چیای قەندیل لەسەر سنووری ئێران لە رۆژهەڵاتی شارۆچکەی ( قەڵادزێ)ی سەر بە پارێزگای سلێمانی بە ٥٠٠٠چەکدار دەخەملێنرێ کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان کۆنترۆڵی جموجوڵیانی کردووە.

٥٢- داو جۆنز ٢٥ی حوزەیرانی ٢٠٠٤ :" بۆش بەڵێن دەدات یارمەتی تورکیا و عێراق بدات دژی یاخیبووەکانی پ.ك.ك. کەچی (سوزان سایکس)رۆژی ١٣ کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ بە ناونیشانی :" وڵاتەیەکگرتووەکان یارمەتی تورکەکان لە دژی کوردەکان) وتارێکی لە رۆژنامەی ( هیراڵد تریبیۆنی نێودەوڵەتی) دا بڵاوکردەوە. جێگری وەزیری دەرەوەی عێراق ( حامد البیاتی) بۆ ئاژانسی

ڕۆژنامەگەریی فەرەنسا ڕۆژی ١٢ ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٥ ئاماژەیەکی بۆ ئەم بابەتە کردو وتی:" باسی کردەوەی سەربازیمان کرد بەڵام ئێستا ئێمە لە قۆناغێکداین دەمانەوێت هەڵبژاردن سەرکەوێ. لە ئایندەدا کۆدەبینەوە و دواجار بەڵێ ئۆپاراسیۆنێکی سەربازیی ئەنجام دەدەین".

٥٣- سەرەتا تورکیا لە کانوونی یەکەمی ١٩٦٤دا لەگەڵ کۆمەڵەی ئابووری ئەوروپادا ڕێکەوتنی شەراکەی کرد. لە نیسانی ١٩٨٧دا داوای کرد ببێتە ئەندام لە یەکێتی ئەوروپا. لە کانوونی دووەمی ١٩٩٦دا یەکێتی ئەوروپا و تورکیا یەکێتییەکی گومرگیان دانا. دوای سێسالّ لە کانوونی یەکەمی ١٩٩٩دا یەکێتی ئەوروپا تورکیای بە ئەندامی پاڵێوراو وەرگرت. ساڵی ٢٠٠٢ یەکێتی ئەوروپا بەڵێنی دا کە تورکیا دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی ژمارەیەك مەرج ئەمانیش دەست بکەن بە دانوستانی بە ئەندامبوونی. لە ٦ ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤دا لیژنەی ئەورووپی بە ئەنجوومەنی ئەورووپای ڕاگەیاند کە تورکیا " بە پێی پێویست" ئەو مەرجانەی جێبەجێ کردووە و ڕایسپاردن کە ئەو دانوستانە دەست پێ بکەن. بەلای کەمییەوە تورکیا تا ٢٠١٥ نابێتە ئەندامی یەکێتی ئەوروپا.

٥٤- ڕاپرسییەکان وای نیشان دەدەن کە ٨٧٪ی کوردەکان لاگیری ئەوەن تورکیا ببێتە ئەندامی یەکێتی ئەوروپا, کەچی لەبەرامبەردا٧٨٪ی ئەوانەی تەنیا بە تورکی قسە دەکەن لاگیر بوون.

٥٥- بۆ نموونە عبالله گول, وەزیری دەرەوەی تورکیا ڕایگەیاند کە بە توندی لاگیری هەڵبژاردنەکانی عێراقەو ئەوەی دووپات کردەوە کە پێویستە بە پێی توانا هەڵبژاردن سەرتاسەری بێت و بۆ هەموو عێراقییەکان بێت و بە شێوەیەکی تایبەتیش لێ نەگەڕێن عەرەبی سوننە لە دەرەوەی بمێنێتەوە.

٥٦- سەرچاوەکانی ئەم زانیارییانە بریتین لە:

دیمانەیەك لەگەڵ کرایسز گروپ لە ئەستەنبول لە ٢٦ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤

ئاژانسی ئەنادۆل بۆ دەنگوباس. ١٢ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٣.

ئاژانسی ڕۆژنامەگەریی فەرەنسا. ١٧ی ئابی ٢٠٠٤.

پەیوەندی ئەلکترۆنی لەگەڵ پسپۆڕێکی پیشەسازی نەوت لە ١٢ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤.

وەزیری بازرگانی تورکیا کە قسەکانی لە ئاژانسی ڕۆژنامەگەریی فەرەنسا. لە ١٧ی ئابی ٢٠٠٤ دا بلاوکرابۆوە.

ڕۆژنامەی هەواڵەکانی ڕۆژ انەی تورکیا لە ١١ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٤.

٥٧- جەنگیز جاندار لە وتارێکی خۆیدا بە ناونیشانی ( نزیکبوونەوەی تورکی, کوردی سەرەڕای ئەمریکییەکان) گفتوگۆ لەبارەی ئەم خاڵەوە دەکات. هەواڵەکانی رۆژ انەی تورکیا لە ٢٣ی حەزەیران ٢٠٠٤.

٥٨- بەرپرسێکی پێشوو لە دەسەڵاتی کاتیی هاوپەیمانان ئاماژەی بۆ میکانیزمێکی هاوشێوە کرد کە بۆ شاری بەرکۆ ی یۆگۆسلاڤیای پێشوو دارێژرا و هۆشداری ئەوەیشی دا کە ئەگەر کار بەم میکانیزمە نەکرێ ئەوا لە کەرکووکدا قەسابخانەیەکی گەورە بەرپا دەبێت.

٥٩- ئەم پێشنیارە ( عوسمان کاڤالا) پێشکەشی کردووە. کاڤالا توێژەرەوەیەکی سیاسی سەربەخۆیە لەگەڵ رێکخراوێکدا کاردەکات لە دیاربکر ناوی ( کلتووری ئەنادۆڵ )ە و بڵاوبوونەوەی ئاڵوگۆڕی رۆشنبیری و ئاشتبوونەوە ئامانجییەتی. شایانی باسە لە تەمموزی ٢٠٠٣دا حکومەت لێبووردنێکی ناکاملّی راگەیاند بۆ ئەو جەنگاوەرانەی حەز دەکەن خۆیان تەسلیم بکەن و ئامادەش بن زانیاری لەسەر ئەو هاورێیانەیان بدەن کە خۆیان شاردۆتەوە. پەیوەندی لەگەڵ لێکۆڵەرەوەیەکی تورك لە ١٠ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥.

# بنیاتی دەوڵەت: فیدرالیزم و ئۆتۆنۆمی*

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:

ئاسۆ کەریم

بەرایی:

زۆربەی چارەسەری کێشە و ئاریشەگەلی ناوەخۆ، دەسکاریی بنیاتی دەوڵەت دەخوازن. لەم باسەدا لەوە دەدوێین کە داخوا چۆن رێگەکاری فیدرالیزم و ئۆتۆنۆمی، دەشێ گرژی و تێکهەڵچوونی ناو دەوڵەتێ خاو و هێور بکاتەوە لە رێگەی دەسەڵاتپێدانی زێتر بە کۆڕ و کۆمەڵە ئیتنییەکانەوە.

١- دەستئاوێژەکانی دەسەڵاتگواستنەوە

٢- نموونەگەلی ئۆتۆنۆمی و فیدرالیزم

٣- بنەمای قانوونیی ئۆتۆنۆمی

٤- لایەنە بەسوود و چاکەکانی چارەسەرگەلی ئۆتۆنۆمی

٥- بەرەنگاربوونەوەی ئۆتۆنۆمی

٦- بنیاتنانی ریکخستنی ئۆتۆنۆمی

چەندین کێشە لەسەر دەوری دەوڵەت لە کۆمەڵ چەق دەخۆن و بەشێوەیەکی سەرەکی بنج و بنەوانیان دەچێتەوە سەر بنیات و رێکخراوی دەوڵەت. لەزۆربەی وڵاتاندا، دەوڵەت سازمانی هەرە بەهێز و زەبر، ئەگەر لەراپەڕاندنی سیاسەتدا زۆر کارا و چەلەنگیش نەبێ. کۆنترۆڵی دەوڵەت وەکو باوە سەردەکێشێتەوە بۆ دەسەڵاتی ئابووری، چونکە دەوڵەت دەستئاوێژێکی سەرەکیی بەرهەمهێنانەوەی سەرمایەیە. لەسۆنگەی ئەمەوە، رکابەرییەکی توند بۆ کۆنترۆڵی دامو دەزگاکانی دەوڵەت دەکرێ. ئەم تێکۆشانەش، هۆکاری زۆر کێشە و هەرای دنیای ئەمڕۆیە. دەکرێ بەهۆی بیاتنانەوەی دەوڵەت، یان بەهۆی سیاسەتگەلێکی رەسمیی وەك: داهات دابەشکردنەوە لە رێگەی میکانیزمگەلێکی کردەی ئەرێی، پەسندکردنی قانوونگەلی باری کەسێتی و شێوەکانی تری پلورالیزم، قانوونگەلی سازو لەباری هەڵبژاردن و شێوەکانی تری هاوبەشیپێکردن لە دەسەڵاتدا.. رێگە لەم کێشە و ئاریشانە بگیرێ، یان حەلوفەسلێکیان بۆ بکرێ. هەروابێتەوە گرفت و ئاریشە لەو هەوڵانەش دەکەونەوە کە بۆ دانانی سمبولگەلێك بۆ دەوڵەت بەختدەکرێن کە رەگ و ریشەیان دەچتەوە سەر ئایین و ئول، یان داوونەریتی کۆمەڵەیەك(سری لانکا، مالیزیا.. تاد) و کۆمەڵەکانی تری پێ نامۆن. حەلوفەسل هەر ئەوەیە: سیمبولی بێلایەن (وەکو دیموکراسی، مافەکانی مرۆڤ و سەروەریی قانوون)، سکولاریزم وەکو جۆرە ناسیۆنالیزمێکی دەوڵەت، پەسند بکرێ. لێ زۆر لە سەرکردەکان پێیانوایە توانی عەلمانیەت بۆ هاندان و دڵ راکێشانی لایەنگر و شوێنکەوتووانی خۆیان، سنووردارە. ستراتیجیای هەرە بەفەڕ و بەرهەم ئەوەیە کە وەدوای رێوشوێنی دەسەڵاتپێدان بگەڕێن وەکو فیدرالیزم، ئۆتۆنۆمی، یان هەر دەسکارییەکی تر لە بنیاتی دەوڵەتدا.

### ١- دەستئاوێژەکانی دەسەڵاتگواستنەوە

رێکخستنگەلێکی بەربڵاوی لێکجودا بۆ دەسەڵاتپێدان هەن. لە لێوەکۆڵینی ئەو رێگاکارانەدا، گرنگ ئەوەیە وەکو رێگەکاری دژ بەیەك، یان ئەم یان ئەو رێگەکار، یان

وەکو ئەلتەرناتیڤی یەکتر چاویان لێنەکرێ. جیاوازییە هەمەجۆرە هەنوکەییەکان لەرووی ژمارە، پێناسە و سەرچاوەکانی داهات لەناو سنووری دەوڵەتێکدا وا دەخوازن هەندێ تێکەڵەی داوودەزگا و ئامراز بەکار ببردرێ (وەکو تاقیکردنەوەکانی کەنەدا و هیندستان هیمایان بۆ دەکەن).

**١-١: فیدرالیزم:**

خاسترین رێکخستنی نامێ، فیدرالیزمە کە لەسایەیدا دەسەڵات بەیەکسانی بەتێکڕای هەرێمەکان دەدرێ و دەڤەرەکان پێوەندیی وەکیەکیان بە حکوومەتی ناوەندەوە هەیە. هەرچەند فیدرالیزم وەکو نەریت، بۆ حەلوفەسلی کێشەی ناتەبایی ئیتنی بەکار نەهاتووە، لێ نموونەی واش هەن کە فیدرالیزم لەم بارەشەوە کارایی خۆی سەلماندووە. بۆ نموونە: پەسندکردنی فیدرالیزم لە سویسرا و کەنەدا پاژێکی بۆ بەیەکەوە هەڵکردنی کۆڕ و کۆمەڵە پێکناکۆکەکان بووە. هەروا فیدرالیزم زۆر جار بۆ براندنەوەی گرفتە ئیتنییەکان لەدوای شەڕی دووەمی جیهانەوە، بەکارهاتووە. بۆ نموونە: لە هندستان، مالیزیا، نێجیریا. لەجێگە و پێڤاژۆی تریشدا فیدرالیزم بەچاکی جێگەی خۆی کردووەتەوە وەك لە میانەی وتووێژەکانی ئەفریقیای باشووردا کە چارەسەری دوای قۆناخی ئاپارتایدیان لێکەوتەوە.

ئەگەر داخوازی هەر ئەوە بێ گرووپێك یان دووان ساز بدرێنەوە و بهێندرێنەوە ژێربار، هەرچۆن بێ، لەوانەیە مۆدیلی فیدرالی پێویست نەبێ. رەنگە مۆدیلی فیدرالی بەتەواوی بەدەردی داخوازییە کەلتووری و داخوازییەکانی تری کۆمەڵەیەك نەخوا. کەوابوو دوو بەرسڤی ئالتەرناتیڤ هەن: فیدرالیزمی ناجۆر و ئۆتۆنۆمی.

**١-٢: فیدرالیزمی ناجۆر** asymmetrical federalism

لە فیدراسیونێکی نا-هاوچەشندا، ویلایەتێك یان زێتر، دەسەڵاتگەلێکی تایبەتی لە قەبەڵ دەکرێ کە بە ناوچەو دەڤەرێن دی نادرێن تا دەرفەت بۆ پاراستنی کەلتوورو زمانی دانیشتوانی ویلایەتی تاین برەخسێت. نموونەیەکی کۆنی ئەم جۆرە مۆدیلە،

کیوبیك —ـه Quebec له که‌نه‌دا، نموونه‌یه‌کی هاوچه‌رختریش، باری تایبه‌تی کشمیره له‌ناو فیدراسیۆنی هیندیدا.

**١—٣: ئۆتۆنۆمی**

رێگه‌کاری ئۆتۆنۆمی ، که ته‌نیا هه‌رێمێك یان زێتر، ده‌سه‌ڵاتگه‌لێکی تایبه‌تی پێ بدرێ، زۆر ناسراوو به‌ربڵاوه. ئۆتۆنۆمی هه‌ر به‌سروشتی خۆی نا هاوچه‌شنه. نموونه‌گه‌لی ئۆتۆنۆمی: پێوه‌ندیی دوو ئوستانی **کۆردیلێرا** Cordillera و **میندناو**Mindanao به **فلپین**، پێوه‌ندیی **زه‌نجبار** Zanzibar به **ته‌نزانیا**، پێوه‌ندیی **هۆنگ کۆنگ** به **چین**، پێوه‌ندیی **گرینلاند** Greenland به **دانیمارك**، پێوه‌ندیی **پۆرتریکۆ** Puerto Rico به **ئه‌مریکا**، کۆڕ و کۆمه‌ڵه خودمختاره‌کانی ناو **ئیسپانیا**، پێوه‌ندیی **ئالاند** A Land به **فینله‌ندا**. جیاوازی هه‌ره گرنگ له نێوان فیدرالیزم و ئۆتۆنۆمیدا ئه‌وه‌یه که له فیدراسیۆندا، هه‌رێمه‌کان چالاکانه به‌شداری له داووده‌زگا نیشتمانییه‌کان(واته ده‌زگا فیدرالییه‌کان (وه‌رگێر) و داڕشتنی سیاسه‌تی نیشتمانیدا ده‌که‌ن له پاڵ ئه‌و ده‌سه‌ڵاتانه‌ی که له چوارچێوه‌ی هه‌رێمه‌کانی خۆیاندا له قه‌بەڵیان کراوه. له ئۆتۆنۆمیشدا، زێتر جه‌خت له‌سه‌ر ده‌سه‌ڵاتی ده‌فه‌ره‌که خۆی بۆ هه‌ڵسووڕاندنی کاروباری خۆی ده‌کرێته‌وه تا جه‌ختکردنه سه‌ر به‌شداریکردن له داوودەزگا نیشتمانییه‌کاندا. ره‌وشی زه‌نجبار تا راده‌یه‌ك ریزپه‌ڕه، **زه‌نجبار** کاریگه‌ریی به‌سه‌ر په‌رله‌مانی نیشتمانی و کارڕاپه‌ڕاندنی **ته‌نزانیاوه** هه‌یه که له گه‌ڵ قه‌باره‌که‌یدا هاوڕێژه نییه‌و ئه‌مه‌ش بێزارییه‌کی زۆری له‌ناو به‌شی سه‌ره‌کی ته‌نزانیادا دروستکردووه.

**١—٤: ریسێرڤ** Reserves

ئه‌مانه یه‌که‌مجار له‌لایه‌ن مشه‌خته (مستوگن)ـه ئه‌وروپییه‌کانه‌وه له ئه‌مریکا بۆ دابڕین و کۆنترۆڵی خه‌ڵکی ره‌سه‌ن و خۆجێی ئه‌و وڵاته به‌کارهاتوون. پاشان له ئوسترالیا و ئه‌فریقیا و هه‌ندێ ناوچه‌ی ئاسیادا به‌عه‌مه‌ل هێنراون. سیاسه‌تی ئاپارتایدی بانتۆستانه‌کان شێوه‌یه‌کی مۆدێرنی ئه‌مانه بوو. له‌م ساڵانه‌ی دواییدا، هه‌رچۆن بووه، دان به ئاوات و داخوازییه مێژووییه‌کانی گه‌لانی ره‌سه‌ن و خۆجێ نراوه له دووتوێی گۆڕینی ئه‌و ریسێرڤانه بۆ ناوچه‌گه‌لی خۆ— به‌ڕێوه‌به‌ر به‌تایبه‌تی له که‌نه‌داو فلیپین.

مەوداو ئاقاری ئەم ریسیرڤانە کە تا چەند دەکارن لە قانوونگەلی نیشتمانی بچنە دەرێ، کە لەوانەیە بۆ پاراستنی پراکتیکی سیاسی و کەلتووری خۆیان پێویست بێ، دەگۆڕێ.

**١-٥: دامەزراوە خۆجێیەکانی حکوومەت**

رێگەیەکی تری دەسەڵاتپێدان، بەهۆی دامەزراوە خۆجێیەکانی حکوومەتە، یان شێوەکانی نا- مەرکەزییەتە. ئەمانە هەم لە فیدراسیۆن و هەم لە ئۆتۆنۆمی جودان. ئەمانە بارێکی تایبەتی دەستووری، یان گەرەنتی دەستوورییان نییە. دەشێ حکوومەتی خۆجێ رێگەیەکی کاریگەر بێ بۆ لەقەبەڵکردنی دەسەڵاتێکی دیاریکراو بە گرووپێك، چونکە رووبەروو پێوانەی جیوگرافی حکوومەتی خۆجێ، گچکەیە و دانیشتوانەکەی تا ڕادەیەك پێدەچێ هاوچەشن بێ.

بەپێی ئەو پەرەئەستاندنانەی لەمەوبەر لەبارەی فیدرالیزم و ئۆتۆنۆمییەوە خرانە روو، ئەگەری داهێنانی رێکخستنی گونجاوی تری خۆبەڕێوەبردن کە لە گەڵ هەلومەرجی جیا- جیا و بەربڵاو و هەڵکەوتەکاندا گونجاو بێ، روو لە زێدەبوونە.

(لێرەدا، ئێمە ئۆتۆنۆمی بە مانا گشتییەکەی بەکاردێنین بەو مەبەستەی کە هەموو شێوەکانی رێکخستن بە گوێرەی شوێن بۆ حکوومەتایەتیکردن بەسەر خۆدا، بگرێتەوە). لەپاڵ ئەو جۆرە بەربڵاوانەی حکوومەتایەتیکردن بەسەرخۆدا، لەناو هەر جۆرێکیشیاندا، رێکخستنی جیا- جیای دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە نێوان ئاستە جیا- جیا و بنیاتەکانی حکوومەتدا هەیە، ئەمە سەرباری پێوەندیی نێوان ئەم بنیاتنانە لە ئاستە جیا- جیاکان و دابەشکردنی داهاتە دارایی و سەرچاوەکانی دی. هەرچەند ئەم نەرمییە لە پرۆسەی وتووێژ گرنگە و کارئاسانی بۆ سات و سەودا دەکا، لێ خەتەری ئەوەش هەیە سیستەم و رێکخستنی ئاڵۆزی وەسای لێبکەوێتەوە کە ببێتە مایەی شیرازە تێکچوون و بێ حکوومەتی.

رێکخستنگەلی فیدرالی، یان ئۆتۆنۆمی هەر بۆ خۆیان سەخت دەکەونە گەڕ. چنین بەسیستەمی کۆنباو کە لەوانەیە وتووێژی توند و سەختی لێبکەوێتەوە، پرۆژە مەودا- درێژەکانی چارەسەرکردن بەهۆی قورسایی یان ئاڵۆزییانەوە لەبنەوە هەڵبتەکێنێ.

(نموونەیەکی باشی ئەم تاقیکردنەوەیە، ڕێکخستنی ناوچەییە لە دەستووری سەربەخۆیی کینیاییدا، لەوەش هاوچەرختر سیستەمی ١٩٧٦ی حکوومەتی ئوستانەکانە لە پاپوا غینیای نوێ).

**١-٦: سازمانە نێونەتەوەییە هەرێمایەتییەکان**

International Regional Organizations

توخمێکی نوێ، لێ ناڕاستەوخۆی ڕێکخراوی حکوومەتی بە گوێرەی شوێن، هاتنە ئارای سازمانگەلی نێونەتەوەیی هەرێمایەتییە. لەم سازمانانەدا، دەوڵەتان سەروەریی نیشتمانی خۆیان لە هەمبەر پشکێك لە بەشداریکردن و داڕشتنی بڕیاردا ئاڵوێر پێدەکەن. ئەم سازمانانە خۆیان سیاسەتی گشتی، سەبارەت بە پرس و دۆزی گەورە-گەورە دادەڕێژن. لەم ڕێگەیەوە، ڕادەیەك کۆنترۆڵ بەسەر کاروباری ناوچەیەکی نیشتمانی لە دەسەڵاتی نیشتمانییەوە، بۆ دەسەڵاتێکی بان- نیشتمانی دێتە ڤەگواستن. ئەم کەمکردنەوەیە لە سەروەریی نیشتمانی، ئەگەری ڕێکخستنی نوێ لە نێوان دەوڵەت و هەرێمەکانی خۆیدا، دەکاتەوە. ئەمە سوود و قازانجی بۆ هەردوو لا تێدایە (دەوڵەت و هەرێمەکان). دەوڵەت هەست دەکا لە بنیاتە فرە چینەکانی سیاسەتدانان و کارهەڵسوڕاندندا، هەرێمەکان کەمتر هەڕەشەی لێدەکەن. هەرێمیش بەدڵ و داوتر سەروەریی نیشتمانی پەسند دەکا کە لەوانەیە ببێتە کلیل بۆ بەشداریکردنی لە ڕێکخستنی بەربڵاوتردا.

ئەم سەمت و ئاراستەیە لە یەکێتیی ئەورووپاییدا زۆر پەرەی ئەستاندووە و یاریدەی خاوکردنەوەی ئەو گرژییە دەدا کە جاران لە نێوان دەوڵەت و ئەو هەرێمە سەرسنوورییانەی خۆی کە لەسەر جیابوونەوە ڕشتبوون، هەبوو. هەر بۆ نموونە: یەکێتی ئەورووپایی کارئاسانی بۆ ڕێکخستنەوەیەکی بەسوود بەگوێرەی شوێن بۆ سیاسەت، کاربەڕێوەبردن و ڕاوێژکردن لە هەردوو پارچەی ئیرلەندا کە هەر یەکەیان لە ژێر سەروەریی دەوڵەتێکی جودا دایە کردووە لە کاتێکدا کە پێشنیاری تازە بۆ ئاشتی دەخرێتە ڕوو. نموونەیەکی تر، ئەو هەوڵ و کۆششەیە کە بۆ هێنانەئارای ڕێکخستنێکی

Nordic یەککگرتووی خەڵکی سامی Saami دەدرێ بە توخمێکی جەوهەری ئۆتۆنۆمیشەوە، بەبێ گوێدانە ئەو سەروەرییە (دەوڵەت)ـەی لەسایەیدا دەژین.

## ٢- نموونەگەلی فیدرالیزم و ئۆتۆنۆمی

هەرچەند وەکو باو بووە، فیدرالیزم بۆ مامەڵە لە گەڵ دۆزە ئیتنییەکاندا بەکار نەهاتووە، لێ چەندین نموونە نیشانی دەدەن کە چۆن ئامرازگەلی فیدرالی ، یان ئۆتۆنۆمی یاریدەی خاوبوونەوە و تەنانەت چارەسەری ئاریشەگەلی ناوخۆییان داوە، یان بناخەیەکیان بۆ پێکەوەژیانی بەئاشتییانەی کۆڕ و کۆمەڵە پێکناکۆکەکان لێداوە. نموونەیەکی سەرکەوتووی تایبەتیی ئۆتۆنۆمی، A Land ە کە دانیشتوانی سویدی زمانی ئەو هەرێمە لە ژێر سەروەریی **فینلەندا** لە ساڵی ١٩٢١-ەوە بە رادەیەکی گەورەی ئۆتۆنۆمی کەلتووری و سیاسیی خۆیان شادبوون. هەروا ئۆتۆنۆمی، گرژی و ناخۆشی نێوان خەڵکی ئیتالی زمان و ئەلمانی زمانی لە South Tyrol لە **ئیتالیا** خاوکردووەتەوە. هەر لەم رێگەیەوە داخوازیگەلێکی ئیتنی لە هیندستان مامەڵەیان لەتەکدا کراوە و لەساڵی ١٩٥٦- ەوە دەست بە رێکخستنەوەی ویلایەتەکان بەپێی هێڵە زمانییەکان Lingistic و دابەشبەندیی هەردوو ویلایەتی **پەنجاب** و **بۆمبای** کرایەوە و **ئاسام** Assam و **ناگالاند** Nagaland و **میزولاند** Mizoland یش بوون بە ویلایەت.

هەروا لە **ئیسپانیاش**، دوابەدوای لادانی فرانکۆ، لە سۆنگەی بەندێکی دەستووری ١٩٧٨ -ەوە سەبارەت بە دامەزراندنی "کۆمیونیتەی خودموختار"، بە رادەیەکی گەورە ئاسانکاری بۆ ڤەگواستن بۆ دیموکراسی، کراوە. ئەوەش لە رێگەی بەخشینی رێژەیەکی زۆر لە حکوومەتایەتیکردن بەسەر خۆدا بە کۆمەڵە "مێژووییەکانی" وەك: باسك، کەتەلۆنەکان.. ئیدی فشار بۆ جیابوونەوە و چالاکی تیرۆریستی کەمبووە. لە **فلیپین**، چالاکی جوداخوازانەی چارەکە سەدەیەکی موسڵمانەکان لە **میندناو** بەپێی رێککەوتننامەی ساڵی ١٩٩٦ی نێوان بەرەی رزگاریخوازی نیشتمانی **مۆرۆ** MNLF و حکوومەت پەکی خرا. بە گوێرەی ئەم رێککەوتننامەیە، دەبوایە ئەنجوومەنێك بە

رابەرایەتیی سەرۆکی MNLFبۆ سەرپەرشتیی پەرەپێدانی ١٤ ئوستانەکەی دورگەی میندناوی خواروو دابمەزرابایە (MNLF ئەم دورگەیە بە زێد و نیشتمانی نەریتیی موسڵمانەکان دادەنێت) و پاش سێ ساڵ، هەم راپرسییەکی گشتی و هەم ئۆتۆنۆمییەکی ناوچەیی بەدوادا بهاتبایە.

نموونەیەکی نائاشناتر، خوارووی پاسیفیک–ە South Pasific کە لەسایەیدا ئۆتۆنۆمی هاوکار بووە کێشەو ئاریشەکانی ئەوێ جۆرە حەلوفەسلێکیان بۆ بکرێ (بەشێوەیەکی سەرەکی ناتەباییەکانی نێوان پاپوا غینیای نوێ و بواگینڤیل Bougainville و داخوازیگەلی فرانکفۆن لە ڤانواتو Vanuatu).

شێوەیەکی تازەی ئۆتۆنۆمیش لەو رێکخستنەدا بەرجەستەبووە کە لە سایەیدا هۆنگ کۆنگ لە تەمموزی ١٩٩٧دا گەڕایەوە ژێر سەروەریی دەوڵەتی چین ( دینگ زیاوینگ پێیوایە ئەم شێوەیە لەباریدا هەیە زۆر کێشە و هەرای دنیای ئەمڕۆ چارەسەر بکا). تازەیی ئەم شێوە رێکخستنەوەیە لەوە دایە کە دوو سیستەمی ئابووری و سیاسیی زۆر لێکجودا و بگرە لە زۆر رووەوە پێکناکۆك و دژ لەناو چوارچێوەی یەك دەوڵەتی سەروەردا بەیەکەوە هەڵبکەن. بەریتانیا لەسەر بەڵێنی ئۆتۆنۆمی دان بە هۆنگ کۆنگ کە لە راگەیاندنی هاوبەشی ساڵی ١٩٨٤ی نێوان چین – بەریتانیادا هاتبوو، خۆی بۆ گەڕاندنەوەی هۆنگ کۆنگ بۆ ناو قەوارەی چین سازکرد. ماکوا Macau یش لەساڵی ١٩٩٩ لەسەر بنەمای هەمان پرەنسیپ گەڕایەوە ناو چین.

لەوەش گرنگتر، چین پێوەیە (تایوان) یش هەر بە رێگەی سیاسەتی ((یەك وڵات، دوو سیستەم))ەوە بهێنێتەوە ناو نیشتمانی دایك. ئەمەش رێی تێدەچێ، ئەگەر وتووێژێکی جیدی لە نێوان هەردوو لادا بەڕێوە بچێت و دۆزی سەرەکی وتووێژەکەش لەسەر مەودا و مۆدیلی ئەو ئۆتۆنۆمییە بێت کە بە تایوان دەدرێ. هەنووکە هەوڵ و کۆشش لە ئارادایە بۆ بەلاداخستنی چەندین کێشە و هەرای ناوەکی لە رێگەی رێکخستنگەلی ئۆتۆنۆمییەوە وەکو: سری لانکا– تامیلەکان، ئەندەنووسیا و تیموری رۆژهەلات(١) ، سوودان– باشووری سوودان(٢)، جۆرجیا – ئەبخازیا، هەروا رەوشێکی تر

کە هێشتا نەگەیشتۆتە لێواری کێشە و تەقینەوە، ئەویش پێوەندیی ئایندەی نێوان ئەمریکا و پۆرتۆ ریکۆیە.

ئۆتۆنۆمی، زۆربەی جاران لەلایەن گرووپە نارازییەکانەوە دەخوازرێ: مشەختە سپی پێستەکان و هۆزە کەمینەکان لە **کینیا**، Kingdoms لە **ئۆگەندا**، دوورگەکان لە **پاپوا غینیای نوێ**، **تامیلەکان لە سری لانکا** و ئیدی ئا ئاوا... لێ هەندێ جاریش حکوومەت لە لای خۆیەوە دەستپێشخەری دەکا و وەکو رێگەیەك بۆ خۆپاراستن و بەرگرتن لە جیابوونەوە یان بۆ کۆتایهێنان بە خەباتی چەکداری، ئۆتۆنۆمی دەدا. بۆ نموونە لە **فلیپین** ئۆتۆنۆمی بە **میندناو** دراوە، **باکووری –رۆژهەڵاتی هیندستان**، **فەلەستین**، **ئیسپانیا**، یان بەم دواییە لە **سری لانکا**.. بۆ نموونە کۆنگرەی نیشتمانی هیندی خۆی سازو ئامادەکردبوو، پلەیەکی بەرزی ئۆتۆنۆمی بدا ئەگەر کۆمەڵەی ئیسلامی بە هیندستانێکی یەکگرتوو قایل بوایە، لێ کاتێ **بەریتانیا** ناوبڕەیەکی لە نێوان هەردوولادا هەڵچنی، کۆنگرەی نیشتمانی سەرکەوتووانە بانگەشەی بۆ حکوومەتێکی ناوەندی بەهێزو ویلایاتی لاواز دەستپێکرد.

### ٣- بنەمای قانوونیی ئۆتۆنۆمی

وێڕای ئەوەی کە حەلوفەسلی ئۆتۆنۆمی زۆر بووە، لێ هێشتا بنەمای قانوونیی ئۆتۆنۆمی خویاو روون نییە. ئۆتۆنۆمی دوو بناخەی پرەنسیپی هەیە:

#### ٣-١: کۆمافی کەمینە

لەم ساڵانەی دواییدا، نەتەوە یەکگرتووەکان پەرۆشبوونێکی زێتری دەرهەق بە کۆ- مافی کەمینەکان نیشانداوە و جاڕنامەیەکی لەمەڕ کۆمافی کەمینەکان(٣) پەسند کردووە کە لە مادەدە (٢٧)ی بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی بۆ مافە مەدەنی و سیاسییەکانی تێپەڕاندووە(٤). بێ لەوەش، کۆمیتەکانی مافی مرۆڤ/ UN ، هەندێ راڤە و لێکدانەوەیان بۆ مادەدە ٢٧ کردووە کە دان بەوە دەنێت رادەیەك ئۆتۆنۆمی بۆ پاراستنی کۆ-مافی کەلتووریی کەمینەکان پێویستە. هەروا کۆمیتەی ناوبراو و لایەنی تریش هەوڵ و

کۆششیان بەختکردووە کە مافی چارەی خۆنووسین لە هەرجێیەك پێوەندیی بەو مافەوە هەبێ، وا راڤە بکەن مانای "ئۆتۆنۆمی ناوەکی" لە جیاتی جیابوونەوە بدات. رێبازی OSCE (لەچەندین راگەیاندن و بەکردەوەش هەروا بووە) سیستمگەلی ئۆتۆنۆمی بە خاستر دەزانێ و بڕیارەکانی ئەم رێکخراوەش سەبارەت بە داننان بە جیابوونەوەی کۆمارەکانی یۆگۆسلافیای جاران، پاراستنی تێر و پڕی لەمجۆرەی کەمینەکانی تێدا بووە. رێککەوتننامەی تازەش لەمەڕ گەلانی رەسەن و هۆزەکی لە ولاتانی سەربەخۆ (١٩٨٩) (٥)، گەلاڵەنامەی جاڕی مافەکانی گەلانی رەسەن و خۆجێ، رژێمی ئۆتۆنۆمی بە پەسند دەزانن.

**٢-٣: چارەی خۆنووسین** Self-determination

ئەم چەمکە خۆی لە خۆیدا چەمکێکی چەتون و دژوێستە. لێ چارەی خۆنووسین زێتر بە شەرت و شروتی ناوەکی، رێکخستنی دیموکراتیکی دەوڵەت شیکراوەتەوە و مانای لێدراوەتەوە تا بە باری جیابوونەوە، یان سەربەخۆبوون. کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان بەر لە چەند ساڵێك ئۆتۆنۆمی وەکو بەیانکردنی چارەی خۆنووسین لێکداوەتەوە. خەریکبوونی نەتەوە یەکگرتووەکان و سازمانگەلی تری نێودەوڵەتی بە چارەسەری کێشە و ئاریشە ناوخۆییەکانی دەوڵەتان، یارمەتی ئەوەی داوە چەمکی چارەی خۆنووسین گەشەی زێتر بکا، کە لە هەلومەرجی گونجاو و لەباردا ئۆتۆنۆمی بگرێتە خۆ(٦).

ئەم تێڕوانینە بۆ چارەی خۆنووسین لە هەندێ دەستووری نیشتمانیی ولاتاندا پشتەوانی لێکراوە، لێ لەم قۆناخەدا تەنیا ئەمەیان سەمت و ئاراستەیەکە و هیچی تر. زۆربەی جاران بنەما دەستوورییەکانی ئۆتۆنۆمی لەماوەگەلی گۆڕانکاریی کۆمەلایەتی - سیاسیدا پەسندکراون، لەکاودانێکدا کە رژێمێکی ئۆتۆکراتی لەسەر کار لابراوە (لە دەمی وادا ئۆتۆنۆمی رەواییەکی بەرچاو بەهەند وەرگیراوی دەبێ)، یان قەیرانەکە بووە بە کێشەی نێوان زۆرینە و کەمینە، یان فشارێکی توندی نێونەتەوەیی لەئارادا هەبووە.

لە سۆنگەی ئەم هۆکارانەوە، هەنووکە چەندین دەستوور دان بە هەندێ مافی حکوومەتایەتیکردن بەسەرخۆدا دەنێن(٧) وەکو **فلیپین** (سەبارەت بە هەردوو ئوستان: یەکەمیان بۆ گەلێکی رەسەن و ئەوی تریان بۆ کەمینەیەکی ئایینی)، **ئیسپانیا** ( ئۆتۆنۆمی بۆ سێ هەرێم دابینکردووە و داوای لەوانی تریش کردووە سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی وتووێژ لە گەڵ ناوەندا بکەن)، **پاپوا غینیای نوێ** ( رێگەی بە ئوستانەکانی خۆی داوە لە گەڵ حکوومەتی ناوەندیدا سەبارەت بە دەسەڵاتپێدان بکەونە وتووێژەوە)، **فیجی** (دانی بە مافی گەلێکی رەسەن ناوە، کە لە ئاستی ناوچەیی و خۆجێیدا ئیدارەی خۆی هەبێ )، دواهەمینیان **ئەتیوبیایە** (کە مافی بە نەتەوە و هاووڵاتیان و گەلانی خۆی داوە کە داوای دەسەڵاتگەلێکی فرەی وەکو ویلایات لە چوارچێوەی فیدراسیۆندا بە مافی جیابوونەوەشەوە بکەن). دەستووری **چین** کۆمافی کەمینە ئیتنییەکانی بۆ حکوومەتایەتیکردن بەسەرخۆ دای چەسپاندووە، لێ بەکردەوە باڵادەستیی حزبی شیوعی، ئۆتۆنۆمی لە کۆماری چین بەتاڵ و بنکۆڵکردووە. لە نموونەی دیدا، دەستوور رێگە دەدا وەلێ ناخوازێت ناوچەگەلی ئۆتۆنۆم دابمەزرێ. لە لایەکی ترەوە، دەبێ تێبینی ئەوەش بکرێ کە هەندێ دەستوور پانتاییەك بۆ ئۆتۆنۆمی ناهێڵنەوە، یان ئاقارەکەی بەرتەسك دەکەن لە رێگەی داوای لە بابەتی دەبێ دەوڵەت "یەککگرتوو" بێ یان دەربڕین و دەستەواژەی ترەوە(٨)، بەندو برگەیەکی قانوونی وەسا، ئاستەنگی بۆ پەسندکردن ، یان جێبەجێکردنی دەسەڵاتپێدانێکی بەمانا دروستکردووە لە وڵاتانی وەك **سری لانکا، پاپوا غینیای نوێ و چین.**

بوون، یان نەبوونی مافێك لە قانوونی نێودەوڵەتی، یان قانوونی نیشتمانی سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی، تەبای ئەو بەندە قانوونیانەی مەوداکانی ئۆتۆنۆمی بەرتەسك دەکەن، دەتوانێ دەورێکی گرنگ لە بەرێوەچوونی وتووێژ و سازشی رێژەیی لەنێوان هەڵویستی لایەنەکان بگێرێ بە تایبەتی لەو کاتانەی ناوبژیوانێکی نێودەوڵەتی، یان تەرەفێکی سێیەم ئامادەی وتووێژەکان بێ.

## ٤- لایەنە بەسوودەکانی چارەسەرگەلی ئۆتۆنۆمی و فیدرالیزم

میکانیزمەکانی فیدرالیزم و ئۆتۆنۆمی چەند لایەنێکی باشیان هەیە:

**٤-١: رادەیەك دەسەلاتی دەوڵەت بۆ کەمینەکان دەستەبەر دەکا:**

کەمینەکان دەشێن لەم رێگەیەوە بە دەسەلاتگەلێکی راپەڕاندن و یاسادانان و دارایی شادبن، نەك تەنیا نوێنەرایەتیکردنێکی پەرلەمانتاری و پشکێکی کەم لە سیاسەت دارشتن و دابەشینەوەی سەرچاوەو داهاتەکان.

**٤-٢: ئەگەر و شیانی خاستر بۆ پاراستنی کەلتووری کەمینەکان دەرەخسێنیٚ:**

توانا بە کەمینەکان دەبەخشیٚ کە بریارگەلی گرنگ بۆ خۆیان بدەن و بگرە هەمیشە ئەگەری خاستر بۆ پاراستنی کەلتوورییان فەراهەم دەکا.

**٤-٣: لەوانەیە پەکی داخوازی جیابوونەوە بخات، یان بە کۆتای بهێنیٚ:**

نەرمیی ئامرازی فیدرالی بە هۆی دابەشکردنی دەسەلاتەکان(٩) و بنیاتی دامەزراوەکان، دەرفەت بۆ جۆرو تەرزی جیا- جیای بەیەکەوە سازان و هەڵکردن دەکاتەوە، هەروا لە شێوەکانی تری پاراستنی کەمینەکان دروسترە بۆ سات و سەوداو سازش.

**٤-٤: دەشیٚ یەکخستنی سیاسیی گرووپە ئیتنییەکان زێدە بکا:**

ئۆتۆنۆمی، هێزو توانا بە دەوڵەت دەدا، دەرفەت بە گەلان زێتر دەدا کە لە سیستەمی سیاسیدا پێشبرکیٚ بکەن، ئەم کێبەرکیٚ سیاسییە دەشیٚ بە دەوری خۆیەوە جەخت لەسەر جیاوازیی لەناو گرووپەکاندا بکاتەوە و سەرەنجام حزبە ئیتنییە توندوتۆڵەکانی جاران لەبەر یەکهەڵوەشێنێتەوە. زێدەبوونی حزبان وا دەکا هەڤالبەندیی حزبە هاوشێوە ئیتنییەکان لەسەرانسەری ولاتدا بێتە ئاراوە ( نموونەی نایجیریا و هیند). رێکخستنی ناجۆری هەرێمایەتی دنەی داخوازیگەلی کۆڕ و کۆمەڵی دیکە دەدا کە رێکخستنی هاوشێوە بۆ خۆیان بخوازن ( وەکو هیند، نایجیریا، پاپوا غینیای نوێ). بڵاوبوونەوە و زێدەبوونی ئەو رێکخستنانە، روانگەکانی یەکێتیی نیشتمانی زێدە دەکەن

وەك کە دەسەلاّتی دەولّەت بلاّودەکەنەوە و دەسەلاّتەکانی ناوەندی وا لێدەکەن بەلانس لە نێوان بەرژەوەندە هەرێمایەتی و نیشتمانییەکان رابگرێ.

**٤-٥: دەشێ بەشداری لە بەدەستووریکردندا بکا:**

رێکخستنی ئۆتۆنۆمی، هەروا میکانیزمەکانی جێبەجێکردنی، جەخت لەسەر حوکمی قانوون، جیاکردنەوەی دەسەلاّتەکان، دەوری دامەزراوە سەربەخۆییەکان دەکەنەوە. بە دامەزراوەکردنی ئۆتۆنۆمی بەتایبەتی ئەو رێوشوێنانەی پێوەندی نێوان ناوەند و هەرێم رێکدەخەن، دەبێ لەسەر بنەمای وتووێژ، ریزگرتنی یەکدی و سات و سەودا و سازش دابمەزرێ و هەر ئاواش ئەو چلۆنایەتیانە موکم و بەهێز دەبن.

**٤-٦: ئۆتۆنۆمی رێگە بە گرفتە ئیتنییەکان دەدا، بەبێ چەسپاندنی ئیتنیگەرایی حەلوفەسلێکیان بۆ بکرێ**

لەسۆنگەی ئەمەوە ئۆتۆنۆمی جەخت لەسەر پێناسەکردنی هەرێمێك وەکو قەوارەیەکی جیوگرافی نەك قەوراوەیەکی ئیتنی دەکاتەوە. هەرچۆن بێ لەوانەیە هەندێ شێوە و فۆرمی ئۆتۆنۆمی لەراستیدا ئیتنیگەرایی بچەسپێنن، وەکو لە باری (RESERVE)ەکاندا وایە و تیایاندا رەهەندی کەلتووری و پیویستیی پاراستنی پێناسەی ئەو گرووپە لەوانەیە سنوور لە رووی بێگانان قایم و توند بکەن. پاساوێکی گرنگ سەبارەت بە ئامرازی ئۆتۆنۆمی ئەوەیە کە ئەم ئامرازە تەنیا ئەو کاتە دەشێ بکەوێتە کار کە کەمینەیەك لەباری جیوگرافییەوە بەسەریەکەوە بژی و لە پانتاییەکەدا زۆرینە بێ. چارەسەرێك بۆ نەبوونی گردبوونەوەی جیوگرافی ئەوەیە: جۆرە فیدرالیزمێکی یەکگرتووی هاوبەش کە دەشێ فۆرمی جیای هەبێ دەعەمەل بێ – سیستەمی دەعەمەل هاتووی میللەت لە ئیمپراتۆریای عوسمانلی ، سیستەمی فیجی سەبارەت بە ئیدارەی خۆجێی ، سیستەمی هیندی سەبارەت بە قانوونگەلی باری کەسێتی، یەکگرتن لە قوبرس لە ساتەوەختی سەربەخۆیی و ئێستاش لە بەلجیکا.

**٤-٧: تەنانەت ئەگەر حەلوفەسلی ئۆتۆنۆمی هەندەش نەخایانێ، کۆتایی هێنان بەکاری توندوتیژی فەزایەك بۆ حەسانەوە و پشوودان فەراهەم دەکا**

هەروا گرنگە دان بەوەدا بنرێ کە تەنانەت رێککەوتننامەش دەربارەی ئۆتۆنۆمی مۆربکرێ، کۆتایی بە گرژی یان کاری توندوتیژی و شەڕوشۆڕ بەو مانایە نییە کە ئەم گرژییە دواتر سەرهەڵنادەنەوە؟ یان ئەم لایەنە یان ئەوی تر لە ئۆتۆنۆمی هەڵناگەڕێتەوە یان پێناسەی ناکاتەوە. ئەمە لە چەندین وڵاتی ئەفریقیادا رووی داوە کە هەندێ رادەی ئۆتۆنۆمی هەرێمیان تێدا هەبووە وەکو مەرجێکی پێشوەختەی سەربەخۆبوون (وەك لە ئۆگەندا، کینیاو غینیا). زۆر نموونەی دیکە هەن کە رێکخستنی فیدرالی یا ئۆتۆنۆمی تەمەنی درێژ نەبووە و هەندەی نەخایاندووە و شەڕ و شۆڕ بەرپا بووەتەوە ( وەکو لە سوودان، ئەریتریا و دیفاکتۆی کەشمیر). بەهەرحاڵ تەنانەت لە هەر جێگەیەکیشدا ئۆتۆنۆمی یان فیدرالی بەردەوام نەبووبێ یان گرژیی سەری هەڵدابێتەوە، لێ کۆتایی هاتنی کاری دژمنکاری، بۆ ماوەیەك فەزایەکی بۆ حەسانەوە فەراهەم کردووە و یاریدەی ئەوەی داوە کێشە و خاڵەکانی جیاوازی پێناسە بکرێنەوە و تەنانەت چوارچێوەیەك بۆ وتووێژەکان لە ئایندەدا برەخسێ(١٠). دوا خاڵ دەشێ گرنگ بێ چونکە گرفتی دووبارە بۆوە لە زۆر هەرا و کێشەی ئیتنیدا بریتییە لە دۆزینەوەی چوارچێوەیەك و تەنانەت هەندێ جار دۆزینەوەی لایەنەکانی وتووێژیش (وەکو سری لانکا، پەنجاب، یان کەشمیر، هیند هەندێ لە گرفتە ئیتنییەکانی لە رێگەی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی ئوستانەکان لە ((ناوچە دۆزەخییەکاندا)) بەر لەوەی وتووێژ دەستپێبکا، خاوکردۆتەوە). ئەو لایەنەی لە هەڵبژاردن دەباتەوە بانگەشەی ئەوە دەکا کە گەل رێگەی پێداوە بەناوی ئەوەوە بکەوێتە گفتوگۆ (وەکو لە هەڵبژاردنی ١٩٩٦ی کشمیر روویدا). هەندێ جار تەنیا بەڵێندان بە ئۆتۆنۆمی گرژییەکان خاودەکاتەوە وەکو تاقیکردنەوەی باشووری ئەفریقیا.

### ٥- بەرەنگاربوونەوەی فیدرالیزم و ئۆتۆنۆمی

سەرباری ئەو رووە باشە ئاشکرایانە، پەسندکردنی ئۆتۆنۆمی لەهەندێ باری ناوەکیدا، بەتایبەتی کێشە و هەرای ئیتنیدا بەرەنگاری دەکرێ. چونکە ئۆتۆنۆمی

بریتییە لە بنیاتنانەوەی دەوڵەت و دابەشینەوەی سەرچاوەکان کە بەرژەوەندە وەدەستهاتووەکان سەراوژێر دەکا. دەرەنجامەکان بریتین لە:

**٥-١: سەرکردەکانی زۆرینە لەوە دەترسن پشتەوانیی دەنگدەران لە دەست بدەن:**

سەرکردەکانی کۆمەڵەی زۆرینە لەوانەیە دژی دانی ئۆتۆنۆمی بە هەرێم و دەڤەری کەمینە بوەستن، نەبادا پشتەوانیی دەنگدەران لە ناو کۆمەڵەی خۆیاندا لە دەست بدەن (ئەم گرفتە سری لانکای بێ سەروبەرکردووە). سەرکردەکانی کۆمەڵەی زۆرینە، تەنانەت ئەگەر مەیلیشیان بەلای ئۆتۆنۆمیدا هەبێ، بروایان بەخۆ نییە کە کە بتوانن رێککەوتننامەی ئۆتۆنۆمی جێ بەجێ بکەن، بەتایبەتی ئەگەر پێویستیی بە دەسکاریکردنی دەستوور ، یان ریفراندۆم یان دەرکردنی یاسایەکی تازە هەبێ.

**٥-٢: ترسان لەوەی ئۆتۆنۆمی ببێتە هۆکار و قزگەی جیابوونەوە:**

ئەمەیان وەکو گرفتێکی جیدی چاوی لێدەکرێ کاتێ ئەو گرووپەی داوای ئۆتۆنۆمی دەکا، هاوسێی دەوڵەتێکی دراوسێی نزیك بێ و پێوەندیی خزمایەتی و نزیکایەتی لە گەڵیدا هەبێ. هەروا ئەو ئۆتۆنۆمییەی بە کەمینەیەك لە زێدی خۆی دەدرێ لەوانەیە بە دەوری خۆی کەمینەگەلی تازەی لێبکەوێتەوە ( وەکو باری موسڵمانەکانی باکووری رۆژهەلاتی سری لانکا کە پڵنگەکانی تامیل دەیانەوێ کۆنترۆلی بکەن ، یان کریستیانەکانی میندانائو، یان ترس و بیمی ویلایەتە بۆرینۆییەکانی مالیزیایی کە زۆر لە ئەندەنووسیاوە نزیکن). ئەم رەوشە وا دەکا کەمینەی تازەش داخوازی ئۆتۆنۆمی بکەن و لەبەریەکهەڵوەشانەوەی زیاتری لێبکەوێتەوە. هەروا نیگەرانی ئەوەش هەیە کە بەها ئەساسییەکانی دەوڵەت سات و سەودایان لەبەرانبەر دانان بە بەها ئایینی و کەلتوورییە جیاوازەکان لە دوتوێی ئۆتۆنۆمی، پێبکرێ. هەروا ئەمە پێوەندیی بەکارایی ئیداری و ئابوورییەوە هەیە کە زۆر جاران دەبیندرێ بەهۆی رێکخستنگەلی ئالۆزیی ئۆتۆنۆمییەوە، دەوڵەت بکەوێتە بەر مەترسییەوە.

**٥-٣: ئەنجامە پێشبینینەکراوەکان:**

پەسندکردنی ئامرازی فیدرالی رەوشی پێوەندییە ئیتنییەکان دەگۆڕێ. رێکخستنگەلی هەرێمایەتی یان دامەزراوەیی، تەواو و بێگەرد بەکەڵك و هاوکار نییە. تەنیا بە رەخساندنی چوارچێوەیەك بۆ پێوەندییەکانی نێو- ئیتنی، کار لەم پێوەندییانە دەکەن و پێکیدەهێنن . لەوانەیە شێوەگەلی نوێی پێناسە بەدیبهێنن، یان پێناسە کۆنەکان موکم و پتەو بکەن. لەوانەیە توانای گرووپێکی تایبەت بەهێز یان کەم بکەن بۆ دادۆشینی سەرچاوەکانی دەوڵەت. رەنگە شێوەگەلێکی نوێی رکابەری و کێشە و هەرا بنێنەوە.

**٥-٤: لەوانەیە کۆمەڵەکانی تریش بۆ ئۆتۆنۆمی ساز و تەیار بکەن:**

هاوپێوەند لەگەڵ خاڵی پێشتر، ترسی ئەوەش هەیە ئەگەر ئۆتۆنۆمی لەسەر بنەمای ئیتنی پاساو بدرێ، ئەو بنەمایانەی کە پاساو بۆ دابینکردنی ئۆتۆنۆمی دێننەوە (پێناسە، هەستکردن بە جیاکاری، ستەم و نادادپەروەری) لەوانەیە هاوتەریب لەگەڵ هێڵە ئیتنییەکاندا کۆمەڵەی تریش ساز و تەیار بکەن. لەراستیدا، ئەمە سازکردنی کۆمەڵەی ئیتنی ترە.

**٥-٥: رێکخستنگەلی ئۆتۆنۆمی بۆ بەیەکەوەهەڵکردنی ئیتنی دادیان نەداوە:**

دژایەتی لەهەمبەر ئۆتۆنۆمی لەوانەیە بەهێز بێ بەو مانایەی کە ئۆتۆنۆمی بە نیاز و مەبەستی بەیەکەوەهەڵکردنی ئیتنی سوودێکی نەبووە. چەندین نموونەی سەرنەکەوتوو هەن: وازهێنان لە ئۆتۆنۆمی(١١)، هەوڵدان و تەنانەت جیابوونەوەی سەرکەوتووانە لەسەر بنەمای ئۆتۆنۆمی (هەروەکو لە هەڵوەشانەوەی یۆگۆسلافیادا بیندرا). تەنانەت ئەگەر ئاکامگەلی کارەساتهێنی واش هزر نەکرێ دژایەتی لەسەر بنچینەی ئەوەی کە کەلتووری سیاسیی هاوپێوەند نامۆیە بەداوونەریتی راوێژکردن و سات و سەودا کە بۆ سەرکەوتن پێویستن.

## ٦- بنیاتنانی ڕێکخستنگەلی ئۆتۆنۆمی

ئەوانە هەموو بەهاو بایەخگەلی ڕەوان. بەڵام ئەو ئەنجامەمان پێ دیکتە ناکەن کە نابێ ئۆتۆنۆمی مامەڵە لە تەك كێشە و هەرای ئیتنی بکا. چ شتێك پێویستە بۆ بنیادنانی ڕێکخستنی ئۆتۆنۆمی تا لایەنە باشەکانی زێدە بکرێ و لایەنە خراپەکانی کەم بکرێتەوە؟ لەخوارەوە هەندێ ئیعتوبارات دەخەینە روو کە سەروکاریان لە گەڵ نەخشەسازیی ئۆتۆنۆمییەوە هەیە:

بەر لەوە، ئەوەی ئێمە سێ خاڵی سەرەکی دێنینەوە، یەکەم چەمکی سەرکەوتنی ئۆتۆنۆمی خۆی لە خۆیدا چەمکێکی گرفتئامێزە، چونکە کۆدەنگێکی خویا لەسەر ئەم پێوەرە نییە. دووەم: زەحمەتە فاکتەرە گشتییەکان کە کار لە کردەی ئۆتۆنۆمی دەکەن ( وەکو بێ برەویی ئابووری) لەو فاکتەرانەی کە تایبەتن بە ئۆتۆنۆمی داببرێن. سێیەم: ئۆتۆنۆمی پرۆسەیەکە و چار نییە لە ڕەوتی کارکردنی خۆیدا دەگۆڕێ، تەنانەت بە ئامانجە ئەسڵییەکانی ئۆتۆنۆمیشەوە.

**ڕێگەکارەکانی ڕێکخستنی ئۆتۆنۆمی ئەمانە دەگرنەوە:**

**٦-١: دامەزرانی ئۆتۆنۆمی بە یەکجار ، یان لە دووتوێی قۆناخ- بەقۆناخ و پرۆسەیەکی وتووێژئاسادا:**

دەبێ ئەوە یەکلا بکرێتەوە کە داخوا ورد و درشتی سیستەمی ئۆتۆنۆمی بەیەکجارەکی ڕێکەوتنی لەسەر بکرێ، یان لەڕێگەی زنجیرەیەك وتووێژی قۆناخ بە قۆناخەوە ئۆتۆنۆمی دابمەزرێ؟ لێ زەوینەی ناوەڕاست ئەوەیە کە پرەنسیپە هەراوەکانی ئۆتۆنۆمی ڕێککەوتنیان لەسەر بکرێ. هەر یەك لەم ڕێگەکارانە هەم ڕووی باش و هەم ڕووی خراپی هەیە و گەشبینترین بڕیار پشت بە هەلومەرجی کۆنکرێت دەبەستێ. وا بەباش دەزاندرێ کە لە دەسپێکەوە بە لانی کەمەوە لەسەر بنەما ئەساسییەکان ڕێککەوتن بکرێ. بەپێی تەجرەبەی چەندان وڵات، ئەو کێشانەی کە چارەسەرکردنیان بۆ ئایندە جێهێڵدراوە، ناکرێ بە هەڵەشەیی و پەلە پەل وتووێژیان لەسەربکرێ چونکە لەوانەیە سەرلەبەری وتووێژەکە بێئاکام بێ و هەڵبوەشێتەوە.

لەلایەکەوە ئەوانەی کە دژی ئۆتۆنۆمین، دەرفەتی خۆکۆکردنەوەیان بۆ دەڕەخسێ. لەسەرێکی دیکەوە ئەو رێککەوتننانەی بەپەلە پەل کراون و ئەلتەرناتیڤەکان باش هەڵنەسەنگێندراون لەوانەیە کەلێن و کەمو کوڕیان تێبکەوێ.

لەم پێڤاژۆیەدا، دەبێ هەندێ میکانیزم دابندرێ بۆ ئەوەی رێوشوێنەکانی ئۆتۆنۆمی جێبەجێ بکرێن. دادگەکان دەتوانن دەورێکی گرنگ بگێڕن سەبارەت بەوەی کە داخوا رێوشوێنی پێویست دانراون و جێبەجێکراون یان نا؟ هەروا دەکرێ دەستەی سیاسی یان ئیداری بۆ چاوەدێریی پرۆسەی جێبەجێکردنی ئۆتۆنۆمی دابندرێ، جاری واش هەیە چاوەدێریی نێودەوڵەتی، یان مەرجی تر بۆ دابینکردنی جێبەجێکردن پێویستە (وەکو رێککەوتنی دایتۆن یان رێککەوتنی نێوان کەمبۆدییەکان لە پاریس).

**٦-٢: گرنگیی کاڕاییەکان**

ئەگەر ئۆتۆنۆمی بەبێ راوێژ و پرس و رای تەواو دابمەزرێ لەوانەیە ناتەبایی تێبکەوێ و رەوایی تێدا نەبێ. زۆرێك لە سیستەمگەلی ئۆتۆنۆمی وەکو بەشێك لە حەلوفەسلی دەستووری لە سەروبەری سەربەخۆییدا سەپێندراوە و پاشان بە فیتەی کۆمەڵەی زۆرینە ناوەڕۆکیان ڤالاکراوە. هەروا دەشێ ئۆتۆنۆمی کار لەپێوەندییەکانی ناوچە بکا و لەوانەیە لەلایەن کۆڕوکۆمەڵی گرنگ و دیاریکراودا بەرەنگاری بکرێ. لە باری پرەنسیپەوە وا باشە پرس و رای تێروتەسەل و ریفراندۆم لەبارەی پرۆژە پێشنیارکراوەکانی ئۆتۆنۆمییەوە بکرێ. لە زۆر دەستووری نیشتمانی، ئەگەر ئۆتۆنۆمی بێتە پێشەوە دەبێ لە رێگەی ریفراندەمەوە پەسند بکرێ ( وەکو ئەسپانیا، ئەتیوبیا، و بەشێوەیەکی ناراستەوخۆش پاپوا غینیای نوێ). هەروا داخوازی تریش هەیە کە دەبێ لەم بارەیەوە کۆمەڵەی دامەزرێنەر رێگە بە وتووێژ بدا.

سەرلەبەری ئەم رێگە و شێوازانە رەوایی بە رێکخستنەکانی ئۆتۆنۆمی دەدەن، لەگەڵ ئەوەشدا مەترسی ئەوەش هەیە، ریفراندۆمی گشتی ئەو پرۆژەکە رەتبکاتەوە ئەگەر کۆمیونیتەی زۆرینە دژی پرۆژەکە بوون. جاری وا هەیە دەبێ بەلانس بڕیارەکان رابگیرێ. لەرێگەی سەرکردە سیاسییەکان و گەلدا.

**٦-٣: پلەی سەقامگیری**

ئەو شێوازەی بڕیاری پێویستی بۆ ئۆتۆنۆمی پێوەرگیراوە هەر چییەك بێ، گرنگ ئەوەیە گەرەنتی قانوونیی جێگیر و چەسپاوی هەبێ. بە تایبەتی دەسەڵاتەکانی ناوەند بۆیان نەبێ یەکلایەنە ئەو بڕیار و بڕگانە بگۆڕن کە پێوەندییان بە ئۆتۆنۆمییەوە هەیە. ئەگەر حکوومەتی ناوەندی بشێت ئەو بڕیار و بڕگانە بە قازانجی خۆی بگۆڕێ ، ئەوا بایەخی پرس و ڕا وەرگرتنی هەرێمەکان لە لای حکوومەتی ناوەندی کەم دەبێتەوە(١٢).

**٦-٤: شێوازەکانی چارەسەرکردنی کێشە:**

لەباری پرەنسیپەوە بۆ سەروبەرکردنی ئاریشە و کێشە(١٣)، دەبێ هەوەڵجار لە ڕێگەی پرس و ڕا و ناوبژییەوە هەوڵ و تەقەلا بەخت بکرێ ، ئەگەر ئەمە سەریان نەگرت پەنا ببردرێتە بەر دادوەری. ئەگەر شێوازەکانی حەلوفەسل بێ لایەن بوون و هەردوو لایەن پێی ڕازی بوون ئەوا دەشێ بەپێی پرەنسیپە پان و بەرینەکان کار بکرێ ( وەکو ئیسپانیا). بەپێچەوانەوە ناچار دەبن قسە لەسەر وردودرشتی مەسەلەکان بکەن.

**٦-٥: میکانیزمەکانی ڕاوێژپێکردن**

کارێکی بەسوودە ئەگەر میکانیزمگەلی ڕاوێژ و ڕاوێژکاری لە نێوان سەنتەرو هەرێمەکاندا بەشێوەیەکی پاژەکی بۆ خۆ لادان لە سکالا و سکالاکاری، دابمەزرێ ، ئەمە خۆی داننانیشە بە دینامیکی بوونی ئۆتۆنۆمی. هەرچەند هەوڵ و تەقەلا بەختبکرێ بۆ جیاکردنەوەی بەرپرسیارەتیی لە نێوان ناوەند و هەرێمەکاندا لێ وێڕای هەماهەنگی، شتی تێکهەڵکێش لە نێوان هەردوو لادا هەیە.

**٦-٦: گرفت لە گەڵ ناجوری**

گرفتی تایبەتی ناجۆری ئەوەیە کە هەموو ناوچەکان دەیانەوێ هەمان ئەو دەسەلاتە تەواوەیان هەبێ کە هەرێمێکی دیاریکراو هەیەتی، لەکاتێکدا هەرێمی گۆڕین دەیەوێ ئەولەویەتی خۆی بپارێزێ هەروەکو لە تاقیکردنەوەکانی Bougainvile و کیوبیك و باسك و کەتەلۆنیادا دەیبینین. لەوانەیە لە هەمبەر ئەو ناوچەیەی کە ئیمتیازاتی هەیە جیا لە ناوچەکانی تری وڵات نارەزایی پەیدا ببێ و ئیدی باری ئەو ناوچەیە مەترسیدار

دەبێ (وەکو نارەزایی ناوچەکانی تەنزانیا سەبارەت بەو دەسەلاّتە تایبەتیانەی بە زەنجبار دراون).

### ٦-٧: پاراستنی مافەکان

ئاریشەیەکی تر سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی ناجۆر، بەتایبەتی ئەو ئۆتۆنۆمییەی کە لەسەر بنەمای جیاوازیی کەلتووری دامەزراوە، ئەوەیە کە کۆمەڵەی خودموختار یان هەرێمی خودموختار دەبێ دەست بە پێوەرەکانی مافی مرۆڤەوە بگرێ. ئەم رستەیە بە روونی لە پەیمانی کەنەدا سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ هاتووە. لەسایەیدا، ئوستانێکی دیاریکراو، دەشێ قانوونێك دەربکا کە لەگەڵ پەیمانی کەنەدا تێکنەکاتەوە بەمەرجێك بەئاشکرا داخۆنیەك دەربکا- بۆ نموونە کیوبیك. نموونەیەکی تر، قانوونی باری کەسێتییە لە هیند، ژنە تەلاّقدراوە موسڵمانەکان، دەبێ بەرفەرمانی شەریعەت بن بە مەبەستی خۆپاراستن لە مێردە کۆنەکانیان لەجیاتی کەڵك وەرگرتن لەو بڕیار و بنەما بەرترانەی لە قانوونگەلی نیشتمانیدا هەن. ئەم بڕگە قانوونیانە لەوانەیە کار لە مافەکانی هاووڵاتیانی دەرەوەی کۆمیونیتەکە بکات. ئەوانە دەبێ بەرفەرمانی ئەو کۆت و بەندانە بن کە بەسەر شتە خۆجێیەکانی تری هەرێمەکە پەیڕەو ناکرێن (سەبارەت بە ئاکنجی بوون یان کارپێکردن). ئەو کەمینە نوێیانەی کە لە ئاکامی دانی ئۆتۆنۆمی بە هەرێمێك دەکەونەوە دەبێ بپارێزرێن نەبادا ببنە قوربانی. دەبێ بەرژەوەندەکانی کەمینەی نوێ (لەهەرجێگەیەکدا کەمینە هەبێ) دابین بکرێ لە رێگەی پێوەندیگەلی سەربارەوە جا چ حکوومەتی خۆجێی ئەمە دابین بکا(١٤) یان لە رێگەی بەرپرسیارەتییە تایبەتییەکانی حکوومەتی ناوەندییەوە.

ئەو بەند و بڕگە قانوونییانەی دان بە بەها جیاوازەکان لە سەر بنەمای بەرتری بنێ ئەوا مافە بنەڕەتییەکانی تاکەکەسان و کۆمەڵەکان دەخاتە ژێر پێوە و بێزاری لەناو سایلی دانیشتوان دەنێتەوە. بۆیە لەسەرینی ئەمەوە دەشێ حوکمی زاتی ببێتە سەرچاوەی کێشە، زێتر لەوەی کە چارەسەری کێشە بکات. ئەگەر بایەخێکی زێدە بۆ کەمکردنەوەی جیاوازییەکان بە سازش و سات و سەودا درا، یان بایەخ و سەرنجێکی

کەم درایە بیناکردنی ئەو نەریت و بەهاو ئاواتانەی کە گەلێکی دیاریکراو تیایدا هاوبەشن لەوانەیە شیرازە تێکچوونی زێتری لێبکەوێتەوە و بەهای هاریکاری کەم ببێتەوە.

لەکاتێکدا دان بە جیاوازییە کەلتووری و شتە ناسکەکان دەندرێ گرنگ ئەوەیە جەخت لەسەر بەها نیشتمانییەکان بکرێتەوە و مافە بنەڕەتییەکانی هەموو کەسان بپارێزرێ.

**پەراوێزەکان:**

١- لە ٢٠٠١-ەوە **تیموری ڕۆژهەلات** لەئەنجامی راپرسییەکی گشتیدا کە لە ١٩٩٩ بەڕێوەچوو بەسەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، بووە بە دەوڵەتێکی سەربەخۆو ئەندامی UN . (وەرگێڕ).

٢- شایانی باسە ئەمساڵ لەنێوان حکومەتی سودان و باشوورییەکانی سودان ڕێککەوتن کرا (وەرگێڕ).

٣- مەبەست لەو جاڕنامەیە " اعلان حقوق الاشخاص المنتمين الى اقليات قومية او اثنية والى اقليات دينية او لغوية"یە کە کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان بەبڕیاری ٤٧/١٣٥ لە ١٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٢ پەسندی کردووە. (وەرگێڕ).

٤- دەقی مادده ٢٧ی بەڵێننامەی نێودەوڵەتی بەمجۆرەیە: لا يجوز انكار حق الاشخاص المنتمين الى اقليات عنصرية او دينية او لغوية قائمة في دولة ما، في الاشتراك مع الاعضاء الاخرين من جماعتهم في التمتع بثقافتهم او الاعلان عن ديانتهم واتباع تعاليمها او استعمال لغتهم.

ڕێککەوتننامەی ناوبراو لە١٦ی ١٢ی ١٩٦٦ —ەوە پەسند کراوە و لە ساڵی ١٩٧٦-ەوە کاری پێ دەکرێ و دەوڵەتی عیراقیش یەکێکە لەو دەوڵەتانەی ئەم ڕێککەوتننامەیەیان مۆر کردووە. (وەرگێڕ)

٥- ئەم ڕێککەوتننامەیە کە لە ٤٤ مادده پێکهاتووە، کۆنگرەی گشتی ڕێکخراوی کاری نێودەوڵەتی لە خولی حەفتاو شەشەمی خۆیدا لە ٢٧ی حوزەیرانی ١٩٨٩دا بڕیاری لێداوە. (وەرگێڕ)

٦- ئەم لێکدانەوەیە، ئەو دەمە ڕاست دەردەچێ، ئەگەر حکومەتی ناوەندی بەڕاست نوێنەرایەتی هەموو پێکهاتە جیا- جیاکان بکا بەبێ فەرق و جیاوازیکردن لەسەر بنەمای ئیتنی، زمان، کولتوور، ئایین.. واتە بنیادی دەوڵەت بەشێوەیەك داڕێژرابێ کە ڕێگە لە ستەم و چەساندنەوە بگرێ. لەسەرێکی دیکەوە، چەمکی چارەی خۆنووسین لەدوای نەمانی شاڕی ساردەوە پەرەی ستاندووەو لە سنووری لێکدانەوەی کۆنباوی جاران دەرچووە.. لە دوای ١٩٨٩-ەوە تا ئێستا ٢٢ دەوڵەتی تازە بەپشتبەستن بەم مافە دروست بوون. لێرەدا پرسیارێك دێتە گۆڕێ داخوا ئەگەر لە عیراقی دوای سەدام، دیموکراسی و ئاشتی و سەقامگیریی ناهەتەدی و حکومەتی ناوەندی نەشیا ڕێوشوێنێکی دەستووری ئەوتۆ بدۆزێتەوە کە هەموو نەتەوەو پێکهاتەکان، بەبێ لەبەرچاوگرتنی زۆرینەو کەمینە لە ڕووی ژمارەوە، بەیەکەوە بسازێن، ئەوە هەقی کورد نییە بەپێی مافی چارەی خۆنووسین لە ڕێگەی ریفراندۆمێکەوە یان هەر شێوەیەکی تری خواست دەربڕین، داوای جیابوونەوە بکات؟

هەر بۆ نموونە لە دەستووری سۆڤیاتی جاراندا، مادده (٧٩) ڕێگەی بە کۆمارە فیدرالییەکان درابوو کە پێڕەوی مافی چارەی خۆنووسین بکەن بە جیابوونەوەشەوە. ئەوەبوو لە ١٩٩٠دا کۆمارەکانی بەلتیك و دواتر ئەوانی تریش بەپێی ئەم مادده (٧٩)یەی دەستوور لە ڕێگەی ریفراندۆمەوە جیابوونەوە.

شایانی گوتنە ماددە ٣٩(١)ی دەستووری ئەتیوبیا، مافی جیابوونەوەی بە نەتەوەو گەلانی ناو ئەتیوبیا داوە. هەمان شت دەستووری باشووری ئەفریقیا بەپێی ماددە chxiv, section 235. (وەرگێر)

٧- لە ماددە (٤)ی قانوونی ئیدارەی دەوڵەتی عیراق بۆ قۆناخی گواستنەوە دان بە مافی حکوومەتایەتیکردن بەسەر خۆدا نراوە و لە ماددە ٥٣ (برگەی أ)دا دان بە حکوومەتی هەرێمی کوردستان نراوە. (وەرگێر).

٨- دەستەواژەی وا لە قانوونی ئیدارەی دەوڵەتی عیراقدا هاتووە بۆ نموونە لە ماددە (٥٢)دا. بەداخەوە "لیستی هاوپەیمانیی دیموکراتی" یش لە هەڵمەتی راگەیاندندا لەسەرو بەندی هەڵبژاردنی گشتیدا: بانگەشەی بۆ عیرقێکی فیدرالی دیموکراتی یەکگرتوو دەکرد. (وەرگێر).

٩- مەبەست لە نێوان ناوەندو هەرێمەکانە (وەرگێر)

١٠- بۆ نموونە لە شۆرشی ئەیلوولدا ، چەندین جار ئاگربەس لە نێوان شۆرش و حکوومەتی ناوەندیدا کراوە، ئەو ئاگربەسانە هەم بۆ شۆرش و خەڵکی کوردستان جۆرە بینوەبەرهاتنەوەو حەسانەوەو خۆکۆکردنەوەیەك بوون بۆ خولێکی تری تێکۆشان لە هەمانکاتدا بناخەیەك بوون بۆ وتوێژەکانی لەوە دواتر. (وەرگێر)

١١- لە ساڵی ١٩٧٤دا، حکوومەتی عیراق لە بەڵێنەکانی خۆی سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی دان بە گەلی کورد پەشیمان بۆوە و شەری هەڵگیرساندەوە. (وەرگێر).

١٢- لێرەدا گرنگی دەستوورێکی هەمیشەیی بۆ کورد لە عیراقدا دەردەکەوێ کە دەبێ بە (توافق) بنووسرێ و وەك دەڵێن دەستوورێکی (جامد) بێ و بە ئاسانی نەگۆرێ و دەسکاری نەکرێ و ماددەیەکی قانوونی وای تێدا بێ کە هەر دەسکاریکردنێکی دەستوور پێویستی بە ٣/٤ی دەنگی پەلەمانتاران بێ یان هەر دارشتنێکی تر کە ئەم مەبەستە بدا بەدەستەوە. (وەرگێر).

١٣- حکوومەتی ناوەندی و هەرێمی فیدرال و ئۆتۆنۆمدا (وەرگێر)

١٤- هەقە پەرلەمانی کوردستان، بە قانوون مافە کەمە نەتەوایەتییەکانی وەك تورکمان و کلدۆ- ئاشوور و ئەرمەن .. بپارێزێ و ئەمەش دەق رێکە لە گەڵ ماددە (١ ی برگە ١)ی "اعلان حقوق الاشخاص المنتمين الى اقليات قومية او اثنية والى اقليات دينية او لغوية" کە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٢دا پەسندی کردووە (وەرگێر).

## سەرچاوەکان:


De Villers, Bertus. Ed. 1994. Evaluating Federal Systems. Dordrecht: Martinus Nijhoff.
Ghai, Yash. 1998. "Decentralisation and the Accommodation of Ethnicity". In Crawford Young. Ed. Ethnicity and Public Policies. London: Macmillan.
Hannum, Hurst. Ed. 1993. Documents on Autonomy and Minority Rights. Dordrecht: Martinus Nijhoff.
Hannum, Hurst. 1996. Autonomy, Sovereignty, and Self-Determination: The Accommodation of Conflicting Rights. Philadephia, PA: University of Pennsylvania Press.
Lapidoth, Ruth. 1996. Autonomy: Flexible Solutions to Ethnic Conflicts. Washington, DC: United States Institute of Peace.


ئەم باسە لە بەشی چوارەمی کتێبی:

***Democracy and Deep-Rooted Conflict: Options for Negotiators***

وەرگیراوە.کۆمەڵێك نووسەر بەسەرپەرشتی پیتەر هایس و بین رێللی بەشداری نوسینیان کردووەو کوفی ئەنان پێشەکی بۆ نووسیوە. ئەم کتێبە لەسەر سایتی : www.idea.int

# ئاشتبوونەوە

دێڤد بلومفیڵد
و: لە ئینگلیزییەوە:
ئەیوب مەولودی

## پێشەکییەک

### ١-١ دیموکراسی و ئاشتبوونەوە

خاڵی دەست پێکردنمان لەم نامیلکەیەدا بڕوایەکە کە باشترین شێوازی حکومەتی دوای ململانێ حکومەتێکی دیموکراتیکە. ئەمە بەو ئەندازەیەی کە بنەمایەکی پراگماتیکیە، بنەمایەکی سەرەکی نیە. وینستۆن چێرچیل لە وتەیەکی بەناوبانگیدا دەڵێ: "دیموکراسی خراپترین شێوەی حکومەتە لە نێو ئەو هەموو شێوازانەی دیکە کە کات لە داوی کات تاقی کراونەتەوە." ئەمە لەوانەیە بێکەموکوڕی نەبێ, بەلاَم لە جیهانێکی پڕ لە کەموکوڕیدا ئەمە باشترین هەڵبژاردنە. لەو کاتەوە کە مافە جیهانییەکانی مرۆڤ بە شێوەیەکی فراوان وەکو بنەمای سەرەکی حکومەت پەسەند بکرێن,

دیموكراسی رۆژ لەدوای رۆژ بە شێوەیەكی ئاشكراتر دەبێتە كاریگەرترین رێگەی جێبەجێكردنی ئەم بنەمایانە _یەكسانی, نوێنەرایەتی كردن, بەشداری كردن, بەرپرسیاریەتی.

هەروەها بە شێوەیەكی دروست هەر دیموكراسییەك لە هەندێ بواردا بێوێنەیە بە پێی بارودۆخ و كەلتوورو بەهاكان, بەڵام هەر كامیان ئەم بنەمایانەیان لە ناخدا هەیە.

سەرباری ئەمەش دیموكراسی لەناو شێوەكانی حكومەتدا لە توانای چارەسەركردنی ململانێدا بێوێنەیە. ئەمەش ئەدگارێكی سەرەكییە لە بارودۆخی پاش توندوتیژیدا. دیموكراسی سیستەمێكە بۆ چارەسەری جیاوازییەكان بە بێ پەنابردنە بەر توندوتیژی. جیاوازی (لە بۆچوون, باوەڕ, ئایدیۆلۆژیا, كەلتوورو ...هتد) بەشێكی سروشتی هەر كۆمەڵگایەكن. و ململانێ لەم جۆرە جیاوازییانەوە سەرهەڵدەدا, یان جگە لە هەندێك گروپ كە لەناو كۆمەڵگادا جیاوازییان هەیە, دیموكراسی وەكو پرۆسەیەك كاردەكا كە لە رێگەیەوە جیاوازییەكان دەستنیشان دەكرێن, دەناسێنرێن و بە شێوەیەك هەڵسوكەوتیان لەگەڵدا دەكرێ كە رێگەی بوونیان پێدەردێ بەبێ ئەوەی كە هەڕەشە بن بۆسەر سیستەمە گشتییەكە. بە واتایەكی دیكە دیموكراسی سیستەمێكە بۆ چارەسەركردنی ململانێ. ئەم پرۆسەی چارەسەركردنی ململانێیە مشتومڕو وتووێژو ناڕەزایەتی و سازش لەخۆدەگرێ, هەمووی لە چوارچێوەی سیستەمێكدا كە رێگە بە بۆچوونە دژیەكەكان دەدا بەیەكەوەو بە شێوەیەكی دادوەرانە بەیەكەوە بژین بەبێ پەنابردنە بەر توندوتیژی. بێگومان دیموكراسی هەندێ جار سەركەوتوو نابێ, بەڵام راستییەكان لە هەموو لایەكی جیهانەوە پێشنیاری ئەوە دەكەن كە لە ئاڵتێرناتیڤەكانی سەركەوتووترە.

ئەمە وادەكات دیموكراسی سیستەمێكی گونجاو بێ, بەوە كە لە دوای شەڕی ساردەوە سروشتی ململانێی توندی گۆڕیوە. ئێستا سەختترین ململانێكان لە جیهاندا لەشێوەی ململانێی ناوخۆی دەوڵەتدا سەرهەڵدەدەن. بە واتایەكی دیكە ململانێكان لە كێشەی نێوخۆیی ناو وڵاتێكەوە _شەڕی ناوخۆ, سەركوتكردنی ناوخۆیی كەمینەكان,

راپەڕینەکان, پێشبڕکێ ئەتنی یان ئایینیەکان, ستەمکاری و...هتد_ دەست پێدەکەن نەك وەکو ئەو شێوازەی کە پێشتر باو بوو کە تیایدا ململانێکان بە زۆری لە نێوان دەوڵەتی جیاوازدا سەریان هەڵداوە. بە گشتی چارەسەری ململانێی نێوخۆیی دەوڵەتێك پێویستی بە سیستەمێکی نوێ یان ریفۆرمکراوی حکومەت نیە کە ئەو جیاوازییانەی ململانێکەی لێوە سەرهەڵداوە ریشەکێش کردبێ, بەڵکو ئەو سیستەمانەن کە لە رێگەی وتووێژەوە دارێژراون بۆ چارەسەری ئاشتییانەی ئەم جیاوازییانە. و ئەمڕۆ باوترین رێگە بۆ بنیاتنانی سیستەمێکی ئاوها, دامەزراندنیەتی لەسەر بنەمای رێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ لە شێوەی سیستەمێکی دیموکراتیکدا. کاتێك ئێمە لە رێگاچارەی "یان ئەمە یان ئەوە", "سەرکەوتن یان نشست" بۆ ململانێکان دوور دەکەوینەوە, دیموکراسی دەبێتە داهێنەری کرداریی رێگاچارەی "یارمەتیدەرانە"و "سەرکەوتنی دوولایەن".

کەواتە دیموکراسییەکی بە کردەوە لەسەر دوو بنەما بنیات دەنرێ: ریزە بەرنامەیەك بۆ چارەسەری ئاشتیانەی ئەو مەسەلانەی کە کۆمەڵگایەك دابەش دەکەن (پێکهاتەی سیاسی و کۆمەڵایەتی حکومەت) و کۆمەڵێك پەیوەندی کارکردن لەنێوان گروپەکاندا. ئەگەر پێکهاتەکان دادوەرانە نەبن, کۆمەڵگا ناتوانێ ئەو پەیوەندییانەی کارکردن گەشە پێبداو , بە پێچەوانەوە پێکهاتەکان بە شێوەیەکی رێکوپێك کارناکەن ئەگەر لایەنی کەمی هاوکاری لە نێوان ئەو لایەنانەدا نەبێ, هەرچەندە راست و دادوەرانەش بن.

ئەم تێگەیشتنە لە چەند ساڵی رابردوودا لە لایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە گونجێنراوە. بەم پێیە, بۆ نمونە نەتەوە یەکگرتووەکان بەوە باس لە دیموکراسی دەکات کە نەك هەر بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی رێکوپێك بێ بەڵکو گەشەپێدانی "کەلتووری دیموکراتیك" لەناو کۆمەڵگایەکدا بێ, بۆ ئەوەی نمونەکانی وتووێژی دیموکراتیك و چارەسەرکردنی ململانێ بە ناو هەموو چینەکانی کۆمەڵگای سیاسی و مەدەنیدا بڵاو ببنەوە. و خۆیان لە پەیوەندی دروستکەر لە نێوان پێکهێنەرە جیاوازەکان و گروپە بیروڕا جیاوازەکانی کۆمەڵگادا نیشان بدەن. ئێستاش مشتومڕێکی

زۆر هەیە لەسەر ئەوەی کە بە وردی کەلتووری دیموکراتیك واتای چیەو چۆن بەدەستدێ. بەڵام بە شێوەیەکی روون پێشنیاری پێویستی پەیوەندی یارمەتیدەرانە دەکا بۆ بنیاتنانی پێکهاتەی دیموکراسی.

دەرەنجامی هەموو ئەمە ئەوەیە کە پەیوەندییەکان خاوەن گرنگین. و ئەوە ئەو شوێنەیە کە ئاشتبوونەوەی لێوە دێتە ناوەوە. لەو کۆمەڵگایانەدا کە ئێستا بە کۆمەڵگای دوای شەڕ ناودەبرێن, نمونەکە بە گشتی ئەوەیە کە لایەنەکانی شەڕ وتووێژ بۆ چارەسەرێك دەکەن لە شێوەی سیستەمێکی نوێی حکومەت. زۆربەی هەرە زۆری کاتەکان ئەو سیستەمانە دیموکراتیکن. بۆیە دوژمنەکانی پێشوو _زۆربەی کات بە مێژوویەکی درێژی توندوتیژی لە نێوانیاندا_ خۆیان بەرەورووی مەسەلەی پێکهێنانی پێکهاتەی وتووێژلەسەرکراوی نوێ دەبنەوە بۆ بەڕێوەبردنی داهاتووی جیاوازییەکان بەلایەنی کەمەوە لەسەر بنەمای هاوکاری. یەکێك لە گەورەترین کۆسپەکانی سەر رێگای ئەو جۆرە هاوکارییانە ئەوەیە کە بەهۆی توندوتیژیی رابردووەوە پەیوەندییەکانیان لەسەر بنەمای دوژمنداری, بێ متمانەیی, رێزنەگرتن, و لەوانەشە, ئازارو رك و کینە دەبێ. زۆر زەحمەتە رێگەیەك بۆ گەشبینی هەبێ, هەرچەندە ئەو سیستەمە نوێیانە کاریگەرو بێ کەموکوڕیش بن.

لەبەر ئەوە پێویستییەکی زۆر هەیە بۆ باس کردن لەسەر ئەو پەیوەندییە نێگەتیڤانە. نەك ئەوەی دوژمنەکان وا لێبکەی یەکتریان خۆش بوێ, بە هەر رێگایەك, بەڵکو ببێتە لایەنی کەمی بناغەی متمانە بۆ ئەوەی رادەیەکی کەمی هاوکاری و پشت بەستنێکی دوولایەنە لە نێوانیان هەبێ. بۆ گەیشتن بەمە, ئەوان دەبێ لە پەیوەندییەکانی پێشووی خۆیان و رابردووی توندوتیژی خۆیان بکۆڵنەوەو ورد ببنەوە. ئاشتبوونەوە پرۆسەی ئەنجامدانی هەمان ئەو شتەیە.

لەکاتێکدا سازشی دیموکراتیك چارەسەر بۆ مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە ململانێکەوە دەدۆزێتەوە, کەواتە ئاشتبوونەوە باس لە پەیوەندییەکانی نێوان ئەوانە دەکا کە دەبێ لە داهاتوودا ئەم چارەسەرانە بدۆزنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا گرنکە ئەوە

دەربخەی کە ئەمە تەنیا بەسەر سیاسەتمەدارو بڕیاردەرەکاندا ناچەسپێ کە پەیوەندیان بە سازشەکەوە هەیە. ئەوە بەسەر هەموو دانیشتواندا دەچەسپێ. ئەو پەیوەندییەی دەبێ دابمەزرێ تەنیا ئەو پەیوەندییە نیە کە لەنێوان پەرلەمانتارو سەرکردەکاندا دەبێ، بەڵکو لە نێوان هەموو کۆمەڵگاکاندایە. ئەوە هەموو کۆمەڵگاکانن کە دەبێ خۆیان بگۆڕن لە پەیوەندییە دوژمنارییەکانی شەڕەوە بۆ پەیوەندی یارمەتیدەرانەی دامەزراو لەسەر بنەمای ڕێزگرتنی زیاتر. ئەم باشترین سیستەمە دیموکراتیکەی جیهان کە لە لایەن بەتواناترین دیموکراتەکانەوە بەرهەم هێنراوە نامێنێتەوە ئەگەر ئەو دانیشتووە گشتیانەی سیستەمەکەیان بەسەردا دەچەسپێنرێ بەلایەنی کەمەوە ئامادە نەبن بۆ ئەوەی متمانەیان بەو سیستەمەو بە یەکتری هەبێ و بە لایەنی کەمەوە ئەمە تاقی نەکەنەوە. بەشێکی زۆری ئەم پرۆسەیەی گەشەپێدانی کەلتووری دیموکراتیکە هاندانی پەیوەندییەکی پێویستە بۆ دیموکراسییەکی باش لە نێوان کۆمەڵگاکان، دراوسێکان، هەرێمەکان، تاکەکان و هەروەها.

کەواتە بە واتایەکی گرنگ، ئاشتبوونەوە بناغەی دیموکراسی بەهێز دەکا بە گەشەپێدانی پەیوەندییەکانی کارکردن کە پێویستن بۆ بنیاتنانێکی سەرکەوتوانەی دیموکراسی. بەهەمان شێوە، بێگومان دیموکراسی بنەمای ئاشتبوونەوە بەهێز دەکات: لە زۆر خاڵ لەم نامیلکەیەدا نووسەرەکان چەندین جار باس لەوە دەکەن ئاشتبوونەوە _چاککەرەوەی پەیوەندییەکان_ پێویستی بە پاڵپشتی دادوەری ئابووری، دابەشکردنی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەستەڵات و...هتد هەیە. دیموکراسی و ئاشتبوونەوە بەیەکەوە گرێ دراون، لەڕاستیدا پشت بەیەکتر دەبەستن.

هەمیسان دەگەڕێینەوە بۆ ئەو بۆچوونەی لە سەرەوە باسمان کرد: ئێمە گەشە بە دیموکراسی و ئاشتبوونەوە دەدەین بۆ مەبەستی کرداری. حاڵەتێکی ئەخلاقی هەیە بۆ ئەوەی هەست بەوە بکەین ئاشتبوونەوە ڕێگایەکی دروستە کە بیگرینەبەر. بەڵام مشتومڕێکی بەهێزی کرداری هەیە کە دەبێ ئەنجام بدرێ: پەیوەندی کارکردنی ئیجابی کەشوهەوایەك دروستدەکا کە تیایدا بەڕێوەبردن دەتوانێ گەشە بستێنێ، لە کاتێکا

پەیوەندی نێگەتیڤ کار دەکا بۆ تێکدانی تەنانەت باشترین سیستەمی حکومەت. ئاشتبوونەوە, هەرچەندە کە ئاسانیش نەبێ, کاریگەرترین رێگەیە بۆ هێنانەکایەوەی ئەو پەیوەندییانە. (لەڕاستیدا لێکۆڵینەوەی حاڵەتی کەمبۆدیا کە لە بەشی ٣دا هەیە, ئاگادارمان دەکاتەوە لەدژی هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی ئاشتبوونەوە تەنیا لە رێگای سیاسەتەکانەوە. مەسەلەکان و پەیوەندییەکان دوو بابەتی جیاواز بەڵام بەیەکەوە گرێدراون, و سیاسەت و ئاشتبوونەوە پرۆسەی جیاواز بەڵام پشتبەستوو بە یەکترن.) هەروەکو ئەم نامیلکەیە پێشانی دەدا هەموو ئەزمونی سەرتاسەری دنیا گرنگی ئەم خاڵەمان فێر دەکات. ئاشتبوونەوە خۆشییەك یان زیادکراوێك بۆ دیموکراسی نیە, ئاشتبوونەوە پێویستییەکی رەهایە.

## ١-٢ پرۆسەی ئاشتبوونەوە

### ١-٢-١ ئاشتبوونەوە چییە؟

ئاشتبوونەوە زاراوەیەکی ئاڵۆزەو رێککەوتنێکی کەم لەسەر پێناسەکەی هەیە.

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئاشتبوونەوە هەم ئەنجامێکە ـ شتێك کە بەدەست بهێنرێ ـ و هەم پرۆسەیەك ـ دەستئاوێژ و هۆکارێکە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە. بەشێکی زۆر لە مشتومڕەکە لە تێکەڵکردنی ئەم دوو بیرۆکەیەوە سەرهەڵدەدا. ئەم نامیلکەیە جەخت لەسەر پرۆسەکە دەکاتەوە. ئامانجی ئاشتبوونەوە ئارەزوویەکی داهاتوویەو بەشێکی گرنگە بۆ ئەوەی مەبەستت بێ, و تەنانەت دەکرێ حاڵەتێکی نمونەیی بێ کە ئاواتی بۆ بخوازی. بەڵام پرۆسەکە زیاتر شێوەیەکی ئێستاییە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ شتەکان بەو جۆرەی کە هەن _بنیاتنانی پرۆسەیەکی ئاشتبوونەوە هۆکاری هەوڵێکی کاریگەرو کردارییە بۆ هەنگاونان بەرەو ئامانجی کۆتایی_ و لەناو خۆیدا بێ بەهایە.

سەرچاوەی دووهەمی ئاڵۆزییەکە ئەوەیە کە پرۆسەی ئاشتبوونەوە لە زۆر بارودۆخدا روودەدا ـ بۆ نمونە لە نێوان ژن و مێرد, لە نێوان تاوانبارو قوربانی, لە نێوان ئەو هاوڕێیانەی شەڕیان کردووە یان لە نێوان ئەو نەتەوەو کۆمەڵگایانەدا کە شەڕیان لەگەڵ یەکتر کردووە. جەختی ئەم نامیلکەیە لەسەر ئاشتبوونەوەی دوای ململانێیەکی

سەختی بەردەوامە کە بۆ ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشابێ. بە شێوەیەکی نمونەیی، ئێمە لە خەیاڵماندا دەزانین بارودۆخی دوای ململانێ چییە: شەڕ کۆتایی هاتووە، ئارامییەك بەدەستهاتووەو رژێمێکی نوێ تێدەکۆشێ بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی نوێ لە خۆڵەمێشی کۆمەڵگا کۆنەکە. بەشێك لەم کاری بنیاتنانە دامەزراندنی پەیوەندییەکی باشترە لە نێوان ئەو باڵانەی پێشتر لە دژی یەکتر شەڕیان کردووە. ئەم نامیلکەیە لەم بارودۆخە دیاریکراوانە ورد دەبێتەوە، بە شێوەیەکی نمونەیی شوێنەواری شەڕی ناوخۆ یان کۆتایی رژێمێکی دڕندەی ستەمکار، چونکە ئەمانە ئەو بارودۆخانەن کە ئێستا لەملاولای جیهاندا هەن کە ئاشتبوونەوە تیایاندا یەکەمین پێویستییە. بەڵام ئێمە ئاواتەخوازین و بڕواشمان وایە ئەو ئامرازانەی لێرەدا دەخرێنە بەردەست لە بارودۆخی دیکەی جیاوازدا سوودمەند بن.

ئاشتبوونەوە پرۆسەیەکی فرەلایەنە کە گەڕان بەدوای هەقیقەت، دادوەری، بەخشندەیی، سارێژکردنەوەو ...هتد لەخۆ دەگرێ. لە سادەترین شێوەیدا، دۆزینەوەی رێگایەکە بۆ ژیان لەگەڵ دوژمنەکانی پێشووماندا، مەرج نیە خۆشمان بوێن، یان لێیان ببورین، یان بەهەر حاڵ رابردوو لەبیر بکەین، بەڵام لەگەڵیاندا بژین، هاوکاری پێویست بۆ شەریکایەتی کۆمەڵگاکەمان لەگەڵیاندا گەشە پێبدەین، بەو مەبەستە کە هەموو لایەکمان بەیەکەوە ژیانێکی باشترمان هەبێ لەوەی کە بەجیا هەمانبووە. سیاسەت پرۆسەیەکە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو مەسەلانەی لە رابردوودا ئێمەیان لێکجیا کردووەتەوە. ئاشتبوونەوە پرۆسەیەکی هاوتەرییە بۆ دووبارە نەخشەکێشانەوەی پەیوەندی نێوانمان. ئەمە بەرەنگاربوونەوەیەکی گەورەیە، و کەس نابێ وا بیر بکاتەوە کە کارێکی خێرایە یان ئاسانە. بەڵام کاریگەرییەکەی خەڵاتێکی گەورە لەخۆدەگرێ: ئاشتبوونەوەیەکی کاریگەر باشترین گەرەنتیە کە توندوتیژی ناگەڕێتەوە. ئەگەر ئێمە بتوانین پەیوەندییەکی نوێ لە نێوانماندا بنیات بنێین کە لەسەر بناغەی رێزگرتن و تێگەیشتنی راستەقینە لە پێویستی و ترس و ئارەزووەکانی یەکتر دامەزرابێ، ئەو

دابونەریت و نمونانەی هاوکاری کە دواتر گەشەی پێدەدەین باشترین پارێزەرن لە دژی گەڕانەوە بۆ جیابوونەوەی دژوار.

کەواتە ئێمە دەگەینە پێناسەی بنچینەییمان بۆ ئاشتبوونەوە: پرۆسەیەکە کە بەهۆیەوە کۆمەڵگایەك لە رابردوویەکی لەتبووەوە بۆ داهاتوویەکی هاوبەش دەگۆڕێ.

**١-٢-٢ پرۆسەکە**

ئێمە دەتوانین سێ تێڕوانینی سادە بەڵام قووڵمان هەبێ بۆ ئەم پرۆسەیە کە لە هەموو شتێك زیاتر پاڵپشتی ئەوە دەکات کە لە بەشەکانی داهاتووی ئەم نامیلکەیە دادێ.

- ئەمە تەنیا پرۆسەیەك نیە. بەداخەوە پرۆسەیەکی درێژخایەنە. چارەسەرێکی خێرا بۆ ئاشتبوونەوە نیە. ئەم پرۆسەیە کاتێکی زۆر دەخایەنێ و کاتی دیاریکراوی خۆشی دەوێ: هەنگاوەکانی ئەمریان لەسەر ناکرێ.
- ئەمە هەروەها پرۆسەیەکی قووڵە: رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ راستییەکی ناتەواو لەخۆ دەگرێ کە داوای گۆڕینی هەڵوێستەکانمان, ئارەزووەکانمان, هەست و سۆزەکانمان, و لەوانەیە, تەنانەت باوەڕەکانیشمان لێدەکا. ئەم گۆڕانە قووڵە بەرەنگارییەکی مەزن و زۆربەی کاتیش بەئازارە, و ناتوانرێ پەلەی تیا بکرێ یان بسەپێنرێ.
- هەروەکو لەم نامیلکەیەدا پێناسەکراوە ئاشتبوونەوە پرۆسەیەکی فراوانیشە. بەسەر هەموو کەسدا دەچسپێنرێ. ئەمە تەنیا پرۆسەیەك نیە بۆ ئەوانەی راستەوخۆ مەینەتیان چەشتووەو ئەوانەی مەینەتیەکەیان سەپاندووە, هەرچەندە ئەو خەڵکانە سەرەکی ترینیانن. ئەو هەڵوێست و باوەڕانەی کە پشتیوانیی لە ململانێی توند دەکەن بەشێوەیەکی زۆر گشتی تر لە رێگەی کۆمەڵگایەکەوە بڵاو دەبنەوەو دەبێ لەم پلانە فراوانەدا باسی لێوە بکرێ. کەواتە, لەکاتێکدا کە هۆکارێکی تاکەکەسی دژوار هەیە بۆ ئاشتبوونەوە هۆکارێکی کۆمەڵگاییش هەیە کە داوای خستنە ژێر پرسیاری ئەم هەڵوێست و پێش بڕیارو تێڕوانینە خراپانە دەکات کە هەموومان سەبارەت بە دوژمن

گەشەی پێدەدەین لە ماوەی ململانێدا. ئەمەش هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پێناسەی ئێمە بۆ دوژمن بە دەگمەن سنووردارە بۆ ژمارەیەکی کەم سیاسەتمەدار یان جەنگاوەرەوە، بەڵکو پەرە دەستێنێ بۆ گرتنەخۆی هەموو کۆمەڵگاکە بەگشتی (بۆ نمونە "فەلەستینییەکان" یان "پرۆتستانە ئیرلەندییەکان") یان رژێمێك و هەموو لایەنگرانی ("تالیبان"). تەنانەت ئەوانەی مەینەتیشیان کێشاوە یان لە رابردوو سوودمەند نەبوون باوەڕەکانی کۆمەڵگاو کەلتوورەکەیان مژیوە، و ئەم باوەڕانە دەتوانن بە شێوەیەکی کاریگەر رێگە لەبەردەم پرۆسەی ئاشتبوونەوە بگرن ئەگەر بەبێ گرنگیپێدان بمێننەوە. کەواتە ئاشتبوونەوە دەبێ پرۆسەیەکی فراوانی گشتگیر بێ.

ئەگەر ئاشتبوونەوە پرۆسەیەکی بەتەواوەتی فراوان بێ، ئەوا دەبێ بەرژەوەندی و ئەزموونی جیاواز لەخۆ بگرێ لە سەرتاسەری کۆمەڵگادا.

### رووە رەگەزییەکان (سەبارەت بە نێر و مێ)

روونترین و سەرەکی ترین نمونەی ئەم پێویستییە سەبارەت بە روانگەی رەگەزە. ئەمە پێویستی بە تێگەیشتنی ئەوە هەیە کە چۆن ململانێی توند گروپی کۆمەڵایەتی جیاواز دەگرێتەوەو کاری تێدکا لە دوای کاریگەریی نزیکەوە، وەکو ئەشکەنجەو ئاوارەیی. روویەکی رەگەزی هەندێ لەو "ململانێ بچووکانە" روون دەکاتەوە کە دەکەونە ژێر ململانێی سەرەکی و پێویستە گرنگیان پێ بدرێ بە مەبەستی دروستکردنی ئاشتییەکی جێگەی پشتگیری کردن و کۆمەڵگایەکی دیموکراتیك. بۆ نمونە ژنان تووشی دەستدرێژی سێکسی بوون لە شێوەی بەزۆری جووت بوونی بەکۆمەڵ لەگەڵیاندا، هاوسەرێتی بەزۆری و سۆزانی کردن، کە دەرەنجامی سووك کردن و کەم بایەخ کردنی لێ کەوتووەتەوە. بۆ ئەو ژنانە ئاشتبوونەوە ناساندنەوەی دەستدرێژییەکانی سەریان، داننان بە منداڵە نایاساییەکان وەکو منداڵی یاسایی بە هەموو مافەکانەوە، لە دیاریکردنی سەرچاوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دەرەنجامە فیزیکی و سایکۆلۆژییەکانی بەدواوەیە. بۆ بێوەژنانی شەڕ، ئاشتبوونەوە قەرەبووکردنەوەو هێنانەبەرباسی یاساکانی میرات و ئەو کردەوە مەوجودانەی لێدەکرێ کە مافی ئەوەیان

لێدەستێنێ و ڕێگەی ئەوەیان لێدەگرێ کە ئەرکی نوێی بەخێوکەری خێزانەکەیان بەجێ بگەیەنن.

رووی رەگەزی هەروەها وا پێویست دەکا سەیری ئەوەش بکرێ کە پیاوان چۆن دەکەونە ژێر کاریگەرییەوە. لە بارودۆخی ئاشتبوونەوەدا وادیارە پێویستە دان بەوەدا بنرێ کە ململانێی سەربازی هانی ناسنامەی جەنگاوەرێك دەدا لەگەڵ ئەوەدا کە لە هەمان کاتدا ئەرکی پیاو وەکو بەخێوکەرو پارێزەری خێزان لەناو دەبا. ئەو بێ ئومێدی و تورەییەی کە لەوانەیە لە ئەنجامی ئەوەوە سەرهەڵبدا دەتوانێ هەرەشەیەکی مەترسیدار بێ بۆ سەر پرۆسەی ئاشتبوونەوە. دامەزراندنی پەیوەندییەك لەسەر بنچینەی متمانەو ڕێزگرتن لەنێوان پیاوان و ژنان, و لەنێوان ئەو گروپە لە پیاوان کە بە شێوەیەکی تایبەتی ئامانج بوون, شتێکی بنچینەییە بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی دیموکراتیك. ئەم جۆرە پەیوەندییانە پێویستییان بە دانپیانانی تەواو هەیە بەوە کە چۆن ململانێیەکی دیاریکراو کاری کردووەتە سەر پیاوان و ژنان بە شێوازی جۆراوجۆر.

رەگەز لایەنێکی سەرەکی ئاشتبوونەوەیە لە ئاستی حکومی و دامەزراوەییدا. زۆربەی ئەزموونەکان نیشاندەری ئەوەن کە ژنان ( و هەروەها زۆربەی کات ئەو گروپانەش کە بە شێوەیەکی سیاسی وەلانراون و بچوککراونەتەوە) دەرفەتی کەمیان هەیە بۆ پرۆسەکانی گفتوگۆی ئاشتی و نوێنەرایەتی کەمیان هەیە لە حکومەت و لایەنە بڕیاردەرەکانی دیکەدا, و یان هەر نیانە. ئەم نەبوونی بەشدارییە لە پرۆسە سیاسیەکاندا بە شێوەیەکی فراوان ئەگەری ئەوە کەم دەکاتەوە کە ئارەزوو و بیروڕاکانی خۆیان دەرببڕن و ئەوە دڵنیا بکەنەوە کە ئەمانە لە بارودۆخێکی دژواردا دەناسرێن, و دووبارە لەوانەیە ئەمە ببێتە هۆی دوورکەوتنەوەیەکی دیاریکراو لە نەتەوەو وڵاتەکە.

### ١-٢-٣ هەقیقەت, دادوەری و ئاشتبوونەوە

ئەم نامیلکەیە پێشنیاری ڕوویەکی فراوانتری ئاشتبوونەوە دەکا لەوەی هەمیشە بەکارهێنراوە. بۆ نمونە لە ژمارەیەکی زۆر بارودۆخی دوای شەڕدا, خەڵك باس لە

"هەقیقەت و ئاشتبوونەوە" دەكا و زۆربەی كات لیژنەی بەدواداچوون و لێكۆڵینەوە پێكدێنێ بە هەمان ناو. گەڕان بەدوای وردیی لەبارەی رابردوو هەنگاوێكی جەوهەرییە لە پرۆسەی ئاشتبوونەوەدا بە پێی پێناسە فراوانەكەی ئێمە, وەكو ئەوەی كە رێگەدانە بە قوربانییەكان كە بەسەرهاتەكانیان بگێڕنەوە. بەلاَم "هەقیقەت" خۆی لەخۆیدا ئاشتبوونەوە ناهێنێت. گەڕان بەدوای هەقیقەتدا یەكێك لە پێكهێنەرە سەرەكییەكانە لە ئاشتبوونەوەدا, بەلاَم تەنیا یەك پێكهێنەرە. بە هەمان شێوە دادوەری پێویستییەكی جەوهەرییە بۆ سارێژكردنی برینەكان, بەرپرسیاركردنی تاوانباران و دووبارە بنیاتنانەوەی پەیوەندیەكانی یەكسانی و رێزگرتن. بەلاَم دادوەری بە تەنیا ئاشتبوونەوە ناهێنێ. لە ئاشتبوونەوەدا هەقیقەت و دادوەری لێكجیا نین, ئەوان بەشی سەرەكی ئەون.

**خشتەی ١-١: پرۆسەی ئاشتبوونەوە**

| پرۆسەی ئاشتبوونەوە بریتی نیە لە: | پرۆسەی ئاشتبوونەوە بریتییە لە: |
|---|---|
| بیانوویەك بۆ دەربازبوون لە سزادان | دۆزینەوەی رێگایەك بۆ ژیان كە رێگە بە بینینی داهاتوو دەدا |
| تەنیا پرۆسەیەكی تاكەكەسی | بنیاتنانەوەی پەیوەندییەكان |
| بە دژی/ئاڵتێرناتیڤێك بۆ هەقیقەت یان داداوەری | موجاراتی كارو دوژمنەكانی رابردوو |
| وەلامێكی خێرا | پرۆسەیەكی درێژخایەنی گۆڕانكاریی قووڵ بە پانتایی كۆمەڵگا |
| بیرۆكەیەكی ئایینی | پرۆسەیەكی ناساندن, وەبیرهاتنەوە, و دەرس وەرگرتن لە رابردووەوە |
| ئاشتییەكی بێ كەموكوڕی | دڵخوازەو ناتوانرێ بسەپێنرێ. |
| بیانوویەك بۆ لەبیر كردن یان | |
| تەنیا مەسەلەی بەخشین. | |

خەڵکێکی زۆرو بەتایبەتی قوربانییانی ئازاردانێکی زۆر, گومانیان لە ئاشتبوونەوە هەیەو وەکو بیانوویەك بۆ بچوککردنەوەو پشتگوێخستنی مەینەتییەکانیان سەیری دەکەن. ئاشتبوونەوە لەڕاستیدا دەتوانرێ بەم شێوەیە خراپ بەکار بهێنرێ. بەڵام ئەمە لە ئەنجامی ئەوەیە کە ئاشتبوونەوە تانیا وەکو ئامانجێك سەیر بکرێ نەك وەکو پرۆسەیەك . ئەو خەڵکانە زۆربەی کات گومان دەکەن کە هەنگاونانێکی خێرا بەروە دەوڵەتێك کە تیایدا هەموو کەس واپێدەچێ لەگەڵ رابردوو و لەگەڵ یەکتر ئاشت بووبێتەوە رێگەیەکە بۆ کورت بڕی پرۆسە هەقیقیەکانی دادوەری, راستگۆیی و سزادان _بە واتایەکی دیکە ئەوان دەبێ "ببوورن و لەبیر بکەن". ئەمە ئامانجی ئەم نامیلکەیە نیە. **ئەم حاڵەتی ئاشتبوونەوەیە ئامانجێکی درێژخایەنە, کە تەنیا دوای ئەوە بەدەستدێ کە هەموو پێکهێنەرە گرنگەکانی دادوەری و راستگۆیی و سارێژبوونەەو ...هتد مامەڵەیان لەگەڵدا کرابێ. و ئەم پرۆسە گشتگیرە کە هەموو ئەمانەو مەسەلەکانی دیکەی تێدا کۆدەبێتەوە پرۆسەی ئاشتبوونەوەیە.**

بەشی هەرە زۆری ئەوەی لە لاپەڕەکانی دواتردا دێ دەربارەی لێکۆڵینەوەی پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی نێوان ئەم مەسەلانەیە بەو شێوەیەی کە پرۆسەکە پێکدێنن.

## ١-٣ پێویستی ئاشتبوونەوە

پرۆسەیەکی ئاشتبوونەوە بەهیچ شێوەیەك سادە نیە. بەتایبەتی لە پاشماوەیەکی نزیکی ئارامبوونەوەی ململانێیەکی توند لە رێگای گفتوگۆوە, لەوانەیە وا دەربکەوێ کە رێگرێك بێ بۆ پێشینەی زۆر گرنگتر, لەگەڵ گوشارە سیاسیە بەپەلەکان بۆ دامەزراندنی ئەو پێکهاتە دیموکراتیك و پێکهاتەی سەرچاوەو ئەو پێکهاتانەی کە رێککەوتن هەیە لەسەریان. لەڕاستیدا ئەمە زۆر هاندەرە بە تایبەتی بۆ سیاسەتمەدارەکان, بۆ گرنگیدان و وردبوونەوە لەسەر پرۆسەی سیاسی. لەڕاستیدا, لەوانەیە ئەوان بە دروستی ئەوە نەبینن کە چۆن ئاشتبوونەوە لە کۆی کارەکانی بەردەستیاندا بگونجێنن. بەم پێیە دەکرێ ئاشتبوونەوە دوابخرێ تاوەکو پێشینەکانی دیکە تەواو دەبن, یان دەکرێ کەم

بکرێتەوە بۆ لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە کە دان بە رابردووە بەئازارەکەدا بنێ و بە خێرایی بەسەریدا تێپەڕێ. هەموو کەس دەیەوێ سەرکەوێ, بەخێرایی هەنگاو بنێ و بە زووترین خێرایی شیاو لە رابردوو دوور کەوێتەوە.

لەوانەیە وادیاربێ کە هێواش کردنەوەی شتەکان و مانەوە لەسەر رابردووی بەئازارو بیرو هەستەکانی سەبارەت بە رابردووە دژوارەکە هەڕەشە بێ بۆ سەر پێکهاتە سیاسی و کۆمەڵایەتییە نوێیەکان. مشتومڕەکە شتێکی لەو جۆرە لەخۆ دەگرێ: " ئێمە دەبێ چ چاوەڕوانییەکمان لە سیاسەتمەدارەکانمان هەبێ بۆ دامەزراندنی نەخشەکانی هاوکاری داهاتوو لە حکومەتدا ئەگەر بێتوو ئێمە کاتی خۆمان بۆ لێکۆڵینەوەو گەڕانی ئاشکرا بەدوای هەمان ئەو شتانەدا کە لە رابردوودا لە یەکتریان جیا کردووینەتەوە بەکار بهێنین؟ بێگومان ئەمە تەنیا ئەو هاوکارییە ناسکە تێکدەشکێنێ کە هەوڵی بۆ دەدەین, ئەمەش بە خۆبەستنەوە بە رابردووەوە لەبری ئەوەی چاومان لەداهاتووبێ. واباشتر نەدەبوو ئەگەر لەم کاتەدا جەخت لەسەر وێکچوونەکانمان بکەینەوەو جیاوازییەکانمان جێ بێڵین بۆ کاتێکی کەمتر هەستیاری داهاتوو؟"

ئەمە جێگای تێگەیشتنە, بەڵام لە هەمان کاتدا کەمکەرەوەی بەرهەمە. کاردانەوەیەکی ئاوهای رابردوو چەندە بەئازارە ئەوەندەش پێویستە, چونکە کۆمەڵگایەکی لەتبوو تەنیا لەسەر رابردووە لەتبووەکەی دەتوانێ داهاتوویەکی هاوبەش بنیات بنێ. مەحاڵە رابردوو لەیاد بکەیت و داهاتوویەکی تەواو نوێ دەست پێبکەیت وەکو ئەوەی هیچ شتێك رووی نەدابێ. لەڕاستیدا, هاندەر بۆ بنیاتنانی داهاتوویەك دروست ئەوەیە کە ئەوە دڵنیا بکەیتەوە کە رابردوو ناگەڕێتەوە و کەواتە تێگەیشتنێکی تەواوو قبوڵکردنی رابردوو هەمان باشترین رێگایە بۆ دڵنیاکردنەوەی ئەوە کە ناگەڕێتەوەو یەخەی کۆمەڵگا ناکرێتەوە. پێویستە باس لە رابردوو بکرێ بۆ گەیشتن بە داهاتوو. ئاشتبوونەوە, ئەگەر بە شێوەیەکی تەواوو واتادار نەخشەکێشی بۆ بکرێ, هۆکاری ئەنجامدانی ئەوەیە. بە درێژایی ئەم نامیلکەیە کەرەسەی پێویست بۆ

لێکۆڵینەوەی رابردوو خراوەتە بەردەست, کە بەکارهێنانیان ئێستایەکی یارمەتیدەرانەتر دروست دەکا بە مەبەستی دەستپێکردنی داهاتوویەکی ئەمن تری بەیەکەوە ژیان.

لەسەر ئاستی سیاسیدا سەرنەکەوتن بۆ باسکردن لە رابردوو لە رێگەی پرۆسەیەکی ئاشتبوونەوەوە _لەوانەیە هەڵبژاردنی ئاسانتری لێپەیدابێ_ تا رادەیەکی زۆر گەرەنتی سەرنەکەوتنی داهاتوو دەکا. سیاسەتمەدارەکان لە رێگەی وتووێژکردن لەسەر مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە ململانێکەوە دەگەنە رێککەوتنێك. ئەوان سازش و دانوستاندن و رێگەی کرداری دەدۆزنەوە بۆ هاوکاری کردن لە سنووری بەرژەوەندیەکانی خۆیاندا. ئەوە پیشەی ئەوانەو بەشێکی سەرەکی گواستنەوەی بارودۆخی ململانێیەکی پێشوویە بۆ بارودۆخی ئاشتییەکی داهاتوو, بەڵام هەوڵەکانیان بە تەواوەتی دەکەونە ژێر مەترسییەوە ئەگەر باس لە پەیوەنییە تێکشکاوەکەی نێوان ئەو کۆمەڵگایانەش نەکەن کە ئەوان نوێنەرایەتی دەکەن, و هەروەها ئەو مەسەلانەش کە ئەو پەیوەندییەیان تێکشکاندووە. باشترین سیستەمی دیموکراتیکی دنیاش ناتوانێ بمێنێتەوە ئەگەر چەند بەشێکی دانیشتوانەکەیان پەیوەندی یارمەتیدەرانەی بێ فیزانەیان نەبێ کە بنەمای رێککەوتنەکەیانی لەسەر دامەزراوە بۆ کارکردن لەگەڵ سیستەمە نوێیەکان.

ئەمە هۆی سەرەکی کرداری ئەوەیە کە بۆچی هەموو دیموکراسییەکی نوێی دوای ململانێ پێویستی بە ئاشتبوونەوە هەیە. هەرچەندە ئاشتبوونەوە, لە چاوخشاندنی یەکەمدا, لەوانەیە وادیاربێ کە کۆسپێك بێ لەسەر رێگای دیموکراسییەکی کارا, بەڵام لەڕاستیدا پێویستییەکی سەرەکی بۆ مانەوەی درێژخایەنی ئەم دیموکراسییەیە. ئەمە وەڵامی ئاسان نیە, بەڵکو هەقیقیتەکەیە. ئاشتبوونەوەی واتادار پرۆسەیەکی دژوارو بەئازارو ئاڵۆزە, بەڵام دەبێ بەدەست بهێنرێ, چونکە پشتگوێ خستنی تۆوی نشستی گەورەتری داهاتوو دەچێنێ. لەلایەکی دیکەوە, پێکهاتنەوەی رەگەزە لەتبووەکانی کۆمەڵگایەك, لە ماوەیەکدا, رێگە بە گەشەسەندنی شێوازی یارمەتیدەرانەی هەقیقی

کارکردن و تێڕوانینی داهاتوو دەدا, کە دەبێتە یەکێك لە بەهێزترین گەرەنتییەکانی دیموکراتیزەکردنێکی سەرکەوتوو.

**١-٤ وەڵامی ئاسان نیە**

ئاشتبوونەوە هەرگیز مەسەلەیەکی تیۆری نیەو بەڵام هەمیشە لە بارودۆخێکی دیایکراودا روودەدا.

کەواتە رێگایەکی سادە بۆ سەرکەوتن نیە کە لێرەدا پێناسە بکرێ و بتوانرێ دواتر لە هەموو جیهاندا پەیڕەو بکرێ. یەك تەنیا رێگای تاکی دروست نیە بۆ داهێنانی پرۆسەیەکی لەم جۆرە. ئاشتبوونەوە کێشەیەك نیە کە تەنیا یەك چارەسەری هەبێ. هەرەکو چۆن هەموو ململانێیەك جیاوازە, و هەموو چارەسەرێکی دیموکراتیك (بەڕاستی, هەموو چارەسەرێکی دیموکراتیك) جیاوازە, بە هەمان شێوە پرۆسەیەکی ئاشتبوونەوە لە هەموو ئەوانی دیکە جیاواز دەبێ لە چەند روویەکی گرنگ, تەنانەت لەگەڵ ئەوەشدا کە وێکچوونی زۆریشی دەبێ لەگەڵیاندا. لەبەر ئەوەیە کە ئەم نامیلکەیە یەك چارەسەر بۆ هەموو حاڵەتەکان ناسەپێنێ. تەنیا شتێك بەسەر هەموو حاڵەتەکانی دوای توندوتیژیدا دەچەسپێ پێویستی بانگەوازکردنە بۆ مەسەلەی ئاشتبوونەوە.

لە دوای ئەوە, گرنگە کە بە گونجاوی و داهێنەری بمێنیتەوە سەبارەت بە نەخشەکێشانی پرۆسەیەکی دیاریکراو بۆ گەیشتن بە ئاشتبوونەوە لە بارودۆخێکی دیاریکراودا. دوای ئەزموونی پرۆسەی ئاشتی ئەفریقای باشوور, بە رادەیەکی زۆر گەشەپێدانی ئەم نمونەیەو بنیاتنانی هەقیقەت و لیژنەیەکی ئاشتبوونەوە وەکو بەشێکی چارەسەرکردن بووەتە کارێکی ئۆتۆماتیکی. ئاشکرایە کە لەگەڵ هەموو کەموکوڕی و سنووردارییەکانی, لیژنەی هەقیقەت و ئاشتبوونەوەی ئەفریقای باشوور (TRC) رۆڵێکی سەرەکی و بەرزی گێڕا بە جێگیرکردنی شێوازی نوێ و ئاشتیانەی ئاوێتەبوون لەو کۆمەڵگایەدا کە پێشتر بە قووڵی لەت ببوون. ئەمە دەتوانرێ زۆر دەرسی لێوەربگیرێ. بەڵام یەك دەرس کە ناتوانرێ پێشبینی بکرێ, پێویستی رەهایە بە (TRC)یەك لە

هەموو بارودۆخەکاندا. (بۆ نمونە ئیرلەندی باکوور بەردەوامە لەسەر ڕێگای بەردەلانی چەسپاندن و جێگیرکردنی پێکهاتە نوێیەکانی چارەسەر بە بێ لیژنەیەکی لەم جۆرە. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا چارەسەرەکەی بە تەرخان کردنی وەزیرێکی قوربانیان بوو بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو بابەتانەی توندوتیژیی رابردوو, بە شێوەیەك کە لەگەڵ بارودۆخ و کەلتووری ئیرلەندی باکور بگونجێ.)

## سەرچاوەکان

مەسەلەی سەرچاوەکان, ئابووری و مرۆیی, رەگەزێکی دیکەیە کە تیایدا هیچ وەلامێکی ئاسان نیە. کارێکی بێ سوود دەبێ ئەگەر بتەوێ پرۆسەی ئاشتبوونەوەی نمونەیی مۆدێرن بسەپێنی کە پێویستی بە سەرچاوەی زەبەلاحی ئابووری هەبێ, بەهۆی ئەوەی کە هەقیقەتی تاڵ ئەوەیە کە زۆربەی کۆمەڵگاکانی دوای ململانێ هەمان ئەو کۆمەڵگایانەن کە کەمترین سەرچاوەی یەدەکیان هەیە. بەم حاڵەش پرۆسەیەکی ئاشتبوونەوە هەڵبژاردنێکی هەرزان نیە. کەواتە, سەرچاوە چۆن پەیدا دەبێ؟

مەحاڵە ئەمە بە شێوەیەکی گشتی وەلام بدرێتەوە, بەلام هەڵبژاردنی جۆراوجۆر تێبینی کراون لە بارودۆخی جیاجیادا.

پلانەکانی قەرەبوکردنەوە, بەتایبەتی, زۆر گرنبەهان. دوابەدوای داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە لە ساڵی ١٩٩٠-١٩٩١, لیژنەی قەرەبووکردنەوەی نەتەوەیەکگرتووەکان (UNCC) سیستەمێکی دانا بۆ قەرەبووی زیانەکانی قوربانییەکانی داگیرکردنەکە لەو پارەیەی کە لە باجی سەر ناردنەدەرەوەی نەوتی عێراق بەدەستدەهات. لە ئەفریقای باشوور ئەگەری باج دانان لەسەر داهاتی ئەوانەی ناڕاستەوخۆ لە سیستەمی ئاپارتاید سوودمەند ببوون پێشنیارکرا, بەلام هەرگیز جێبەجێ نەکرا. لە رواندا بودجەیەکی گشتی کۆکرایەوە کە قەرەبووی زیانەکانی لێهەڵدەگیرێ لە کاتێکی داهاتوودا. (بێگومان بەرەنگارییەکە ئێستاش بۆ رواندا ماوە بۆ

قایل کردنی بەخشەری نێودەوڵەتی دیکە بۆ ئەوەی کە بەڕاستی پارە بخەنە سەر بودجەکە.) .

بە شێوەیەکی ڕێژەیی هەندێك ڕووی ئاشتبوونەوە ئەوەندە گرانبەها نین. حاڵەتەکەی ئێرلەندی باکوور ئەوە نیشان دەدا کە زۆربەی چالاکییەکانی ئاشتبوونەوە لەسەرووی هەموو شتێکەوە پشت بە یەك سەرچاوە دەبەستن, کە زۆربەی کات بەش دەکات, کە ژمارەیەکی بەرچاو لە خەڵکی ئاسایی خۆیان ئامادەکردووە بۆ بەخشینی بەهایەکی کەسی, نەك ئابووری, بۆ گەیشتن بە پێشکەوتن. لەڕاستیدا زۆربەی کاری ئاشتبوونەوە لەبارەی ئاوێتەبوونیّ مرۆیی بە ڕاددەیەکی کەمە. شێوە هێماییەکانی پۆزش و قەرەبووکردنەوەو گەڕاندنەوەی سامانی خەڵك _بۆنە گشتییەکان, خەڵاتەکان, بیرەوەری و ...هتد_ دەتوانن کاریگەرو هەرزان بن (هەرچەندە بێگومان قایلکەر نین). قەرەبووکردنەوەکان لە شێوەی دەست ڕاگەیشتن بە خزمەتگوزارییەکانیش _بۆ نمونە پەروەردەو فێرکردن یان یارمەتی پزیشکی لەسەر بنەمای خۆڕایی یان یارمەتی ماددی_ هەروەها لە نرخی ڕاستەقینە کەم دەکەنەوە بە بیّ کەمکردنەوەی بەهاکەی.

هەندێك کۆمەڵگای دوای ململانیّ لەناو کەلتوورو دابونەریتەکانی خۆیاندا بەدوای ئەو میکانیزمە هەنووکەییانەدا دەگەڕێن کە لە ناوخۆیاندا گەشەیان سەندووە بۆ ئاشتبوونەوەو دادوەری. ئەو ڕاستییە کە ئەمانە هەمیشە هەرزانترن لە مۆدیلە ئەورووپییە زەبەلاحەکان, هۆیەکە بۆ هاندانی ئەم گەشەسەندنە. (هۆیەکی دیکە ئەوەیە, لەبەر ئەوەی ئەو میکانیزمانە لەسەر بنەمای بەهاو پەیوەندییە هەنووکەییەکان بنیاتنراون ئەگەری زیاتر هەیە کە پشتگیری فراوان ببەنەوە. بەڵام ئەمە بەو واتایە نیە کە ئەو جۆرە کەرەسانەی "دادوەری هەرێمی" بە شێوەیەکی هەمەلایەنەو دادپەروەرانە کاردەکەن, بەتایبەتی سەبارەت بە ژنان و بەرژەوەندی و ئەزموون و مافەکانیان.)

لەکاتێکدا کە لەوانەیە ئەگەر بڵێین کۆمەڵگای نێودەوڵەتی سەرچاوەی شاراوەی ئابووری و کارامەییە, شتێکی هیچ و بێواتابیّ, ڕاستییەکی ڕوو لە زیادبوونی تێدا هەیە. بە شێوەیەکی ڕوو لە زیادبوون بەخشەری دوولایەن و فرەلایەن, هەروەها ئەکتەرە

فرەلایەن و هەرێمییەکان, دەست دەکەن بە دەرککردن بە گرنگیی ئاشتبوونەوە وەکو هۆکارێکی پێشگیریکردن لە ململانێ, گەشەسەندنی مرۆڤ, ئاسایشی مرۆڤ, لەناوبردنی هەژاری و بنیاتنانی ئاشتی, بۆ نمونە هەروەکو لە راگەیاندنەکانی ئەم دواییانەی رێکخراوی گەشەپێدان و هاوکاری ئابووری (OECD) کۆمیتەی هاوکاری گەشەپێدان (DAC), یان لەو بڵاوکراوانەدا کە لەلایەن ژمارەیەك ئاژانسی هاوکاری گەشەپێدانەوە لە رۆژئاوا چاپکراون دەرکەوتووە. ئەم جۆرە بەخشەرانە لە رابردوو ئامادەترن بۆ ئەوەی ئاشتبوونەوە وا ببینن کە باشتر بگونجێ لەگەڵ مەرجەکانی ئەوان بۆ یارمەتیدان.

لە سەرووی هەموویانەوە, نەبوونی سەرچاوەکان نابێ بکرێتە بیانوویەك بۆ دەست پێنەکردنی پرۆسەی ئاشتبوونەوەکە. هەندێك رەگەز پارەیەکی کەمیان تێدەچێ: هەندێك رەگەز بەخشەر بۆلای خۆیان رادەکێشن. گوشارە ئابوورییەکان دەتوانن کار لە نەخشەی پرۆسەکە بکەن, و هەمیشە کاری لێدەکەن, بەڵام تەنانەت ئابووریش هۆکارێکی باش و بەگوێرەی پێویست نیە بۆ بە تەواوەتی رێگەگرتن لە پێویستی ئاشتبوونەوەیەکی کاریگەر.

هەموو هەوڵێك بۆ ئەوەبووە کە هەموو جەخت کردنەوەیەکی ناو ئەم نامیلکەیە بە نمونەی بەرجەستە لە جیهانی هەقیقی روون بکرێتەوە. ئەمە کارێکی ئاسان نەبووە, هەمیشە شیاویش نەبووە. ئاشتبوونەوە وەکو بیرۆکەیەك ئێستاش تاڕاددەیەك رەگەزێکی نوێیە لە بەرقەرارکردنی ئاشتیدا, و هەندێك لە ئایدیاکانی ئێستاش تاقی نەکراونەتەوەو باسیان لێوە نەکراوە" ئەوانی دیکە تەنیا یەك دوو جار لە بارودۆخی هەقیقیدا بەکارهێنراون. لە ئەنجامدا هەندێك جار پێویست بووە بگەڕێینەوە سەر باس کردنی هەنێك شتی گشتی بەبێ نمونەیەکی دیاریکراو. سەرەڕای ئەمەش ئەو گشتاندانەی لێرەدا ئەنجام دراون لەسەر بنەمای ئەو بۆچوونانە دامەزراون کە لە لێکۆڵینەوەیەکی وردی ژمارەیەکی زۆر دەستپێشخەری ئاشتبوونەوە, هەوڵی بەرقەرارکردنی ئاشتی و ستراتیژییەکانی چارەسەری ململانێوە کۆکراونەتەوە.

ئەوەی وادیارە لە هەمووشت گرنگترە ئەوەیە کە هیچ کەس مۆدێلێك یان شێوەیەکی تەواوو بێکەموکوڕی ئاشتبوونەوەی دروست نەکردووە _لەڕاستیدا, بێگومان شتێکی وا کە بەسەر هەموو جیهاندا جێبەجێ بکرێ نیە_ و کەواتە ئەوانەی رووبەڕووی بەرقەرارکردنی ئاشتی لەدوای ململانێ دەبنەوە دەبێ باوەڕ بە توانای خۆیان بکەن بۆ وەرگرتنی هەر ئامۆژگارییەك کە بتوانرێ لە شوێنێکی دیکەوە بەدەست بهێنرێ, بەڵام دەبێ داهێنەر بن لە گەشەپێدانی پرۆسە رەسەنەکەی خۆیان.

# بەرەو فەلسەفەی لێبوردەیی

رامین جەهانبەگلو
وەرگێڕانی لەفارسییەوە:
موراد حەکیم

لێبوردن لە فەلسەفەی مۆدێرندا چەمکێکی گرنگە, هەروەها بەزۆری کارکردن پێی لە بەشە بونیادنەکانی کۆمەڵگا لیبراڵ و پلۆرالیستەکان لە قەڵەم دەدرێت. کەواتە لە جیهانی ئێمەدا لێبوردن بۆتە مەسەلەیەکی گرنگ, بەلام لەنێو کولتوورەکانی ئەمڕۆدا هیچ رێکەوتنێك لەسەر بیروڕایەکی گشتی و سەرتاپاگیر لەمەڕ شێوەو ناوەڕۆکی لێبووردنەوە نییە، هەروەها لە کولتووورە جیاوازەکاندا بیروڕاگەلێکی جیاواز و مشتومڕی ئایدیۆلۆژی لەمەڕ مانا, بنەماکان و سنووری لێبوردن لە ئارادایە, خوشبەختانە فەیلەسوفە سیاسیەکان بە گێڕانی رۆڵێکی گرنگ لە بیرکردنەوە لە چەمکی لێبوردن لەم ٣٠٠ ساڵەی دواییدا هەوڵیانداوە ئەم مشتومڕانە یەکلایی بکەنەوە, ئەم کارە نەك تەنیا بووە هۆی رەتکردنەوەی تیۆرە درۆیینەکان, بەڵکو بەهۆیانەوە بیروڕاکانی ئێمەش لەبارەی لێبوردنەوە روونتر و ئاشکراتریان لێهات, فەلسەفەی سیاسی توانای ئەوەی پێبەخشیوین تاکو پەی بەم بابەتە ببەین,

کە پێویستی بڕیار وەرگرتنە سیاسییەکان بوونی تێگەیشتنێکی روون و رەوانە لە چییەتی لێبوردن و ئەوەی بەچ شێوەیەك دەتوانین کاری پێبکەین, سەرەڕای ئەوە پێویستە تێبگەین لەبەر ئەوەی سیاسەت هونەری رێکخستنی کۆمەڵگایە کەواتە بەبێ چەمکی تەوەری لێبوردن هیچ بوارێکی گشتی دیموکراتی راستی نابێت.

ئەم چەمکە تەوەرییەی لێبوردن دەکرێ بڵێین لە دوو بەشی سەرەکی پێکدێت.

بەشی یەکەم ئامادەیی رەتکردنەوەی دەستێوەردانی زۆردارانەیە لەو هەڵبژاردن و کارو بارانەدا کە ئێمە بەڕاستیان نازانین. دووەمین چەمك بنەمای ئەم دەستێوەرنەدانەیە, هۆکارگەلێکی زێدە بۆ دەستێوەردان هەن (لەوانەش ترسنۆکی) کە جیاوازییەکی بنەڕەتیان لەگەڵ جەوهەری ئەخلاقی لێبوردن وەك رێزگرتن لەتاکەکانی دیکە هەیە. رێزگرتن لەوانی دیکە شێوازێکە بۆ لەبەرچاوگرتنی ئەوان وەك بکەرە ئەخلاقییە سەربەخۆ و ئاقڵمەندەکان. لەڕاستیدا, رێزگرتن لەوانی دیکە لێبوردن وەك مافێکی ئەخلاقی دەخاتەڕوو کە پێویستە بە هەموو کەسێك ببەخشرێت لەبەر تاکەکەس بوونیان. لێبوردن ئەوە بەڕەسمی دەزانێت کە تاکەکەسە جیاوازەکان تێگەیشتنگەلێکی جیاوازیان لە ژیانی باش هەیە و خوازیاری ئەوەن تێگەیشتنە تایبەتییەکەیان لەڕووی سیاسی و ئەخلاقییەوە بە نرخ و بەڕێز لەقەڵەم بدرێت. کاری رێزگرتن لەوانی دیکە یارمەتیمان دەدات لە بیرکردنەوە لە سنووری لێبوردن, ئەو مافە بۆ ئەوانەی رەچاوی لێبوردن ناکەن پەسەند نەکەین, کەواتە بە زۆری ناتوانین قایل ببین بە لێبوردن لە ئازادی قسەکردندا, بەڵام هەرگیز نابێت لەبیرکەین کە لێبوردن لە مەسەلەیەکی تایبەتدا بەمانای لێبوردنە لە بیروباوەڕ و کردەوەگەلێك کە ئێمە ئەوان لەژێر ناوی هەڵەو ناخوازراویدا رەتدەکەینەوە, جگە لەم شێوەیە ئەوا پێویست ناکات لێبوردن رەچاوبکەین, ئەمە بەو مانایە نییە کە ئێمە ناچارین باوەڕ بهێنین بەوەی ئەم بیروباوەڕ و کردەوانە راستن, ئێمە بەرگەیان دەگرین, چونکە هەڵەن: بەو مانایەی لەگەڵ بۆچوونی ئێمە لەمەڕ راستی ناگونجێن. سەرباری ئەوە ئەگەر گریمان بکەین تەنیا راستییەك یاخود کۆمەڵە راستییەك فەرمانڕەوایی بەسەر کۆمەڵگادا دەکەن, ئەوکات هۆیەك نییە

بۆ لێبوردن و ڕێزگرتن لە ئەوانی دیکە لەگەڵ ئەم راستییە کۆك و تەبانین. لەئەنجامدا، تاکە شێوازێك کە ناتوانین خۆمانی لێلادەین بەندکردن یاخود لەناوبردنی ئەویترە.

کەواتە، لێبوردن بە مانای رەچاوکردنی هاوسەنگی نێوان کۆمەڵێك بەها، پرەنسیپ و راستییەکی خۆومەیلی تەحەموولکردنی ئەوانی دیکەیە کە بڕوایان بە بیروباوەڕی جیاواز هەیە. بەدەستەواژەیەکی دیکە، پەسەندکردنی لێبوردن وەك بەهایەکی ئەخلاقی و سیاسی پۆزەتیف ئاماژەکردنە بەمانای توانای ژیان لەگەڵ ئەوانی دیکە و بەشداربوونە لە گریمانەی بنچینەیی لیبرالیزمی سیاسی کە سەربەخۆیی تاکەکەسی ئەنجامی جیاوازی و دژایەتی ئەم چاکی و ئامانجانەیە. ئەمە بەو مانایەیە کە لێبوردن بە باشی هەماهەنگە لەگەڵ ئەو نەریتەی بیرکردنەوەی سیاسی کە ئازادی بە نەبوونی کۆت و بەند دەناسێنێت.

بەگشتی لەبەر ئەو هۆیەیە هەموو پشتیوانان و رەخنەگرانی دیاردەی لێبوردن ئەو وەك رەگەزێکی سەرەکی نەریتی لیبراڵی دەناسێنن. جۆن راولز لەدواکتێبیدا "لیبرالیزمی سیاسی" بە بیردەهێنێتەوە کە "سەرچاوەی مێژوویی لیبرالیزمی سیاسی... سەردەمی ریفۆرمی ئایینی و ئاکامەکانیەتی، هاوکات لەگەڵ مشتومڕە زۆرەکان لەمەڕ لێبوردنی ئایینی لە سەدەکانی ١٦و١٧". ئەوەی راولز لەم کتێبەدا دەیخاتەڕوو ڕێگایەکە، بەها لیبرالییەکانی راولز لەوانەش لێبوردن و ئۆتۆنۆمی هەر لەمەڕخۆییان پەسەند کران. راولز پێی وایە خەڵکی توانای ئەوەیان هەیە بە مەبەستی ژیان لەگەڵ ئەوانی دیکە خۆیان دەروەست بکەن بەپرەنسیپی لێبوردن. تیۆری راولز لەبارەی لێبوردنەوە قسەکردنە لەگەڵ خەڵکێك کە حەز دەکەن خۆیان و ئەوانی دیکەش بە ئەندامی ئازاد و بەرامبەری کۆمەڵگایەك لە قەڵەم بدەن کە تیایدا هەموو کەسێك دەتوانێت بۆچوونە سەرتاپاگیرەکانی لەبارەی ژیانی باشی لەژێر سایەی پاراستنی تەواوی یاسا دەربڕن و بە هەمان رادەی ئەوانی دیکەش لە ئەگەری سەرکەوتن بەهرەمەندبن.

تیۆری راولز لەبارەی لێبوردن یەکەمین بەرگری لیبراڵی نییە لە پشتیوانی کردن لە بۆچوونە سەرتاپاگیر، بەڵام ناکۆکەکان، دەخرێتەڕوو، یەکەمین هەوڵی سەرەکی لە دروستکردنی بناغەیەکی فەلسەفی بۆ لێبوردن لەلایەن هزرڤانێکی لیبراڵی دیکەوە بەناوی جۆن لۆك خرایەڕوو. بەرهەمی ناسراوی لۆك بەناوی نامەیەك لەبارەی لێبوردنەوە تاکوساڵی ١٩٨٩ ساڵێك بەر لە چاپ بوونی دوو وتار لەبارەی حکومەتی مەدەنی و نامەیەك لەمەڕ تێگەیشتنی مرۆیی چاپ نەبیوو، بەڵام مەسەلەی لێبوردن چەند ساڵێك زووتر لە ناوەندی بیروهزرەکانیدا جێگەی گرتبوو، لە ڕاستیدا ئەو هێڵە سەرەکییەکانی تیۆری لێبوردنەکەی لە ساڵی ١٦٦٧ لە تەمەنی ٣٥ساڵیدا دەستنیشانکردن، لۆك، لەدایك و باوکێکی پیۆرتین هاتە دونیاوەو پەروەردەو فێرکردنیشی لە ئۆکسفۆرد لەسەر شێوازی پیۆرتینەکان بوو و دواتریش بوو بەهاوڕێی نووسەرێکی وەك شێفتزبری، لە بنچینەدا لەگەڵ بۆچوونی ئەقڵانیانەو لێبوردەییانەی حیزبی ویگ[1] کۆك و تەبابوو کە بەرەنگاری ستەمکاری دۆگماییانەی حیزبی تۆڕی -کە کەنیسەش پشتیوانی لێدەکرد- دەبووەوە، ساڵێك دوای بڵاوبوونەوەی یەکەمین نامە لەبارەی لێبوردنەوە ساڵی ١٦٨٩، جۆناس پەرواست، پێش نوێژکەر و لێکۆڵەری زانکۆی ئۆکسفۆرد، وەڵامێکی بۆ ئەو نووسی، (لۆك)یش دەیەیەك دواتر لە وەڵامی رەخنەکانی پەرواست و بەتایبەتی بۆ وەڵامدانەوەی ئەو تۆمەتەی کە لێبوردن بەلای بێبڕوایی و رێژگەرایی ئەخلاقیدا دەشکێتەوەو هەروەها تۆمەتەکانی دیکەش دووەم، سێیەم و چوارەم نامەی بڵاوکردەوە، لۆك لەم نامانەدا بە گوتەی خۆی (سێ تێبینی) بۆ پشتیوانی لە رەچاوکردنی لێبوردن لە مەسەلە تەواو ئاینییەکاندا دەهێنێتە پێشەوە. یەکەمین تێبینی ئەوەیە، هیچ بەڵگەیەك لەبەردەست نییە کە پیشانبدات خواوەند کۆنترۆڵکردنی دەروونەکانی بە دادوەرەکانی دادگا مەسیحییەکان سپاردووە.

دووەم: ئەوەی ئەم هێزە لەتوانای دا نییە باوەڕەکان بۆ خۆی ملکەچ بکات.

سێیەم: لەبەر ئەوەی خەڵکی رێپێدراو نین بۆ گرتنەبەری هیچ پرەنسیپێك جگە لە ئایینی دەرباری، ئۆمێدێکی هێندە بۆگەیشتن بە ئاینێکی راستەقینە لە ئارادا نابێت.

ئەوەی لۆك دەیەوێت لە سێیەمین تێبینیدا بخاتەڕوو ئەوەیە کە گەیشتن بە راستی ئایینی کارێکی زەحمەتە, چونکە ئەوەی دەتوانین لە تێکستە پیرۆزەکانی مەسیحییەت تێبگەین تەنیا بیرۆکەیەك لە راستیمان پێ دەبەخشێت, نەك خودی زانست.

بەڕای لۆك ئەم شتە ئاماژەگەلێکی سیاسی بەدواوەیە و ئەویش ئەوەی پیادەکردن و ناچارکردنی نۆرمەکانی ئایینی مەسیحی لەلایەن حکومەت لەسەر ئەو بنچینەیەی کە ئەم نۆرمانە لە دەقە پیرۆزەکان دەرهێنراون, کارێکی نایاساییە. کەواتە حکومەت کە لەگەڵ فرەیی بیروباوەڕە ئاینییەکان ڕووبەڕوویەو پڕچەك نییە بە کەرستەیەکی زانستی, بۆ جیاکردنەوەی ئەوان لەیەکتر, پێویستە رەفتارێکی لێبوردەییانە بگرێتەبەر.

کەواتە لۆك لێبوردن لە بێباکی ئایینی جیادەکاتەوە. لۆك نەك لە هەموو جۆرەکانی بیروباوەڕە ئاینییەکان, بەڵکو بەرگری دەکات لەمافی هەر کەسێك بۆ دادوەریکردن لەم بوارەوە و هەروەها بۆ خۆیشی. لە نامەکانیدا لۆك بەڵگەگەلێکی جیاواز لە بەرگریکردن لە لیبوردنی ئایینی دەخاڕوو, لەوانەش:

١-دادوەرە مەسیحییەکان ریاکارن, چونکە لە هەمان ئەو کاتەدا کە بانگەشەدەکەن بەوەی خوازیاری یەکسانی ئایینین لەسەر بنچینەی "خۆشەویستی روحی مرۆڤەکان... خۆیان دووچاری گەندەڵی, سەرسەختی و ئەو ناشرینیانەن".

٢-ئەم دادگایی کردنانە نامەسیحین. مەسیحیەتی راستەقینە پشت ئەستوورە بە باوەڕێك" بەخۆشەویستی, نەك بە زۆر رێیخۆی دەکاتەوە."

٣-گوژمەی ناچارکردن بە یەکێتی ئایینی دەشێ زۆر زێدەتربێت لە گوژمەی تەحەموولکردنی فرە ئایینی, ئەم فرەییە بە لێبوردن کۆتایی دێت نەك بە زۆر.

٤-چەمکەکانی حکومەت لە باوکردنی ئەو باوەڕە ئایینیە راستەقینەیەی کە باوەڕدارە راستەقینەکان بەدوایەوەن, کاریگەرنین.

بۆ لۆك هەروەکو بۆ زۆر لە لیبراکەکانی دوای ئەویش, لێبوردن تەنیا لەسەر بنچینەی ئاکامە بەسوودەکان خوازراوە. هەر لەبەر ئەوەیە ئاوازی لۆك لەوتارەکەیدا لە بارەی لێبوردن ئاوازی هەستی سادەو ئەقڵی تەندروستە. بەخوێندنەوەی لۆك ئەو

تێگەیشتنە دێتە زەینەوە کە هەرچەندە لەسەدەی ١٧ هزری لێبوردنی ئایینی پەسەند نەبوو, بەڵام کەسە ئاقڵدارەکان کە تەنیا سوودەکانی لێبوردنیان لەلا روون و ئاشکرا دەبوون, روویان لە لێبوردن دەکرد. هەر لەبەر ئەوەیە مەسەلەی لێبوردن لە بنچینەدا مەسەلەیەکی سیاسییە. ئەوکات مەسەلەی ئازادی ویژدان یاخود ئازادی هزریی رووت لە ئارادا نەبوو. مەسەلەی سنووری دەسەڵاتی دادوەر لە مەسەلە ئاینییەکاندا لە ئارادابوو. لۆك دەنووسێت:"خۆشگوزەرانی گشتی بەڕای من لە کۆمەڵگایەکدا بوونی هەیە کە تەنیا لەپێناو پاراستن و گەشەدان بە بەرژەوەندییە مەدەنییەکانی ئەندامەکانی دروست ببێت". ئەوەی لۆك بۆ ئێمەی ئاشکرا دەکات ئەوەیە کە تیۆری لێبوردن ئەنجامی لۆجیکی تیۆرەکانی ئەوە لەبارەی کۆمەڵگاو دەوڵەتەوە.

ئەو ئەمە بەو شێوەیە دەخاتەڕوو: "ئەگەر مرۆڤەکان دەیانتوانی لە ئاشتی و ئارامیدا پێکەوە بژین, بەبێ ئەوەی لەژێر هەندێك یاسادا لەگەڵ یەکتر یەکبگرن, و بەخۆشگوزەرانی گشتی و هاوبەش بگەن, چیدی پێویستی بەدادوەرەکان یاخود سیاسەت کە تەنیا بۆ ئەوە درووست بوون تا مرۆڤ لە فریودان و توندووتیژی ئەویتر بپارێزن نەبوو".

بەدەستەواژەیەکی دیکە, لۆك سوورە لەسەر کۆنترۆڵ و گەشەپێدانی سیستمی کۆمەڵایەتی کە خۆی دەستی پێکردووە. ئەو بەباشی لەو هەلوومەرجە ئاگادارە کە لەوانەیە هەڕەشە لە خۆشگوزەرانی گشتی لێبوردەییانەو ئەو ئۆتۆنۆمیەی ئەو مەبەستیەتی بکات. ئەو وەك تاکەکەسێکی ئەزموونگەرا لە ئەزموونەوە فێربووە کە پێویستە نکۆڵی لە هەندێك پێکهاتەکانی دەسەڵاتی کەنیسەو حکومەت بکەن.

بەگشتی, لوك لەوە دەترسێت کە پشت بەستنی گشتی بە کۆمەڵگایەکی ئۆتۆنۆم تێکبچێت. بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم مەسەلەیە بەدوای سەرچاوەکانی لێبووردن لەمافەکانی بوونەوەرە ئاقڵەکاندا دەگەڕێت و بەڕەسمی لە قەڵەمیان دەدات, بەبۆچوونی لۆك, ئەوەی کە جۆری مرۆڤ ژیان لە کۆمەڵگایەکی رێکخراودا هەڵبژێرن

هەڵبــژاردنێکی ئاقڵانەیــە, چــونکە بــەم پێیــە دەتــوانن چــەمکگەلێکی وەك ئــازادی و خاوەنداریێتی بەباشترین شێوە جێ بەجێ بکەن و گەشەپێبدەن.

کەواتــە کۆمــەڵگای رێکخــراو بــۆ مانــەوەی مرۆڤــەکان پێویســتەو رۆڵــی یاســاش بــۆ گەشەســەندنی بەرژەوەندییــە مرۆییــەکان نکــۆڵی لێنــەکراوە. کەواتــە هاووڵاتیــان لــە هەڵبژاردنێکی ئاقڵانەدا ژیان لە کۆمەڵگایەکی رێکخراودا هەڵدەبژێرن و هــەر لەبــەر ئــەوە بە چاکیە مەدەنییەکان پابەند دەبن کە مافە بنچینەییەکانی ژیان, مولکیەت و ئازادی و هەروەها ئەو چاوەڕوانیە دێتەدی کە رەفتاری حکومەت لەگەڵ هاووڵاتیان بەپێی پەیمان و بەڵگەنامەی دوولایەنەبێت. کەواتە بەبۆچــوونی لــۆك لێبــوردن مافێکــە لەســەر بنــەمای چاکیە مەدەنییــەکان کــە لەیــەك کۆمــەڵگای ئۆتۆنۆمــدا گەشــەیان پێــدەدرێت, و چــاکیە مەدەنیــەکانیش بــە نــۆرەی خۆیــان لــەو رووەوە کــە لــە بەرژەوەنــدی ئــەهلی ئــەقڵ و بەڵگەدان لەلایەن ئەوانەوە پارێزگارییان لێدەکرێت و زامن دەبن.

بەم شێوەیە و بەبۆچوونی لۆك لێبــوردن مافێکــە بنەماکــەی بــۆ شایســتەیی ئاقڵانــە دەگەڕێتــەوە. لەبــەر ئەوەیــە کــە نائاقڵانــەو نالۆجیکیــە ئەگــەر حکومــەتێك هەوڵبــدات بیروباوەڕە ئاینییــەکانی خــەڵك بــە زۆر بگۆڕێــت, چــونکە نــاکرێ بیروباوەڕەکــان بــە زۆر ملکەچ بکرێن. مەبەستی لۆك ئەوەیە کە ناتوانین روحی خۆمان بخەینە دەست ئیختیاری دادگای مەسیحی, چونکە هیچ زەمانەتێك نییە کە ئەم دادگایە لەسەر هەق بێت.

کەواتە هەر کەسێك دەبێت (شوێن پێی ئەقڵی خۆی هەڵگرێت), بانگەشەی لۆك لــەم باســەدا پشــت ئەســتوورە بــەم دەســتەواژەیە کــە نــالێبوردەیی نــە تــەنیا لــە رووی ئەخلاقییەوە هەڵەیە بەڵکو لەڕووی سیاسیشەوە نائاقڵانەیە. هەر لەبەر ئەوەیە لــۆك لــە باسەکەی خۆیدا عەودالی جیاکردنەوەی کەنیســەو حکومەتــە تــاکو رێگــە لــە کۆمــەڵێکی زۆردارانەو نارێکخراو بگرێــت. بــە دەســتەواژەیەکی دیکــە, لــۆك خوازیــاری ئامــادەکردنی ئەقڵانیەتە لە رێکخستنی کۆمەڵگای مەدەنیدا, کەواتە ئــەو کەنیســەو حکومــەت لەیــەکتر جیادەکاتــەوە, لــۆك بــەم جــۆرە دەنووســێت: "کەنیســە خــۆی بەگشــتی جیــاوازە لــە کۆمەڵگای بەرژەوەندییە هاوبەشەکان, سنوورەکانی ئەم دووانە جێگیر و نەگۆڕن." بــەو

ئەنجامە دەگات کە دادوەری مەسیحی پێویستە هەموو کۆمەڵگا ئاینییەکان تەحەموول بکات. ئەم لێبوردنە پێویستە لە سەرووی مەسیحییەکانەوەبێت و هەموو ئەو کۆمەڵگایانەی کە قایلن بە بوونی خوا لەخۆی بگرێت. بەگوتەی لۆك:"...نە موسڵمان, نە جوولەکە نابێت لەبەر ئایینەکەیان لە مافە مەدەنییەکانی کۆمەڵگای بەرژەوەندییە هاوبەشەکان بێ بەش بکرێت". هەر لەبەر ئەوەیە لۆك بە لەبەرچاوگرتنی پەیوەندی کەنیسە و حکومەت بەوە ناسراوە کە دیدێکی گەشبینانەتری سەبارەت بە سروشتی مرۆیی لە هۆبز هەیە, بەڵام پێویست بوو ڤۆلتێر سەدەیەك دواتر بەم جۆرە ئەو تەواو بکات: "لێبوردن چییە؟ ئاکامی سروشتی مرۆڤایەتی ئێمەیە, ئێمە هەموومان بەرهەمی سستی و لاوازین.

هەموومان کارەکان پشتگوێ دەخەین و هەروەها شیاوی هەڵەین, کەواتە وەرن لە دەبەنگییەکانی یەکتر ببوورین, ئەمە یەکەمین بنەمایە لە یاسای سروشتدا, یەکەمین بنەما لە مافی هەموو مرۆڤەکان".

ئەگەر سەرنج بدەینە روونکردنەوە لیبراڵ و رۆشنگەرەکانی لۆك و ڤۆلتێر بە درککردنی تایبەتمەندییەکانی گرتنەبەری سیاسەتێکی لیبراڵی لێبوردەییانە دەگەین کە رێز لەو کۆمەڵگایە دەگرێت کە ئەندامەکانی بەباشتر دەزانن جیاوازییەکانی یەکتر تەحەموول بکەن نەك ئەوەی بکەونە گیانی یەکتر, بەڵام پەسەندکردنی ئەم سیاسەتە بۆ هەمووان لە دنیای ئەمڕۆدا ئاشکراو بەدیهی نییە. لە جیهانی ئەمڕۆدا, جیهانی فرەکولتووری کە بە هاوکاری ئەو کەشە لێبوردەییانەی لە وڵاتە لیبراڵەکاندا هەیە شایەدی گەشانەوەی کولتوورە جیاوازەکانن, شەیدابوون و بینینی تایبەتمەندییە فەلسەفی و سیاسییەکانی لێبوردن وەك سەردەمی لۆك زەحمەت نین, بەڵام ئەم سەرنجدانە سەبارەت بە ئەوانی دیکە و کرانەوە سەبارەت بە راستی لە هەندێك لە کولتوورە ئاینیی و سیاسییەکاندا هێشتا نەبوونە بە بەشێك لە هەستی گشتی. گومانی تێدا نییە کە لێبوردن لە هەموو سەردەمەکانی ئەخلاقیە بەڵام رەنگە زیاد لە هەر

سەردەمێکی دیکە لەگەڵ سەردەمی ئێمە گونجاوبێت, لەبەر ئەوەی لەکاتێکدا کە بە تەواوی لێیتێبگەین پیشانی ئێمەی دەدات کە بە چ شێوەیەد دەبێت.

بەرەنگاری وەسوەسەی توندوتیژی ستەمکاری ببینەوە, کە لەلایەن هەندێك ئایدۆلۆژیا سیاسییەکانی رۆژگاری ئێمەوە بلاودەکرێنەوە. ئەو وانەیەی لێبوردن پێمان دەڵێت, وانەی تێروانینی رەخنەگرانەو گومان خوازانەیە لە بەرامبەر هزرڤانانی یۆتۆپیزم کە حەزدەکەن لە کۆمەلگایەکدا نیشتەجێ ببن, کە رێز لە بەهاکانی پلورالیزم ناگیرێت و رەخنە لەو دامەزراوانەی کە دروست بوون ناگیرێت و چاکسازی ناکرێن, بەلام لێبوردن هەروەها بەومانایەدێت, کە رێگە بەوانەی دیکە بدەین تاکو بەدوای لایەنگرەکانەوەبن بۆ خۆیان, کە ئێمە پێمان وایە بیروباوەرەکانیان بۆ بیروباوەڕی ئێمە مەترسیدارن. تێرامان لە مانای لێبوردن دەتوانێت شێوازێك بێت بۆ ئەوەی ئێمە هەموو تێبگەین, کە هیچ رێگەچارەیەکی تاکانە بۆ کێشەکانی ئێمە نییە, بەو مانایەی کە کۆمەلگای لێبوردەخواز پێویستە داوا لە ئەندامەکانی بکات بۆ وتووێژکردن لەگەڵ یەکتر.

پەسندکردنی ئەو شتە لە شێوەی پرنسیپێکی هەنگاونان لە رێگای لێبوردندا وەك کێشەیەکی رۆژانە وایە کە یەکەیەکەی تاکەکانی ئێمە دەگرێتەوە.

پەراوێز:

(١) دوو حیزبی ویگ (Whig) و تۆری (Tory) لە ئینگلتەرا هەر لە کۆنەوە رکابەری یەکتربوون, لە کۆتایی سەدەی حەڤدە حیزبی ویگ لە دژایەتیدا لەگەڵ چارلزی دووەم و جیمزی دووەم بواری بۆ شۆرشی شکۆمەندی ساڵی ١٦٨٨ رەخساند, لە ئەنجامی ئەم شۆرشەدا پەرلەمان بەسەر بنەماڵەی پاشایەتیدا سەرکەوت و بە باشتر لەوان لەقەڵەم درا.

# ئایین، لێبوردەیی و توندوتیژی

## گفتوگۆ لەگەڵ محەمەد موجتەهید شەبستەر و موحسین کەدیوەر

ئامادەکردنی: گۆڤاری کیان
وەرگێڕانی لەفارسییەوە:
موسڵح ئیروانی

لەم مێزگەردەدا باسی ((ئایین, لێبوردەیی و توندوتیژی)) دەکەین. لەم باسەدا مەبەستمان لە ((توندوتیژی)) ئەو جۆرە توندوتیژییەیە کە وەك میتۆدێك بۆ گەیشتن بە چەند ئامانجێکی تایبەت پیادەکرێت. پرسیاری یەکەممان ئەوەیە کە کام بنەمای مەعریفی, پشتیوانی توندوتیژی نواندنن, بەتایبەتی لە کۆمەڵگا ئایینییەکاندا؟

موجتەهید شەبستەری: من قسەکانم لەسەر کۆمەڵگا موسڵمانەکان چڕ دەکەمەوە. بە داخەوە لە کۆمەڵگا موسڵمانەکاندا توندوتیژی، بەو مانایە باسکرا، بەدی دەکرێت. لەم کۆمەڵگایانەدا دەستور (یاسای بنچینەیی) دانی پێداناوە و بڕیاری ئەوەیە گرووپ و کۆمەڵەکان لە رێی ئاشتیانەوە بەدوای مەبەستە سیاسی کۆمەڵایەتییەکانی خۆیاندا بگەڕێن. بۆیە پێویستە ئەو پرسیارە بکەین کە ئەم توندوتیژیانە پشت بەکام بنەمای تیۆری وپراکتیکی دەبەستن؟ نووسین و دارشتنی دەستوور لەسەر بنەمای دانان بە مافی مرۆڤ، سنووری دەسەلات و شتی لەم بابەتە، هەروەها لەسەر بنەمایەکی ئەپستمۆلۆژی، مرۆڤناسی، کۆمەڵناسی ئاییناسانەی تایبەت دامەزراوە. لەکۆمەڵگا موسڵمانەکاندا، ئەگەر چی ئەم دەستوورە دارێژراوە، [بەلام ] بەشێك لە خەلکی ئەم کۆمەڵگایانە، لە جیاتی ئەم بنەمایانە، بڕوایان بە بنەما گەلێکی تر هەیە. ئاشکرایە ئەم شتە یەکێکە لە رەگو ریشە سەرەکیەکانی توندوتیژی لە کۆمەڵگا موسلمانەکاندا.

دەستووری دیموکراتیك، پشت دەبەستێ بەدانان بە مافی مرۆڤ و فرەیی حەقیقەت" واتە بڕوابوون بەوەی کە مرۆڤ دەتوانێت فەلسەفەی جیاجیای هەبێت و تەفسیری جیاجیا بۆ گەردوون، مرۆڤ وئیمان بخاتە روو. ئەگەر کەسانێك پێیان وابێ لە بواری ئایین، سیاسەت، مرۆڤناسی وگەردووناسیدا، کۆمەڵێك حەقیقەتی هەتا هەتایی هەیە کە تەنیا چەند کەسێك لێی ئاگادارن و هەموو مرۆڤەکان دەبێ ژیانی کۆمەڵایەتی خۆیان، تەنانەت بەزۆرەملێ وناچارا، ئاشکراو نائاشکرا لەگەڵ ئەو حەقیقەتانەدا بگونجێنن (لە مێژووی بیری ئایینی موسڵماناندا موعتەزیلە ئەو بۆچوونانەیان هەبوو وئەمڕۆش هەندێ ئەمە دەلێنەوە)، ئەم جۆرە کەسانە ناتوانن بڕوایان بە مافی بنەڕەتی بۆ مرۆڤەکان هەبێ و بەگوێرەی ئەمە دەستوور دابڕێژن.

ئێمەی مرۆڤ بەشێوەی کۆمەڵ دەژین وهەمەجۆرەیی ناو دونیای مرۆیی وا پێویست دەکات بناغەی وبنچینەیەك بۆ ژیانی کۆمەڵایەتیی هاوبەشی خۆمان بێنینە کایەوە، بەچەشنێك کە لەم ژیانە کۆمەڵایەتییە هاوبەشەدا، تاکەکەسان بتوانن ئەوەی

بەحەقیقەت وبەرژەوەندی دادەنێن, بڵێنەوەو بەگوێرەی ئەوە ئیش بکەن. لەراستیدا دەستوور بۆ رەخساندن وفەراهەمکردنی ئەم بناغەو بنچینەیە دادەرێژرێت. ئەم دەستوورانە پشت بەمەعریفەیەکی تایبەت دەبەستن وبونیادێکی کۆمەڵایەتی تایبەت دێننە کایەوە. ئەگەر ئەو بنەما مەعریفیانە لەبەرچاونەگرێن, دارشتنی دەستوور بە شێوەیەکی دیمەکراتیانە مانای خۆی لەدەست دەدات. لەکۆمەڵگا موسڵمانەکاندا, دەستوور لەلایەك رۆشنبیرانەوە, جا ئایینی بن یان نائایینی, دادەرێژرێت, ئەم رۆشنبیرانە, بەزۆری دەستووریان بەگوێرەی بنەما مەعریفیە نوێیەکان و بە رەچاوکردنی پرەنسیپی دیموکراسی دارشتووە. بەڵام روشنبیران وزانایانی کۆمەڵگا موسڵمانەکان لە خەڵکی موسڵمان دوور ونامۆبوون و بنەمای مەعریفی نوێ نەچووە ناو هزری ئەم خەڵکانەوە. لەم کۆمەڵگا موسڵمانانە دەستوور دارێژراوە ومافە بنەرەتییەکان وئازادی بۆ مرۆڤەکان لەبەرچاو گیراوە, بەڵام بەکردەوە زۆربەی کۆمەڵگا موسڵمانەکان بنەمای نەعرفی ئەم دەستوورەیان وەرنەگرتووە وتائێستاش پابەندی بنەمای مەعریفی دەستەڵاتخوازانەی خۆیانن وهێشتا بروایان پێی ماوە. لە چوارچێوەی ئەم بنەما نەریتییەدا, هەمەجۆری, مافی مرۆڤ, ئازادییە سیاسی کۆمەڵایەتییەکان وئازادیی ئایینی پەسند نەکراوە. کەواتە, جۆرە ناهەماهەنگییەك هەر لەنێوان ئەو بنەما مەعریفیە نوێیەی کە بناغەی یاسا دیموکراتیکەکانە, لەنێوان رۆشنبیرانی ئایینی نائایینیدا دەمەتەقێ لەبارەی ئەم ناهەماهەنگیە هەیە, بەڵام ئەم دەمەتەقێیانە هێشتا دزەیان نەکردۆتە ناو خەڵکی موسڵمانەوە. دەمەتەقێی مەعریفی هیچ کات بەوشێوەی لەلای بیرمەندان, فەیلەسوفان وتیۆلۆژیستەکان هەیە لەلای خەڵکی ئاسایی بەدی ناکرێ, ئەگەر جۆرە ناکۆکییەك لە نێوان کولتووری سەربژاردە وکولتووری عەوامدا هەبێ, دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی چەندین گرفت, (بەداخەوە لەکۆمەڵگا موسڵمانەکاندا بەم شێوەیە). لە وڵاتانی رۆژئاوادا, شێوەیەکی سادەکراوەی بنەما مەعریفیە تازەکان لەنێو سەربژاردەوە بۆ ناو خەڵکی ئاسایی گوازراوەتەوە و خەڵکی ئاساییش تێگەیشتنێکی سادەیان بۆ چەند چەمکێکی وەکو مافی مرۆڤ, پلورالیزم وئازادی وەدەست هێناوە,

بەلام ئەمە لە کۆمەلگا موسلمانەکاندا روونەداوە و ئەم هزرە نوێیانە دزەیان نەکردۆتە ناو خەلکی موسلمانەوە.

ئەمرۆ ئەو کۆمەلگایانەی کە لەسەر بنەمای دەستووری مۆدێرن ودیموکراتیانە رێکخراون, بونیادە سیاسی وکۆمەلایەتییەکان لەگەل بنەما مەعریفییەکانی هەمان دەستووردا گونجاون, بەلام لەکۆمەلگا موسلمانەکاندا, بونیادە سیاسییەکان کە بەگوێرەی بنەما نەریتییەکان دروستبووە, وەکو خۆی ماوەتەوە وئەمە یەکێکە لەسەرچاوەکانی توندوتیژی لەکۆمەلگا موسلمانەکاندا.

لەکۆمەلگا موسلمانەکاندا, چەندین کەس وکۆمەلە هەن کە دەستوور وبنەما مەعریفییەکەی وبەهاکان وئەو بونیادە سیاسی وکۆمەلایەتیەی کە لێیەوە بەرهەم دێ (وەکو کۆمەلگا مەدەنی) بە دژی بنەمای مەعریفی وبونیادی کۆمەلایەتی وسیاسی وخۆیان دەبینن ولەبەر ئەوەی نایانەوێ بنەمای مەعریفیی خۆیان لەدەست بدەن وخۆیان لەگەل هەلومەرجی نوێدا بگونجێنن, بۆیە بەرگری لە کۆمەلگایەك دەکەن کە بونیادەکەی لەگەل بنەمای مەعریفی وبەهاکانیاندا بگونجێ. ئیمان, بیروباوەرو دەمارگیری وبەرژەوەندیش دەبنە پشتیوانی ئەم تێروانینە ولەکۆتاییدا دەریدەخەن کە بونیادی سیاسی سەدەکانی رابردوویان دەوێ. ئەم کەس وکۆمەلانە سەرەرای ئەو گۆرانکارییە کولتووری ـ کۆمەلایەتی وئابوورییانەی کە لەم کۆمەلگایانەدا روویداوە دەیانەوێ بەهەر نرخێك بێت ئەو بارودۆخەی جاران بەرهەم بێننەوە ولەبەرئەوەی ئەو بارودۆخە بەرهەمنایەتەوە, توندوتیژی دێتەکایەوە ئەویش لە بەرگی ئایین ودینداریدا.

* وا دێتە بەرچاو کە زۆرێك لە بیرمەندە نوێخوازەکانیش کاریگەریان هەبووە لەهێنانەدی وزەمینەخۆشکردن بۆ توندوتیژی لە کۆمەلگای ئایینیدا. بۆ نموونە, ئەو رۆشنبیرانەی لەژێر کاریگەری ئایدیۆلۆژییە چەپەکاندا بوون هەولیان دەدا لەرێی بەئایدیۆلۆژیکردنی ئایینەوە, بیگێرنەوە بۆ کایەی کۆمەلگا یان پێگەی ئایین بچەسپێنن, لە راستیدا ئەوان برەویان بەو ئایدیۆلۆژیە مۆدێرنانە داوە کە بۆ ئامانجی توندوتیژانە

سوودیان لێ بینراوە. واتە لەلایەن نوێخوازانیشەوە کۆمەڵێکی وا دەبینین کە تەگبیری تیۆری بۆ پیادەکردنی توندوتیژی دەکەن, بۆ نموونە گرووپە فاشیستی ونیمچە فاشیستییەکان. بۆیە دەتوانین بپرسین ئایا بەڕێزتان دەرکەوتنی توندوتیژی تەنیا بە بەرنجامی ناکۆکیی نێوان نوێخواز ونەریتخوازان دەزانی یان لەبەرەی نوێخوازانیشدا خوێندنەوەیەکی تایبەت هەیە کە برەو بە توندوتیژی لە کۆمەڵگادا دەدا؟

موجتەهید شەبستەری: ئاماژەتان بە خاڵێکی گرنگ دا. بەشێکی زۆری ئەو توندوتیژیانە کە لەم کۆمەڵگایانەدا هەبووە وهەن لەلایەن نوێخوازانەوە بووە, بەڵام هەندێ توندوتیژیش پەیوەندیان بەبیروڕای هەندێ لەنوێخوازانەوە هەیە. ئەم نوێخوازانە لەژێر کاریگەری ئایدیۆلۆژییە چەپەکاندا بووینەو ویستویانە ئایدیۆلۆژییەکی سیاسی لە ئایین بێننە کایەوە. گرووپێکی دیکەی نوێخوازان زۆر پابەندی نەریتی ئایینی نەبوون وتەنیا وەك ئامرازێك بۆ ململانێ سوودیان لە ئایین وەردەگرت. هەندێ لەوانەی کە لەجیهانی ئیسلامدا نازناوی نوێخوازی ئایینیان پێوە لکاوە" ئەگەر بەوردی هەڵیانسەنگێنین, نابێ بیان خەینە ریزی نوێخوازانی ئایینییەوە. ئەوان بێ ئەوەی خولیایەکی ئایینیان هەبێ, ئایینیان کردۆتە وەسیلەیەك بۆ ململانێ وخەبات. هەروەك چۆن دەستەیەکی تری نوێخوازانی ئایینیش لەهەمان کات کە خۆیان بە نوێخواز دەردەخست لە رادەبەدەر کەوتبوونە داوی نەریتەوە ونەیانتوانی پەیوەندییەکی رەخنەگرانە لەگەڵ نەریتدا ببەستن. ئەم گرووپە خولیایەکی ئایینیان هەبوو, بەڵام رۆڵەی ئەم سەردەمە نەبوون.

*** ئایا نەریتخوازان بەرپرسی پیادەکردنی توندوتیژی لەقەڵەم دەدەی؟.**

موجتەهید شەبستەری: بەڵێ, بەڵام لێرەدا من ناڵێم توندوتیژی لە رێنماییەکانی نەریتماندا بوونی هەیە یان نییە. مەسەلەکە ئەوەیە کە ژیان لەم سەردەمەدا بەبێ رووبەڕووبوونەوەی رەخنەگرانە لەگەڵ نەریتی رابردوودا, توندوتیژی لێکدەکەوێتەوە. راست نەکردنەوەی بیرنەکردنەوەی دەستەڵاتخوازانەی رابردوو وریگرتن لەخستنە رووی

بنەمايەكی مەعريفيی گونجاو لەگەڵ بونيادی سياسيی ديموكراتيك وپێداگرتن لەسەر پاراستنی بونيادی سياسيی رابردوو لەو هۆكارە گرنگانەن كە توندوتيژی لە كۆمەڵگا موسڵمانەكان لەم سەردەمەی ئێستادا بەرهەم دێنن.

*** بەرێز كەديوەر رای جەنابتان لەم بارەیەوە چییە؟.**

**موحسين كەديوەر:** بەرای من نە نەريت بەتەواوی داوای توندوتيژی دەكات، نەمودێرنيتە لە ڕەها داوای ناتوندوتيژی دەكات. لەناو نەريتدا چەند خوێندنەوەو ڕەوتێك هەن كە بانگەشەی توندوتيژی دەكەن ولە مودێرنيتەشە ڕەوتی توندوتيژخواز هەن. فاشيزم وستالينيزم منداڵی شەرعی مودێرنيتەن. لەنەريتی نەتەوەيی - ئايينی كۆمەڵگای خۆماندا، هەم خوێندنەوەی ئاشتيخوازانەمان بۆ ئايين ونەريت هەيە، هەم تێگەيشتنی زەبروزەنگ ئامێز. ئەمانە هەردووكيان هەن. بۆيە پێويستە لە ڕوانگەيەكی ديكەوە باسی بابەتەكە بكەين و تەنيا لە ڕوانگەی نەريت ونوێگەرييەوە لێی نەڕوانين. هەڵبەتە دان بەوەدا دەنێم كە ڕەوتی باڵادەستی ناو مودێرنيتە بەئاراستەی ڕەتكردنەوەی توندوتيژييەو بەداخەوە لە كۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتييەكاندا زۆربەی ڕێرەوە نەريتييەكان بەجۆرێك لەجۆرەكان ڕەوايەتی بەتوندوتيژی دەدەن.

بۆ وەڵامدانەوەی پرسياری سەرەكيتان سەرەتا پێويستە دوو جۆر توندوتيژی لەيەكتر جيابكەينەوە:

توندوتيژی ڕەوا و توندوتيژی ناڕەوا (يان توندوتيژی شەرعی و توندوتيژی ناشەرعی). توندوتيژيی ڕەوا چەند بەشێكی هەيە لە هەر كۆمەڵگايەكدا، جا چ كۆمەڵگايەكی ئايينی بێت يان نائايينی، ئەم جۆرە توندوتيژيانە بەرچاو دەكەون. يەكەم جۆری توندوتيژيی ڕەوا، توندوتيژييە لە ئاستی سزاداندا. توندوتيژيی ڕێلێگرتن و توندوتيژيی تەمێكارانە كە هەردووكی لەبەرامبەر تاوانبارانی كۆمەڵگاكاندا پيادەكرێن، توندوتيژيی ڕەوان. جۆری دووەمی توندوتيژيی ڕەوا كە لەگشت كۆمەڵگاكاندا ڕێگەی پێ دراوە، توندوتيژييەكە كە لەبەرامبەر ستەمدا ڕوودەدات، جا چ ستەمی تاكە كەسی بێت

یـان سـتەمی گرووپـی. بـۆ نموونـە لـەبواری تاکـە کەسـێدا ئەگـەر کەسـێك رووبـەڕووی توندوتیـژی بـووەوە هـەموو یاسـا دانـەرێك رێگـە دەدات ئـەو کەسـە بەرگرییـەکی ڕەوا لەخۆی بکات, تەنانەت ئەگەر ئەو بەرگرییە کوشتنیشی لێبکەوێتەوە. هەر بەم شێوەیە لەروانگەی کۆمەڵایەتییەوە, ئەگەر کۆمەڵگایەك بکەوێتـەوە ژێـر سـتەمەوە, مـافی هەیـە راپەرێت وبێگومان راپەرینیش ئاشـتیانە نابێـت. واتـە لـە ریپـەرین, شـۆڕش وبزوتنـەوە کۆمەڵایەتییەکاندا بەزۆری رەگێکـی توندوتیـژی بـەدی دەکرێـت وجـۆرە توندوتیژییـەکی رەوای تێدا بەکارهێنراوە.

ئاشکرایە لەم باسەدا, مەبەست توندوتیژییە رەواکان نییـە, بـەڵکو جۆرەکـەی تـری توندوتیژییە کە بریتییە لە پیادەکردنی رێبازی نائاشتیانەو نایاسایی بۆ گۆڕینی بونیادە کولتوورییەکان لـە تـاك یـان لەکۆمەڵـدا, یـەکێك لەخەسـڵەتە جیاکراوەکـانی ئـەم جـۆرە توندوتیژیـە, نـارەزایی ئـەو کەسـەیە کـە توندوتیـژیی دەرهـەق کـراوە. ئـەم جـۆرە توندوتیژییـە بنـەمای تیـۆریی جیـاوازی هەیـە. سـەرەتا لـە یەزدانناسـییەوە دەسـت پێدەکەین. ئەوانەی کە پەنا دەبەنە بەر توندوتیژی چۆن سەیری خوا دەکەن؟ بێگومـان سیمای خوا لەلای ئەوان, نەخواوەنـدی بەبـەزەیی (رحمـان)ەو نەخواوەنـدی بەخشـندە (رحیم)ە ونەخواوەندی بەبەزەیی وبەخشندە. خوای ئەوان, خوایـەکی سـزادەری تونـدە (شدید العقاب) کە هیچ بەخشندەییەکی نییە. خوایەك کە ((کتب علی نفسه الرحمة))یـە, خوایەك کە بـەزەیی وەك نـەریتێکی نـەگۆڕ لـە پەیوەنـدیی نێـوان خـۆی وبوونەوەرانیـدا بەپێویست زانیوە, لەلای ئەوانەوە کـەمترین بـۆنی بـەزەیی بەرنەکـەوتووە, ئـەم سـیما توندەی خواوەند, لەرەفتاری ئەو کەسـانەی کـە ئـەم تێڕوانینـەیان بـۆ خواوەنـد هەیـە, بەرجەسـتە دەبێـت. راسـتە لـە ئـەدەبیاتی ئایینیـدا, خواوەنـد لەبەرامبـەر تاوانبارانـدا سیمایەکی تۆرەی هەیە, بەڵام ئەم توندوتیژییـە بەرامبـەر تەوانبارانـەو ئێمـە مەسـەلەی سزادانمان وەلا ناوەو لێرەدا باسی ئەوە ناکەین. لێرەدا تاك تاکی خەڵك دەکەین. مـەرج نییـە هـەموو هاووڵاتیـانی کۆمەڵگایـەك تاوانبـار بـن و تـەنیا لەوانەیـە وەکـو ئـەوان

بیرنەکەنەوە کە توندوتیـژی بـەکاردێنن. مەگـەر گشـت ئەوانـەی وەك ئێمـە بیرناکەنـەوە بەتاوانبار لەقەڵەم بدەین.

**خاڵی دووەم:** ئەوەیە کە توندوتیژکاران بۆچوونێکی تایبەتیان بۆ دنیا هەیە. بـەرای ئەم کەسانە دنیا کێڵگەی دوارۆژ نییە, بەڵکو مەیدانی سزادانەو تاوانباران دەبێ هەر لەم دنیایەدا بەسزای خۆیان بگەن.

**خاڵی سێیەم:** ئەوەیە کە توندوتیژکاران بۆچوونێکی تایبەتیان بۆ مرۆڤ هەیە.ئـەوان زیادەڕۆیانە بەرامبەر بە مرۆڤ و لەرێی گۆڕانی ناخەوە هیچ مانایەکی نییە. بـەرای ئـەوان تەنیا لەکەش و هەوای ترس ولەرزەوە ـ واتە بەشێوەیەکی زۆرەملێ ـ مرۆڤ چـاك دەبێـت و دگۆڕێت. ئەگەر هۆکاری پەروەردە وکامڵبوونی مرۆڤ بەهۆکاری ناوەکی دابنـێین دەبـێ دڵنیا بین کە هۆکاری توندوتیژانە لـە زۆربـەی حالەتەکانـدا گـۆڕانی زاتـی لێناکەوێتـەوە. مرۆڤناسیی توندوتیژخوازانە کۆنترۆڵ وسزادان بەگرنگترین هۆکاری پـەروەردە دادەنـێن. بەرای ئەوان, مرۆڤ بوونەوەرێکە دەترسێ: لـەو بیرکردنەوەیـەدا هـەموو شـتێك بـۆ مـرۆڤ قەدەغەیە, جگە لەوانەی کە پێی رادەگەیەنرێت.

**خاڵی چوارەم:** ئەوەیە کە توندوتیژکاران بۆچوونێکی تایبەتیان بۆ حەقیقەت هەیە. واتە بڕوایان بە جۆرە دۆگماتیزم و موتڵەقگەرایەك هەیە. دۆگماتیزم خەسڵەتی سەرەکی ئەپسـتۆلۆژیای بیرکردنـەوەی توندوتیژکارییـە توندوتیـژکاران بڕوایـان وایـە حەقیقـەت بەشێوەیەکی موتڵەق لەبەر دەستی ئەوان دایەو ئەوانی تر بەشیان لەو حەقیقەتە نییە.

**خاڵی پێنجەم:** ئەوەیە کە توندوتیژکاران بەکارهێنانی هەموو رێگەیـەك بـۆ گەیشـتن بە ئامانجی پیرۆز, بە ڕەوا دەزانن و ئەمە جۆرە ئیباحیەتێکە لە رێباز ومیتـۆددا. بەرای ئەوان تەنیا مەبەسـت وئامـانج دەبێـت پـیرۆز وڕەوا بێـت ولـە رێبـاز ومیتـۆددا رێگـەمان

پێداوە پەنا بەرینە بەر هەموو ئامرازێك, تەنانەت ئەگەر رێباز وئامرازێکی توندوتیژانە یان نائاشتیانە بێت یان لەعورف یاسایی ئەو کۆمەڵگایەدا قەدەغە بێت. بەم شێوەیە بەرژەوەندی مانایەکی تایبەت وەردەگرێ, واتە بۆ گەیشتن بە ئامانجی پیرۆز بەرژەوەندی وا پێویست دەکات سوود لەهەموو رێباز وئامرازێك وەرگرین. بەلام ئەوان وەلامی ئەو پرسیارەیان نەداوینەوە کە ئاخۆ دەتوانین سنوورێك بۆ بەرژەوەندییە نەتەوەیی یان ئایینییەکان دابنێین؟ ئایا دەتوانین ئەم کاروبارانە کۆنترۆل بکەین؟ واتە ئایا هەموو قەدەغەکراوە شەرعییەکان لێرەدا حەلاڵ دەکرێن وهەموو فەرمان وئەرکە ئایینیەکان بەقەدەغە دادەنرێن؟

**خالی شەشەم:** ئەوەیە کە لەروانگەی توندوتیژکارانەوە, بیرکردنەوە, زانست وهنوشیاریی رۆڵێکی سەرەکیان نییە. با بەزمانێکی سادەتر بلێین مەعریفە رۆڵی یەکەم لە بەختەوەرکردنی مرۆڤدا ناگێرێت. شتی تری جگە لە هوشیاری, مەعریفە وبیرکردنەوە دەور دەبینن لە بەختەوەریدا. ئەم کەسانە بەوبیروهزرانەیانەوە کاتێکی پێویست بۆ وەدەستهێنانی هوشیارییە جیاجیاکان وهوشیارییە ئایینیەکان خەرج ناکەن ولەلایەن زانایانی ئایینیشەوە بەخراپ سەیر ناکرێن. بۆیە پشت بە هۆکاری نامەعریفی وەکو قەزاو قەدەر دەبەستن. ئەمە زۆر گرنگە, چونکە ئەگەر زانست ومەعریفە لە رەوتێکدا رۆڵێکی سەرەکی نەگێرێت, بەهەڵە سوودی لێدەبینرێ ودەگۆرێت بۆ بەلایەکی کۆمەلایەتی.

**خالی حەوتەم:** بریتییە لە تێگەیشتنی توندوتیژکاران لە سیاسەت. یەکەم" ئەوان هیچ بایەخێك بۆ یاسا دانانێن. ئەوان لە کۆمەلگایەکدا دەژین کە یاسا بە شێوەیەکی زۆرەملێ پەسەندکراوە, نەك وەك پێویستییەکی کۆمەلایەتی کە بۆ نموونە خەڵك بەو بروایە گەیشتین کە ناتوانن کۆمەلگا بەبێ پەیمانێکی کۆمەلایەتی جێی پەسەندی خەڵك بپارێزێن. یاسا بەزۆری لە دەرەوە راهاتووە ولە هەلومەرجێکی کۆمەلایەتی تایبەتیشدا

لەو کۆمەڵگایە پەسەندکراوە, بەڵام لە هزری جەماوەری خەڵکدا ولەوەش گرنگتر لە هزری زانایانی ئایینیشدا, یاسا پێگەیەکی گرنگی نییە, ئەم رێبازو ئاراستەیە بەتایبەتی زانایان بڕوایان وایە کە یاسای مرۆیی تەنیا لە هەلومەرجێکی تایبەتدا دەشێ هەبێ و ئەو یاسایەی کە رەسەنە ونابێ پێشێل بکرێ, تەنیا یاسای یەزدانییە. هەر چەند لەوانەیە یاسای مرۆیی لە ئەنجوومەنی شارەزایان یان پەرلەماندا لەسەر بنەمای یاسا شەرعییەکان دابڕێژرێ. لەپراکتیکدا دەبینین کە هیچ بایەخێك بەو یاسا مرۆییە نادرێ کە بەگوێرەی شەرع دارێژراوە. واتە ئامادەن هەر بەسادەیی لێ بکەوێتەوە. بەزمانێکی فیقهیانە, گەڕانەوە وپەنابردنە بەر یاسا بەکارێکی لاوەکی دادەنرێت.

واتە لەکاتی تەنگەناویدا پەنا دەبرێتە بەر یاساو ئەوان رێگە بەخۆیان دەدەن لە هەموو ئەو شتانە کەڵك وەرگرن کە شەرع رێگەی پێداوە, جا چ یاسایی بێت یان نە. دووەم خواست ورای خەڵك لەلای ئەوان هیچ نرخێکی نییە. لەهەندێ خوێندنەوەدا توندونیژکارانە لە هیچ بوارێکدا تەنانەت لەبواری شتە حەڵاڵەکانیشدا پێویست ناکات پەنا ببرێتە بەر خواست ورای خەڵك.

واتە ئەگەر وا دابنێین گشت توانا کۆمەڵایەتی وسیاسییەکان مۆلکی خواوەندن وخواوەند لەهەر سەردەمێکدا بەکەسێکی تایبەتی سپاردوون, بۆیە دەستەوەردان لەکایەی گشتی بەبێ رەزامەندی پێشووتر یان بەبێ رێگە پێدان دواتری خواوەند دەستەبەسەرداگرتنە. کەواتە ئەگەر ئەمە دەستەبەسەرداگرتن بێ, ئەنجامدانی هەر جۆرە کارێکی سیاسی وکۆمەڵایەتی لەلایەن خەڵکەوە بەدەستێوەردان لەکایەیەکی تر دەژمێردرێ, وەکو رووبەڕووی ئەو کەسە ببمەوە. لەم روانگەیەدا, پەنا بردنە بەر ویست ورەزامەندیی خەڵك وەکو ((اکل میتة))یە, بۆ ئەوەی دوژمنانی ئیسلام, ئایین بە ئیستبداد تاوانبار نەکەن. سێیەم, مافی مرۆڤ لەم فیکرەدا جێگەی نابێتەوە. نەك تەنیا لە بابەتی سیاسیدا, بەڵکو بەلەبەرچاوگرتنی حیکمەتی خواوەندو بەلەبەرچاوگرتنی ئەو ئەرکانەی کە خواوەند بۆ مرۆڤی داناوە مافی مرۆڤ لە هیچ بوارێکدا نییە. ماف هەر ئەوەیە کە لە ئەرکی یەزدانەوە هەڵدێنجرێ وئەم مافانە هەموویان لە ئەحکامی

[ئاییندا ]هەن. ئەوەی بۆ مرۆڤ باشە لەو ئەحکامانەدا پیشبینی کراون وئەگەر ئێمە هەمان ئەرکی فیقهیی باو پیادە بکەین پێویستمان بەمافی مرۆڤ هەر نییە. ئاشکرایە کە لەدەقە ئایینییەکانماندا ئاماژە بەهەندێ ماف نەکراوە وئەم مافە بەم دواییانە لەلایەن مرۆڤی هاوچەرخەوە بایەخی پێدراوە. بۆیە ئەم ئەرکانە لە کەشوهەوایەکدا دارێژراون کە ئەم مافانە هەرنەبوونە. بۆیە ئەگەر مافەکان ژێرپێ بخرێن, ئەو کەسانە سەغلەت نابن, چونکە بەرای ئەوانەوە هیچ ئەرکێك ژێر پێ نەخراوە.

چوارەم, ئەو کەسانە لەبواری سیاسەتدا کاروبارە ناپیرۆزەکان پیرۆز دەکەن. ئەم بەپیرۆزکردنانە چەندین گرفتی کۆمەلایەتی دێننە کایەوە, چونکە دەبێتە هۆی فراوانبوونی لەرادەبەدەری بازنەی کاروباری پیرۆز لە کایەی کاروبارە گشتی وکۆمەلایەتی ودنیەوییەکاندا وکاتێك شتەکان بەپیرۆز دەکرێن, چیتر ناتوانین رەخنەی لێبگرین. لەدەستدانی رەخنە, چەندین گرفتی کۆمەلایەتی دێنێتە بەرهەم.

پێنجەم, لەلای سیاسی وتوندوتیژکاراندا, ((ئازادی)) پێگەیەکی ئەوتۆی نییە. لەسەردەمی مەشروتەدا, زانایان باسی ((وشەی شوومی ئازادی)) یان ((پەیڤی پێنرخی سەربەستی))یان دەکرد و هەلبەتە ئەمە پەیوەندی بە سەردەمی مەشروتەوە نییە. ئەمانە ئازادی بەدیاردەیەکی شەیتانی وبەرهەمی کولتووری بێبەهای رۆژئاوا لەقەلەم دەدەن.

*** کام بونیادی سیاسی وکۆمەلایەتی وکام روانگەی مێژوویی ـ کولتووری بەرهەمهێنەری توندوتیژییە؟**

موجتەهید شەبستەری: نازانم ئەوەی دەمەوێ بیلێم تا چەند پەیوەندی بە پرسیارەکەی ئێوەوە دەبێ, بەلام بڕوام وایە پێداگرتن لەسەر بونیادی سیاسی وکۆمەلایەتیی رابردوو وهەولنەدان بۆ گۆڕینی, توندوتیژی بەرهەم دێنێ. لە ماوەی

سەدەکانی رابردوودا بونیادێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی تایبەت لە کۆمەڵگای ئێمەدا سەربهەڵداوە کە کولتووری سیاسیش لەگەڵیدا گونجاوە. چونکە لە دنیای ئەمڕۆدا کۆمەڵگا بەبێ بەشداریکردنی هەموو لایەك لەگشت هەوڵە سیاسی وناسیاسییەکان سەرناکەوێ. لەژیانی کێبرکێیانەی دنیای ئێستادا کە پەرەسەندن وپێشکەوتن لە گرنگترین ئامانجەکانییەتی ژیان بەبێ چالاکبوون وبنیاتنەربوون وسەرچاوەی کاریگەربوونی توێژ وتاکە کەسە جیاجیاکانی کۆمەڵگا, هەڵناسووڕێ. پێویستە لە کۆمەڵگادا هەلومەرج بڕەخسێ بۆ ئەوەی تاکەکەسان بە ئاستێکی بەرزی پێشکەوتنی مادی ومەعنەوی بگەن. بەڵام خاڵی گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە ئەم جۆرە ژیانە تەنیا لەژێر سایەی سیستەمی سیاسییە دیموکراتییەکاندا دەبێ. واتە تەنیا لەسیستەمی سیاسییە دیموکراتییەکاندا دەکرێ تاکە کەسانی کۆمەڵگایەك بەئاستێکی بالآی بنیاتنان بگەیەنرێن. لەکۆمەڵگایەکی ئەوتۆدا تاکەکەسان دەتوانن لە ئاستێکی بالآی توانا و لێهاتوویی بەهرەمەند بن" ئەم پرۆسەیە لەسایەی نونیادە دیموکراتییەکاندا دێتە کایەوە. بەڵام بونیادی سیاسی وکۆمەڵایەتی و کولتووریی رابردوومان بە هیچ شێوەیەك دیموکراتیانە نەبووە بونیادەکردنی رابردوومان شێوەی جیاجیایان هەبووە, بەڵام لایەنی هاوبەشی ئەم بونیادانە, ملکەچبوون بۆ لەخۆ بەرەوژوورتر و مەرجە جیاجیاکانی دەسەڵات بووە, بەشێوەیەك کە ناسنامە وکەسایەتیی مرۆڤەکان لە پەیوەندی بەکەسایەتییەکانی سەرەوەتر لەخۆی ناسراوەتەوە. بەشداریکردن لە دەسەڵات وبڕیاردانەکاندا نەبووە ومرۆڤ وەك بونەوەرێك نەدەناسرا کە دەستنیشانکەری چارەنووسە وهەڵدەبژێرێ. هەر لە بنەڕەتدا لەو سەردەم ئەو بنەما وپرەنسیپانە لە هیچ شوێنێکی دنیادا لە ئارادا نەبووە. ئەمڕۆ پێداگرتن لەسەر هێشتنەوەی ئەو بونیادە سیاسی وکۆمەڵایەتییە دەبێتە هۆی وەستان وسەرکوتکردنی داهێنەریتی مرۆڤەکان. لەکاتێکدا کە واقعی ژیان وئەم رەوتی کێبرکێی جیهانییە بۆ پەرەسەندنی مەعنەوی ومادیی هەمیشەیی کە کۆمەڵگا ئیسلامییەکانیش دەگرێتەوە, جۆرە ژیانێکی تر دەخوازێت, پێداگرتن لەسەرپاراستنی ئەو بونیادە سیاسی و کۆمەڵایەتییە لەبەر ئەوە توندوتیژیی

لێدەکەوێتەوە چونکە پێداویستییە مادی ومەعنەوییەکانی مرۆڤ دابین نابن, وهەندێکیش هێشتا رێ لە پەرەسەندنی مەعنەوی ومادی دەگرن. ئەم کۆمەڵگایانە, خاوەنی یەك کولتوور نین.

واتە لەهەمان کات کە بونیادی کۆمەلایەتی وسیاسی رابردوو بەسەریاندا زاڵە, بەشێك وکۆمەڵێکی تر لەم کۆمەڵگا موسڵمانانەدا هاتوونەتە بوون کە داوای جۆرێکی تری ژیان وچالاکی وداهێنان دەکەن, ئەو گرووپ وهێزانەی کە لەدەیەکانی دواییدا لە کۆمەڵگا موسڵمانەکاندا هاتوونەتە مەیدانەوە, جۆرە ژیانێکی نوێیان گەرەکە, لەکاتێکدا کە بونیادی کۆمەلایەتیی رابردوو جۆرە ژیانێکی تر برەوپێبدات لەئەنجامدا وتووێژ لە نێوان ئەواندا دروست نابێ وپێکدادان دێتە ئاراوە. هەم لەناو کۆی کۆمەڵگا وهەم لەناو ئەم گرووپانەدا گرفت پەیدا دەبێ وتوندوتیژی دێتە ئاراوە. ئەم بونیادە سیاسی - کۆمەلایەتی وکولتوورە سیاسییە زاڵەی ناو کۆمەڵگا موسڵمانەکانی درێژبووەوەی هەمان ژیانی سیاسی رابردووە. واتە لەسەردەمی خەلافەتی خەلیفەکانی راشدین تا خەلافەتی خەلیفەکانی ئەمەوی وعەبباسی وتا سەڵتەنەت ونیمچە سەڵتەنەتەکانی دواتر, چوارچێوە سەرەکییەکان نەگۆڕاون. لەو بونیادە کۆمەلایەتی وسیاسییەدا مافی مرۆڤی هاوچەرخ وبەشداریکردن وئازادی ویەکسانی بەمانای ئەمڕۆی نەبووە. بۆ نموونە بەیعەت لەسەردەمی خەلیفەکانی راشدین وئەمەوی وعەبباسیدا هەبووە, بەلام لە بەیعەتدا هەرگیز بەشداریکردنی کۆمەلایەتی وسیاسی بەمانا ئەمڕۆییەکەی نەبووە. بەهیچ شێوەیەك هەموو خەڵك لە بڕیاردانەدا دەوریان نەبووە. بەلانی زۆرەوە چەند سەربژاردەیەك دەوریان هەبووە وکاتێك بەیعەتیشیان دەکرد نەیاندەتوانی هەڵی وەشێننەوە, ئازادی سیاسی لەسەردەمی خەلیفەکانی راشدیندا هەبوو, بەلام ئەویش تەنیا بەو مانایەی کە خەڵك دەیانتوانی رەخنە لە حاکم بگرن. ئەمەش بەسترابۆوە بە ویژدان و دادگەریی حاکمەوە کە گوێ لەرەخنەکانی بگرێت یان نە, بەلام ئایا ئازادبوونی رەخنە بەمانای بەشداریکردنی بڕیاردەرانەیە لە رەهەندەکانی ژیانی سیاسیدا؟ ئایا ئەمە هەمان ئەو ئازادییە سیاسی وکۆمەلایەتییەیە کە لە دەستووری ئەمڕۆدا هەیە؟ هەرگیز

بەو مانایە نییە. ئازادیی سیاسی بەمانا ئەمڕۆیەکەی لەگەڵ سیاسەتدا مانای دەبێ کە کارێکی بەرنامە ڕێژیی بەکۆمەڵە. لەسەدەکانی رابردوودا کە سیاسەت بەو مانایە لەئارادا نەبوو چۆن دەشێ ئازادییە سیاسییەکانی ئەمڕۆ بەدی بکەین. گەڕانەوە بۆ بابەتی ئیمامەت لەکەلامناسی وفیقهی ئیسلامدا دەریدەخات کە بازنەی سیاسەت چەندە سنووردار بووە.

بەغدادی لە کتێبی (الفرق ین الفرق)دا دەنووسێت: ((ئەرکەکانی ئیمام بریتین لە دانانی قازییەکان, پاراستنی سنوورەکان و دابەشکردنی دەستەیی توێژالی (فۆیی). زانایانی تریش بەکەمێك جیاوازییەوە هەمان ئەو شتەیان وتۆتەوە" لە سەردەمەدا سنووری ئەرکەکانی ئیمام هەمان سنووری سیاسەت بووە. بەرای من یەکێك لەو هەڵەو چەوتانەی لەکۆمەڵگای ئێمەدا دەکرێ ئەوەیە کە ناسنامەی ئازادیی رەخنەگرتن لە حاکم لە سەرەتای ئیسلامدا یەکسان دەکەن بەو ئازادییە سیاسی وکۆمەڵایەتیانەی کەلە دنیای ئەمڕۆدا هەن. بەهیچ شێوەیەك ناتوانین بڵێین لەبەر ئەوەی رەخنەگرتن لەفەرمانڕەوا لە سەردەمێکدا هەبووە, کەواتە دەق ونەریت وریڕەوی ئیسلامی ئازادییە سیاسی وکۆمەڵایەتییەکانی ئەمڕۆی دامەزراندووە یان پشتگیریی لێ کردووە. لەرابردوودا ئەو کەسەی کە لە لوتکەی بونیادی سیاسی وکۆمەڵایەتیدا بووە هەندێجار ستەمکار بووە هەندێجاریش دادپەروەر, هەندێجار ڕێگەی داوە رەخنەی لێ بگرن و هەندێجار ڕێگەی نەداوە. ئەمە تەواو جیاوازە لە ئازادی سیاسی وکۆمەڵایەتی وبەشداریکردن لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگادا. پێداگرتن لەسەر ئەوەی چەمکە سیاسییەکانی ئەمڕۆ لە دەقە ئایینییەکانی رابردوومان یان لە ڕێڕەوی نەریتی رابردوودا هەبووینە, نەك تەنیا گرفتەکانی ئەمڕۆمان چارەسەر ناکات, بەڵکو چەندین بەرامبەر گەورەتر دەکات. ڕێگەی راست ئەوەیە کە ئێمەی موسڵمان ئەو پرسیارە بخەینە ڕوو کە دەبێ چ پەیوەندییەك لەگەڵ زانست وچەمکە سیاسییەکانی ئەم سەردەمەدا ببەستین کە بەبێ ئەوان ناتوانین بژین؟ ئایا ئیمانی ئایینمان ڕێگەمان پێ دەدات ئەم چەمکانە قبوڵ بکەین و ڕوو لەو زانستانە بکەین یان نە؟ وەڵامی ئایینیانەی ئەم پرسیارە تەواو ئیجابیە.

سەبارەت بەوەی کە بەرێز کەدیوەر باسی کرد, پێویستە چەند شتێك بڵێم. بەرای من تەنانەت ئەگەر بۆچوون سەبارەت بە خوا, مرۆڤ, دنیا وهتد... یش بگۆڕێت, تا هەندێ کێشەی سیاسی بنەرەتی چارەسەر نەکەین, دەردمان دەرمان نابێ. واتە لەوانەیە گۆڕانی ئەم بۆچوونانە لە فەلسەفە یان لەکەلامناسیدا گونجاو بێت و بتوانین بۆچوونێکی مەعقوڵتر لەرابردوو سەبارەت بە خواوەند یان گشت چەمکە ئاینییەکانی تر بخەنەڕوو, بەڵام لە گۆشەنیگای باسەکەی ئێمەوە واتە توندوتیژی, هیچ گرفتێك چارەسەر نابێ. ئێمە دەبێ بونیادی سیاسی و کۆمەڵایەتی رابردوو لە رەنگێکی دینی وکەلامناسیشی بەخۆوە گرتووە, بگۆڕین وپەنا بەرینە بەر بونیادێکی سیاسی - کۆمەڵایەتی وکولتووری سیاسی وکۆمەڵایەتی دیموکراتیك ناوی دەبن. هەڵبەت, ئەگەر بمانەوێ دەست لە بونیادی سیاسی وکۆمەڵایەتیی رابردوو هەڵگرین پێویستە دەست لە بنەمای فیقهی, کەلامی وئەپستمۆلۆژیەش هەڵگرین کە لەگەڵ ئەودا هەبوونە. پرسیاری سەرەکی ئەوەیە کە ئایا ئێمەی موسڵمان دەتوانین لە روانگەی پەیمانەوە سەیری ژیانی دنیەوی خۆمان بکەین؟ ئایا بیرکردنەوەی ئایینمان رێگەمان دەدات ئەم روانگەیەمان هەبێ؟ ئایا دەتوانین ژیان وەکو پەیمانێك سەیر بکەین کە چەند کەسێك لە کاتی دامەزراندنی کۆمپانیایەکی هاوبەش لەگەڵ یەکتردا دەیبەستن؟ ئایا ئامادەین لە روانگەی فیکری ئایینییەوە قبوڵ بکەین کە دەمانەوێ سیستمێکی کۆمەڵایەتی بەلێپرسراوێتی خۆ و وەك مرۆڤی سەربەخۆ بهێنینە کایەوە؟ ئایا دەتوانین بڵێین دەمانەوێ سیستمێکی کۆمەڵایەتی لەسەر بناغەی دادگەری ومافی مرۆڤ بەلێکدانەوەی فەلسەفییەوە بهێنینە دی؟ ئێستا دوو رەوت لەگەڵ یەکتردا لەدەستەویەخەدان. بەگوێرەی بیرکردنەوەی رەوتێکیان دەتوانین ودەبێ بناغەکانی بونیادی کۆمەڵایەتی وسیاسی لەسەر بنەمای دادگەرییەك لە قورئان وسوننەتەوە وەرگیرابێ هیچ مانایەکی نییە وبناغەی سیستمی کۆمەڵایەتی دەبێ لەسەر بناغەی تەفسیری عەقڵانی بۆ دادگەری ومافی مرۆڤ دابمەزرابێ. ئەم باسە, مشتومرێکی زۆر دەخولقێنێ" بۆ نموونە چ کێشە گەلێك لە دادگەری‌ومافی مرۆڤ جیادەبنەوە وئازادییە سیاسی - کۆمەڵایەتییەکان, بەگوێرەی

چـەمکی دادگـەریی کۆمەڵایـەتی ومـافی مـرۆڤ, چـین وچ واتایـەکیان هەیـە؟ ئـازادی لەچوارچێوەی دادگەریدا چییە؟ هتد... ئەو کەسانەی دەیانەوێ سیستمی کۆمەڵایەتیی خۆیان لەسەر ئەو بنەمایە دابڕێژن, بێگومان بیروباوەڕە ئایینییـەکانی خۆیـان لەبەرچـاو دەگرن.

*** بۆچی بونیادە نەریتییە نادیموکراتییـەکان توندوتیـژیان بەرهـەمهێناوە؟ ئایا نەرتی بونیان یان نادیموکراتیك بوونیان, یـاخود هـەردوو تایبەتمەنـدی توندوتیژیان لێ دەکەوێتەوە؟.**

**موجتەهید شەبستەری:** پێویسـتە دوو کێشـە لەیـەکتر جیابکەینـەوە. کێشـەیەکیان ئەوەیە کە ئایا بونیادە سیاسی وکۆمەڵایەتییەکانی سەردەمانی رابردوومان توندوتیـژیان بەرهەمهێناوە یان نـە؟ کێشـەکەی تـر ئەوەیـە کـە ئایا کۆمـەڵگا ئیسـلامییەکان ئیسـتا رووبـەڕووی توندوتیـژی وەسـتاونەتەوە؟ مـن ئیشـم بەبابـەتی دووەم هەیـە و پـێم وایـە پێـداگرتن لەسـەر هێشـتنەوەی ئـەو بونیادانـە لـە ئێسـتادا توندوتیـژی لێدەکەوێتـەوە. ئێـداگرتن لـە پاراسـتنیان لـە دنیـای ئـەمڕۆدا ورێگـرتن لـە گـۆڕانی بونیـادە سیاسـی وکۆمەڵایەتییەکانمان بۆ بونیادە گەلێکی دیموکراتیك, ئەمڕۆ توندوتیـژی لێدەکەوێتـەوە, چونکە ئەو داهێنەریتییەی کـە پێویسـتییەکی ژیـانی دنیـای ئەمڕۆیـە تـەنیا لـە بونیـادە دیموکراتیەکاندا دێتە کایەوە. ئەمڕۆ چ قبوڵ بکەین یـان نـە, چـەندین هێـزی مرۆیـی لـە کۆمەڵگا موسڵمانەکاندا بەتایبـەت کۆمـەڵگای ئێمـەدا بڵاوبوونەتـەوە وکەسـیش ناتوانـێ کۆنترۆڵیان بکات وکۆمەڵگا ئیسلامییەکان دەبـێ دایـنـان پێـدا بـنێن. ئێسـتا ئـەو گرفتـە گەورەیەی کـە رووبـەڕووی دەبینـەوە ئەوەیـە کـە ((چـۆن ئـەم بابەتـە لەگـەڵ سیسـتی بەهایماندا کۆدەکرێتەوە ودەبێ بە چ تـەگبیرێك بکـەین)). بەڵام بوونی گرفت نابـێ وامـان لێبکات چاومان دابخەین وهێزە ئازادبووەکان نەبینین و هەر نەزانین ئێمە لە چ دنیایەکدا دەژین و پێ لەسەر هەمان بونیادە کۆمەڵایـەتی وسیاسـییەکانی رابـردوو دابگـرین. ئـەم پێداگرتنە گرفتەکە خەستتر دەکاتـەوە وتوندوتیژییـەکی گـەورە دەخوڵقێنـێ. گرفتەکـە

ئەو کاتە چارەسەر دەبێ کە بەچاوێکی کراوەوە رووبەڕووی واقیع ببینەوە و ریسك بدەین. بەبێ ریسك دان ناتوانین گرفتەکان چارەسەر بکەین. ژیانی ئەمڕۆ, سەرتاسەر ریسك دانە.

مو حسین کەدیوەر: ئەگەر بەراستی لێی تێگەیشتبم, بەرێز موجتەهید شەبستەری بونیادی سیاسی بەرهەمهێنەری توندوتیژیی بەو بونیادە داناوە کە پێ لەسەر پاراستنی رابردوو دادەگرێ" واتە لە راستیدا پێداگرتن لەسەر پاراستنی بونیادێك کە سەردەمە مێژووییەکەی بەسەرچووە, دەشێ زەمینەخۆشکەری توندوتیژی بێت. وێڕای قبوڵکردنی خاڵی سەرەکیی باسەکەیان دەبێ بڵێم کە بەرای من هەر بونیادێکی سیاسیی مێژوو کە لەسەر رابردوو دەژین مەرج نییە توندوتیژی بەرهەم بێنێت. ئەم بونیادە لەو کۆمەڵگایەدا توندوتیژی بەرهەم دێنێ کە خەڵکەکەی لەگەڵ بونیادە سیاسییەکەیدا نەگونجێن. واتە خەڵك هەنگاوێك لە پێشەوەی حکومەت بن و گۆڕانیان بەسەردا هاتبێ و بەو بونیادە سیاسییە قایل نەبن. ئەگەر کۆمەڵگایەك وەرگرین کە خەڵکەکەشی وەکو حکومەت, دواکەوتبن, مەرج نییە لەم کۆمەڵگایەدا توندوتیژی بێتە بەرهەم, چونکە جۆرە گونجانێك لەنێوان فەرمانڕەوایی وجەماوەری خەڵکدا هەیە وخەڵك بە بونیادی سیاسی دواکەوتووی خۆیان رازین. بەم شێوەیە, من یەکێك لەهۆیەکانی سەرهەڵدانی توندوتیژی لە کۆمەڵگادا بۆ نەگونجان وناتەبایی زۆرینەی خەڵك وبونیادی سیاسی دەگێڕمەوە. ئەگەر بونیادی نادیموکراتیك لە کۆمەڵگایەکدا هەبێ کە خەڵکەکەی پاسیڤانە قبوڵی بکەن وبەراستی بزانن, واتە رازی بووبن بەوەی کە سیستەمی حکومەتکردن هەر ئەوەیە, لەو حاتەدا حکومەت هیچ پێویستی بە پیادەکردنی توندوتیژی نابێ, چونکە خەڵك مولکەچی فەرمانەکانی حکومەتن. گرفت لەو کۆمەڵگایەدا سەرهەڵدەدات کە جەماوەرەکەی جۆرە هۆشیارییەکیان هەبێ وبەتایبەت سەربژاردەی کۆمەڵایەتی بە ئاستێکی هۆشیاری ئەوتۆ گەیشتبن کە قەناعەتیان کردبێ بەناکۆکی بونیادە سیاسییەکان ونەهاتبن بەتەنگ پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمەوە. لەو حالەتەدا فەرمانڕەوایەك کە پەیوەندی بە رابردووەوە هەیە, واتە

لەرووی سیاسییەوە توانای بەنگەوە هاتنی نییە, بۆ درێژەدان بەدەسەلاتە سیاسییەکەی جگە لەپیدەکردنی توندوتیژی وپەنابردنە بەرهێز هیچ چارەیەکی دیکەی نییە. بەلام ئەو پرسیارەی خستیانە ڕوو, ئەوە بوو کە ئایا لە روانگەی ئایینەوە ئامادەین بونیادی سیاسی رابردووی خۆمان بگۆڕین وپەنا بەرینە بەر بونیادێکی سیاسی نوێ ودیموکراتیك یا نە؟ واتە ئایا ئامادەین دەست لەبنەمای کەلامناسی, فیقهی وئەپستمۆلۆژیی بونیادی کۆن هەلگرین یان نە؟ وەلامی من ئەرێیە, بەلام لەم رێگەیەدا ئاستەنگ هەیە. یەکەمیان دەست گرتن بەنموونە چاکەکانی سەرەتای ئیسلام" نموونە گەلێك چاکی ئەوتۆ کە بەچاوێکی پیرۆزی تایبەتەوە سەیری دەکەن. ئایا ئەمە ناچارمان دەکات لە قالبێکی تایبەتدا گیر بمینین؟ من پێم وایە لەوانەیە هەندێ کەس ئەم زەروورەتە ببینن بەلام پەیرەوی کردن لە نموونە چاکەکان مەرج نییە قالبێکی تایبەتمان بەسەردا بسەپێنێ. واتە راستە ئەوان شێوەیەکی تایبەت لەحکومەتکردندا بەکاردێنن وئەحکامی تایبەتیان هەبووە, سەرمەشقبوونیان بۆ ئێمە لەئاستە شتە گشتی وبنچینییەکان نەك لەشتە لاوەکیەکان وئەو کێشانەی لەژێر کاریگەری سەردەم دان. ئەگەر پێغەمبەر ئەمرۆ بنێردرایە, بێگومان شێوەیەکیان دەگرتە بەر کەسەرەرای پاراستنی هەندێ بنچینەو جیاوازە دەبوو لە شێوەی هەزاروچوارسەد سال پێش خۆی. هیچ بەلگەیەکی فیقهی وکەلامیمان لەبەردەستدا نییە کە بیسەلمێنێ ئەگەر ئەوانەی پێشتر ئەمرۆ حکومەتیان بکردایە, دەقاودەق وەکو چەندین سەدە پێش حکومەتیان دەکرد. ئەگەر بمانەوێ بەگوێرەی قورئان وسوننەت کاربکەین, دەبێ چەند بنچینەیەکی گشتی وەکو پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ وپەیرەویکردن لە دادگەری ویەکسانی وهەروەها نابێ ناموسلمان حوکمی کۆمەلگای ئیسلامی بکات وچەند شتێکی لەم شێوەیە, رەچاو بکرێن ولەشتەکانی تردا هیچ رێگەیەك نییە جگە لەوەی کە بگەڕێنینەوە بۆاری گشتی و پەیمانی کۆمەلایەتی بەو مەرجەی کە لەگەل موحەرەمانە شەرعیەکاندا ناکۆك نەبێ. جگە لەوەی هیچ شتێکی تر نییە کە لە رووی ئایینەوە پێویست بێت. کەواتە عەقلی بەکۆمەلی موسلمانان حوکم دەکات وئەوەی بەبەرژەوەندی

بزانێت (هەڵبەت بەو مەرجەی کە پێچەوانەی ئەحکامی ئایینی نەبێت) ڕێگەی ئەنجامدانی دەدات, مەگەر جگە لەوە دەتوانین کۆمەڵگا بەڕێوەبەرین وناوی ئایینیشی لێ بنێین. ئەگەر لە شێوەی پەیوەندیی پێغەمبەر (د.خ) و عەلی (س) لەگەڵ کۆمەڵگادا وردبینەوە, نابێ لەبیری کەین کە ئەم دوو کەسە پیرۆزانە دووخەسڵەتیان هەبوو کە ئەمرۆ هیچیان نین. یەکەم مەعسومیەت (بێ گوناهی) و ئەوی تریان زانستی غەیب بوو. با وادابنێین ئەوساش ڕێگەیەکی تایبەت بەکارهێنراوە, بەڵام کەسێ ئەم خەسڵەتانەی نییە مافی ئەوەی نییە بەو شێوازانە کۆمەڵگا بەڕێوە ببات. خەڵکی ئاسایی لەسەردەمی ئامادەنەبوونی ئیمامدا (غەیبە) جگە لە گەڕانەوە بۆ عەقڵی بەکۆمەڵ هیچ ڕێگەیەکی تریان نییە کە بەهۆیەوە ئیدارەی کۆمەڵگای پێ بکەن. ئەگەر کەسێ بڕوای وابێ کە نموونەیەك ماوە بۆبەڕێوەبردنی کۆمەڵگاو لەڕووی شەرعییەوە پێویستە گوێڕایەڵی ئەو نموونەیە بین, دەبێ بەڵگەی خۆی بدا بەدەستەوە. من دوای پشکنین بەو ئەنجامە گەیشتم کە هیچ نموونەیەکمان نییە کە لەسەدەمی ئامادەنەبوونی ئیمامدا ئیدارەی کۆمەڵگای پێ بکەین.

بەڵام سەبارەت بە پرسیارە سەرەکی ئێوە, واتە ((کام بونیادی سیاسی بەرهەمهێنەری توندوتیژییە؟)) پێویستە بڵێم ئەگەر بونیادێکی سیاسی ئەم خەسڵەتانەی تێدا بێ, بێگومان توندوتیژیی لێدەکەوێتەوە. گرنگترین هۆکاری توندوتیژی ئەوەیە کە حکومەت لە خەڵکەوە سەرچاوەی نەگرتبێ. ئەم سەرچاوە گرتنە لە خەڵك تەنیا مەرجێکی دروستبوونی نییە, بەڵکو مەرجی مانەوەشیەتی. بەدەستەواژەیەکی تر ئەگەر هەڵوێستی حکومەت لەگەڵ هەڵەێستی زۆرینەی خەڵك نەگونجێ, توندوتیژی دەبێتە شتێکی حەتمی, هەندێ جار لەوانەیە حکومەتێك لەخەڵکەوە سەرچاوەی گرتبێ, بەڵام لەمانەوەشدا پێویستە پشت بەخواست و ڕای خەڵك ناچاربن خواست و ئارەزووی فەرمانڕەوایان دابین بکەن. لەهەندێ کۆمەڵگادا وارادەگەیەنرێ کە دەبێ خەڵك خۆیان لەگەڵ فەرمانڕەوایاندا بگونجێنن, لەکاتێکدا کە لەڕاستیدا دەبێ کاربەدەستانی حکومەت خۆیان لەگەڵ خەڵکدا بگونجێنن.

خاڵی دووەم ئەوەیە کە نابێ حکومەت خۆی بەخاوەنی مەئموریەتێکی تایبەت لەلایەن خواوەندەوە دابنێ. واتە ئەگەر قبووڵ بکەین کە نموونەیەکی تایبەت بۆ سەردەمی ئامادەنەبوونی ئیمام لەئارادا نییە, ئیتر کەس خاوەنی مەئمورەتێکی تایبەت نابێ بۆ رێنماییکردنی کۆمەڵگاو لە کاتێکدا ئەوانی تر لێی بێ بەش بن. ئەگەر کەسێك یان گرووپێکی تایبەت بڕوایان وابێ کە مەئموریەتێکی تایبەتی لەلایەن خواوەندەوە پێ سپێردراوە, ئەوا گرفتێکی گەورە لەکۆمەڵگا دێتەکایەوە.

خاڵی سێیەم ئەوەیە کە ئەو حکومەتانەی دیکتاتۆری وچەقبەستوو بە شێوازی ئۆتۆکراسین جۆرە توندوتیژییەك بەرهەم دێنن. چونکە لە حکومەتی دیکتاتۆری وپشتەستوودا, بەشێوەیەکی سروشتی چەقبەستنی دەسەلات سەرهەلدەدات.

خاڵێکی تر ئەوە کە ئەگەر لە کۆمەڵگایەکدا جۆرە ململانێیەکی چینایەتی وئاپارتایدی سیاسی کولتووری وکۆمەلایەتی هەبێ توندوتیژی دێتەکایەوە. بەدوربڕینێکی دی, ئەگەر هەموو خەلك وهاووڵاتیان یەکسان نەبن, واتە هەندێ هاووڵاتیی پلەیەك وهەندێکی تر هاووڵاتیی پلە دوو بن, بێگومان پەنا دەبەنە بەر توندوتیژی. واتە ئاپارتایدی سیاسی توندوتیژی لێدەکەوێتەوە وبڕوانەبوون بەیەکسانیی سیاسی بەتایبەت ئەگەر ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەڕوانگەیەکەوە بە هاووڵاتیی پلە دوو دادەنرێن زۆربن وئەوانەی دەسەلاتیان بەدەستە کەمینە بن, بەزۆری گێروگرفت سەرهەلدەدات.

خاڵێکی تر ئەوەیە کە ئەگەر لە کۆمەڵگایەکدا دەسەلات دەوری نەبێت, بەدەربڕینێکی تر ئەگەر لوتکەی هەرەچی دەسەلاتی سیاسی هەتا هەتایی بێت, گەندەڵی سەرهەلدەدات. چونکە دەوری بوون ودەستاو دەستکردنی فەرمانڕەوایی ودەسەلاتی سیاسی, رێ لەگەندەلبوون دەگرێ, کاتێك فەرمانڕەوایی بەردەوام وبێ پسانەوە بێ, دواجار ناچار پەنا دەباتە بەر شێوازە توندوتیژەکان.

خاڵێکی تر, کۆنترۆڵ نەکرا وبەرپرسیارانەبوونە. ئەگەر لەکۆمەڵگایەکدا ئازادییە سیاسییەکان, ئازادیی مەشق وئەو ئازادیانەی کە جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤدا

هاتووە، رەچاونەکرێ، بێگومان توندوتیژی سەرهەڵدەدات. مەبەست لە ئازادی ئەوەیە کە تاکە کەسان هەموو ئەو ئازادییانەی کە جارنامەی جیهانیی مافی مرۆڤدا هاتووە لە رەهەندە سیاسییەکەیدا هەیانبێ. کەواتە پێویستە خەڵك چاودێر بن بەسەر حکومەتەوە وڕێگەیان پێ بدرێ لە حکومەت بپسنەوە. لە کۆمەڵگایەکدا کە جیاوازی بیروڕا لەگەڵ حکومەتدا دابنرێ و مەرکەزی کردەی سیاسی ((دوژمن)) بێ، واتە بڕوایان وابێ کە ((دوژمنایەتیم دەکەن کەواتە هەم))، توندوتیژی شتێکی حەتمییە. ئەگەر لە کۆمەڵگایەکدا کەمینە لە دەسەڵات بن و لەرووی ئایینیشەوە سەرتاپا گیرخوازبن، ئەو کەمینە سەرتاپا گیرخوازە جگە لە توندوتیژی پەنا ناباتە بەر هیچی تر. چونکە ئەگەر ئەم کەمینە بیەوێ بۆ رای زۆرینە بگەڕێتەوە دەبێ مەیدان چۆڵ بکات و لەبەر ئەوەی نایەوێ دەست هەڵگرێ، بۆ پاراستنی خۆی پەنا دەباتە بەر پیادەکردنی توندوتیژی.

خاڵێکی تر ئەوەیە ئەگەر لە حکومەتدا کە داوا لە خەڵك دەکرێ ملکەچ بن، واتە هەرگیز رێگەیان پێ نەدرێ کە مافێکی یاسایی خۆیانە نەیاری حکومەت بن و بەمیزاجێك رازی نەبن وبتوانن حیزب پێکبێنن و لە چوارچێوەی یاسادا بەرامبەر بە گشت بەشەکانی دەسەڵات بوەستن، جگە لە رووبەڕووبوونەوەی توندوتیژانە لەگەڵ تاکە کەسان چارەیەکی تر نییە.

بەهەر حاڵ، وەڵامی ئەو پرسیارەی کە ((ئایا بونیادی دەسەڵاتی سیاسی لەکۆمەڵگایەکدا تەئسیری هەیە لە دروستبوون وبرەوسەندی خوێندنەوەی توندوتیژکاری بۆ ئایین؟)) لەسەدا سەد ئیجابییە. ئایین لەبواری سیاسەتدا زیاتر کێشەکانی بۆ عەقڵی مرۆڤ بەجێ هێشتووە وتەنیا پرنسیپە گشتییەکانی خستۆتە ڕوو. ئەوەی لە بوارە سیاسی وکۆمەڵایەتییەکاندا ناوی ئایینی لێ نراوە، زیاتر شتی عورفی وپێشگریمانی زانایانی ئایینین، نەك خۆدی دەقی ئایینی بن. کەواتە ئاشکرایە ئەگەر فەرمانڕەوایی ئایینی خاوەنی بونیادێکی دەسەڵاتی خودان ئەم تایبەتمەندیانە بێت، ئەو خوێندنەوە ئایینییەی برەوی پێ دەدات، توندوتیژکارانەیە. بۆیە بەگوێرەی وتەی خوالێخۆشبوو ((نائینی)) کە دەیگوت گەورەترین وترسناکترین ئیستبداد، ئیستبدادی ئایینییە، دەبێ

دان بەوەدا بنێین خوێندنەوەیەك كە ڕێگە بەو جۆرە بونیادە سیاسییە دەدات, بێگومان ترسناكترین شێوەی توندوتیژیی هەیە. چونكە توندوتیژی لە حكومەتە نائایینییەكاندا پشتیوانییەكی شەرعیی نییە, بەڵام لەم بونیادەدا ئەخلاق وشەرعیش دەبنە وەسیلەی دەسەڵاتی سیاسی. بۆیە تەنانەت لەوانەیە توندوتیژكاری بە ئەركێكی شەرعیش حیساب بكرێ.

ئێمە وای تێدەگەین كە بەرای ئێوە خوێندنەوە توندوتیژئامێزەكان بۆئایین, بەرهەمی جیهانی نەریتی وبیركردنەوەی نەریتی بووە, نەك لە خودی ئایینەوە سەرچاوەی گرتبێ. واتە ئەگەر ئێمە بەخودی ئاین, یان حەقیقەتی ئایین بگەین, ئەم توندوتیژانەمان تیایدا بەدی نەدەكرد. ئایا ئەم قسەیە راستە؟.

موجتەهید شەبستەری: وەڵامەكەی پەیوەندی هەیە بەئەوەوە كە چ تێگەیشتنێكمان بۆ ئایین هەیە. ئەگەر مەبەستەمان لە ئایین ئەوە بێ كە دیندارە سیاسییەكان لە ئایین تێدەگەن, وەڵام شتێكەو ئەگەر مەبەستمان لە ئایین, تێگەیشتنی بیرمەند یان كەلامناسێكی هاوچەرخ بێ بۆ ئایین, وەڵام شتێكی دیكەیە. لە تێگەیشتنی یەكەم دا, ئایین كۆمەڵێك واقعی عەقیدەیی, ئەخلاقی وكردەییە كە لە مێژوودا چەسپیوە. ئەگەر ئێمە ئەم تێگەیشتنە لەبەر چاوبگرین, هەندێ كردار كە ئەمڕۆ بە توندوتیژئامێز دادەنرێن, بەشێك بوونە لە ئایین. بەڵام ئەگەر جەوهەری ئایین لە قاوغی ئایین جیابكەینەوەو روانگەیەكی دیاردەناسانەمان بۆ ئایین هەبێ, وەڵاممان بۆئەو پرسیارە دەگۆڕێت. لەو حاڵەتەدا دەشێ یەكێك ئایین بە جۆرە رەفتارێك لەقەڵەم بدات, نەك كۆمەڵێك كردارو بیروباوەڕ وئەخلاقیات" لەوانەیە یەكێك بڵێت جۆرە ژیانێكی مەعنەوییە" جۆرە ژیانێك بەئاراستەی خواوەند. لەو جۆرە ژیانەدا تاكەكەس دەكەوێتە بارودۆخێكی ئیمانییەوە" ئاشكرایە ئەم تێگەیشتنە بۆ ئایین جیاوازە لە تێگەیشتنی باوی دیندارە نەریتییەكان بۆ ئایین. وەك چۆن ئایینی عارفە پلە یەكەكان لەگەڵ ئایینی كەلامناس وفیقهەكان جیاوازە. بەگوێرەی خوێندنەوەی نەریتی بۆ ئایین, ئایین كۆمەڵێك زانیارییە كە لەلایەن خواوەندەوە هاتووەو پێویستە بناغەی سیستمی كۆمەڵایەتیش

لەسەر ئەوە دابمەزرێ. لەخوێندنەوەی نەریتیدا, وەحی بریتییە لە دابەزینی کۆمەڵێك تەعبیرو زانیاریی دیاریکراو کە پێویستی بە تەفسیرو لێکدانەوە نییە. مرۆڤ کۆمەڵێك زانیاری بەخۆی وەدەستی دێنێ وهەندێك زانیاریش لەرێی‌وەحیەوە بۆی دەگوازرێتەوە. زانیارییە وەحیانییەکانیش دوو جۆرن: بەشێکیان عەقڵی مرۆڤ دەتوانێ وەری بگرێ وبەشەکەی تر لەسەرووی عەقڵی مرۆڤەوەیە. زانیارییە وەحیانییەکان, بیروباوەڕ وبەهاوکردارەکانمان رەنگرێز دەکەن. ئەم بیروبۆچوونە کە دەکەوێتە پێش تێگەیشتن لە دەقە وەحیەکانەوە و وەك پێش گریمان وپێشینە تێگەیشتنێك وایە بۆیان, پشت بە بنەمایەکی ئەپستمۆلۆژی وکەلامناسی تایبەت دەبەستێ. داکوکیکردن لەسەر ئەم تێگەیشتنە بۆ ئاین, بەچاوپۆشی لە ئیعتیبار یان بێ ئیعتیبارە فەلسەفیەکەی, گرفت بۆ واقیعی ژیانی نوێی مرۆڤ دەخولقێنێ. ئەگەر کۆمەڵگایەك بەم شێوەیە لە ئاین تێبگات, توانای مەعریفی وئیمانی وکردەیی هێنانەکایەی کۆمەڵگایەکی دیموکراتیکی نییە. ئەگەر کۆمەڵێك داکۆکی لەسەر ئەم تێگەیشتنە بۆ ئاین بکەن لەم سەردەمەدا, بەهۆی بێ تواناییان لە بوونی مروونەیی لەبەرامبەر واقیعەکانی دنیای هاوچەرخدا, بۆ ئاراستنی ئەوەی بە ئاینی لەقەڵەم دەدەن جگە لەئەنجامدانی توندوتیژی رێگەیەکی دیکە شك نابەن. ئەگەر تێگەیشتنێکی ئاوەهامان بۆ ئاین هەبێ, ناتوانین تەنیا بەئیجتهادکردنی لەشتە ناسەرەکیەکان (فروع) لە توندوتیژی رزگار ببین. هەڵبەت دەتوانین وەڵامی ئەم پرسیارە لە تاقیگەی مێژووش بکەین کە بەهۆی ئیجتهادی نوێوە لەلقەکان وبەبێ ئیجتهاد لەبنەماکان واتە بێ گۆڕانی تێڕوانین بۆ واتای ئاین وئیمان تا چەند زانایان توانیویانە پێش خواوەندن و وەحی بەمانای بەرزترین ئەزموونی مەعنەویی وئاینیی مرۆڤە کە ئاسۆی بوونی بەرفراوان دەکات ودەیخاتە بەرجەزبەی خواوەندەوە وبەبێ ئەوەی زەهەندی مەعریفە وئەزموونی مرۆیی تێك بدات مانایان پێ دەبەخشێ وچراپەك لەسەر رێگەی ژیانی کەسیی پێغەمبەر وئیمانداران دادەگیرسێنێ, ئەم ئاین ووەحیە دژی واقیعەکانی هیچ سەردەمێك نابیتەوە.

بە بۆچوونی بەڕێزتان، ئەزموونی ئەم دەساڵانەی دوایی لە ئێراندا ناتوانێ یارمەتیمان بدات لەم حوکمدانەدا، بۆ نموونە هەوڵی خوالێخۆشبوو نائینی بۆ وەرگرتنی هەندێ بونیادی سیاسی نوێ یان ئەو هەوڵانەی لەو بیست ساڵەی دواییدا دراون، ناتوانن پێمان بڵێن ئایا ئیجتهاد لەلقەکاندا گرفتەکانمان چارەسەر دەکەن یان نە؟

موجتەهید شەبستەری: من لەدرێژەی قسەکانمدا وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەمەوە. وەك گوتم لەتێگەیشتنی دووەمدا بۆ ئایین، لەوانەیە ئایین بەجۆرە رەفتارێك لەقەڵەم بدەین وئایین لەقاڵبی واقیعە کۆمەڵایەتی ومێژووییەکانی سەردەمانی رابردوو کورت دەکەینەوە.

ئەگەر ئایین بەرەفتاری تایبەتی مرۆیی دابنێین، ئەو کات دەڵێین ئایینی پێغەمبەر دانپێدانان (إعتراف) شەهادەت دانێکە. داننان بەخواوەندێی خوا" وشەهادەت دان بەوەی لایەنی دەرەکی هەیە، پێغەمبەریش ئەوانی تر بانگ دەکات بۆئەوەی دان بەخواوەندێتی خوا دابنێن. پەیامی پێغەمبەر هەر ئەو بانگ کردنەیە. ئایینی پێغەمبەر پشت بە ئەزموونی وی دەبەستێ. ئەزموونی پێغەمبەرایەتی، ئەزموونێك بووە لێوانلێو بووە ولەناخیدا رژاوەتە دەرەوە (بەپێچەوانەی ئەزموونی عارفەکان). ئەم دانپێدانان و شەهادەتانە، زاتی ئەزموونی پێغەمبەرانەی پێغەمبەرانە. دەتوانین هەر بەکورتی بڵێین ئەوان ئەزموونیان دەکرد کە خواوەند وای لێکردبوون بتوانن قسە بکەن کە خۆیان نەیانتوانی وا بکەن، واتای جەوهەریی ئەم قسانە هەمان دانپێدانان وشەهادەتدان بووە. ئەوان ئەزموونیان دەکرد کە خواوەند بە توانایەکی یەزدانییەوە وای لێکردوون دانپێدابنێن وشەهادەت بدەن. هەڵبەت ئەم دانپێدانان وشەهادەتە بەزمان وکولتوورێکی تایبەت دەردەبڕێت وهەر لەبەر ئەوە سنوورەکانی ئەو زامان وکولتوورە لە قالبی دەدات. گشت ئەوەی پەیوەندی بەو زمان وزەمان وکولتوورەوە هەیە، لەشتی ڕواڵەتیی ئەو ئەزموونە پێغەمبەرێتیەن.

ئەگەر کەسێك وەحی بەهۆکاری ناردن ودانپێدانان وشەهادەتی پێغەمبەر بزانێت وبڕوای وابێ زمانی دەربڕینی ئەو ئەزموونەش، زمانێکی رەمزییە، ئەوە بەرەنجامی

بەرجەستەبوونی مێژوویی - کۆمەڵایەتی - کولتووری ئەو ناردنەیە (بعپە)، بە پەیامی زاتیی وەحی دانانرێ ولەئەنجامدا بەجەوهەری ئایینی پێغەمبەری لەقەڵەم نادات. هەر چۆنێك بێت، بەرای من لەدنیای هاوچەرخدا پێویستە لە خۆمان بپرسین: ((پەیامی سەرەکی ئەو گەورە پیاوانە چ بووەو ئەو پەیامە لەدرێژایی مێژوودا چ رەنگگەلێکی بەخۆوە گرتووە؟)).ئەو پرسیارە، پرسیارێکی زانستییەو دەتوانین دیاردەناسانە وەلامی بدەینەوە. ئەگەر پرسیارێکی ئەوتۆ بخەینەڕوو، لەوەلامدا دەتوانین بڵێین جەوهەری پەیامی ئەوان ((مەعنەوییەت))ە، جەوهەری ئەم پەیامە کە سەرچاوەی دینداربوون ودانپێدانان و شەهادەت دانی ئێمەشە ئاماژە بۆ خواوەند دەکات وکەواتە لە جەوهەری ئاییندا توندوتیژی نییە. پێغەمبەر، مرۆڤێکە کە لەهەلومەرجێکی مێژوویی تایبەتدا نێردراوە وئاسۆیەکی مەعنەویی تایبەتی دەربڕیوە وکردۆتەوە. ئاخۆ ئەو ئاسۆ مەعنەویە لە کوێیە، ئەوە دەبێ بەهۆی کەلامناسییەوە روونکردنەوەی مەعقوڵ بدرێ. لەم چەشنە ڕوانگەیەدا بۆ ئایین، بۆچوونگەلێکی تازە لەمەڕ خوا، پێغەمبەر، وەحی، ئیمان وهتد... دەخرێتەڕوو، هەڵبەت ئەم بۆچوونە نوێیانەی مشتومڕی کەلامیی گرنگ وئاڵۆز دێننەکایەوە کە لێرەدا نامەوێ بچمە سەر ئەو باسانە. بەهەر حاڵ، ئەوەی باسمان کرد، جۆرە ئیجتهادێکە لە بنەمادا کە میتۆدی ئیجتهادکردن لە لقەکانیشدا دەگۆڕێت. وەك ئیقال لاهوری دەڵێ: گۆڕان لە کۆی دەزگای موسڵمانێتی دێنێتە کایەوە. لەدەزگای نوێدا، خوا، پێغەمبەر، یاساو بەها ئایینییەکان وچەمکەکان، واتای تایبەتی خۆیان هەیەو گۆڕانی دەزگا، هەرگیز بەمانای دەرچوون لەئیسلامدا نییە، بەڵکو بەمانای خستنەڕووی تێگەیشتنێکە لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام لەم سەردەمەدا. لەوانەیە چارەیەکمان نەبێ جگە لەخستنەڕووی تێگەیشتنێکی نوێ بۆ پەیامی پێغەمبەری ئیسلام. ئەو تێگەیشتنە نوێیە توانای گونجان لەگەڵ واقیعەکانی ژیان لە هەر سەردەمێکداو گۆڕانکاریی بونیادی کۆمەڵایەتی سیاسیەکانمان پێ دەرەخسێنێ و وامان لێدەکات پێویستمان بەتوندوتیژی نەبێ.

ئێمە ئێستا هەزارو چوار سەد ساڵ لە سەردەمی پێغەمبەر دورکەوتووینەتەوە هوشیارین بەو ماوە دوورودرێژە و ناتوانین واز لەو هوشیارییە بێنین. پێویستە هەر لەو خاڵەی کە تیایدا وەستاوین، پەیوەندی بەسەردەمی پێغەمبەرو پەیامی پێغەمبەرەوە بکەین. شتێکی سروشتییە کە تێگەیشتنی ئێمە لە پەیامی پێغەمبەر، کە لەچوارچێوەی ئەو سەردەمەدا دەژین، جیاوازە لە تێگەیشتنی ئەو کەسانەی کە لە چوارچێوەیەکی مێژوویی پێش ئێمەدا ژیاون. بەڵام نە ئێمە لە موسڵمانێتی دەچینە دەرەوە، نەئەوانیش لەدەرەوە بوون. نە ئەو زانایانەی کە چەندین سەدە پێش ئێستا، کردارو گوفتاری پێغەمبەری لێکداوەتەوە هەڵە بووە، نەزانایەکی دیاردەناس کە ئەمڕۆ، بەو نێوانە دوورە مێژووییەوە، سەیری ئەو کردارو گوفتارانە دەکات، هەر تۆشی هەڵە وچەوتی بێت. بۆ ئەوان ئەو تێگەیشتنە هەبووە وبۆئەوانیش ئەم تێگەیشتنە رەخساوە. ئەگەر ئەم تێگەیشتنە نوێیە بێتە بەرهەم ئەوا پارادایم گۆڕاوە وئەم گۆڕانی پارادایمە زۆربەی کێشەکان لەوانە کێشەی توندوتیژیش بەو مانایەی باسمان کرد چارەسەر دەکات.

لە درێژایی مێژوودا، چەندین خوێندنەوەی جیاواز بۆ ئایین کراوە، لەوانەیە خوێندنەوەی کەلامی، عیرفانی، فیقهی وهی تر، ئایا هیچ یەك لەم بۆچوونە نەریتیانە، لە پارادایمی نوێوە نزیکترین یان دووریی هەموویان لەم پارادایمەوە وەکو یەکە؟

موجتەهید شەبستەری: ئەم سێ خوێندنەوەیە لە راستیداو کۆلەکەی سەرەکی خوێندنەوەی نەریتین بۆ ئایینی ئیسلام، یەك چوارچێوەیان هەیەو نزیکەی جیاوازییەکی ئەوتۆیان لە نێواندا نییە. کەلامناسان، فەقیهەکان وموتەسەویفەکان هەموویان پابەندی هەمان بنەماو بنچینەی پارادایمی رابردوون. فەیلەسوفان وهەندێ لە عارفە موسڵمانەکان لەو یەکەم کەسانە بوون کەلەو بۆچوونە دوورکەوتنەوە" واتە ئەو چەمکانەی کە بۆ تێگەیشتن لە خوا، پێغەمبەرایەتی، وەحی وشەریعەتیان بەکارهێناوە، هەر ئەو چەمکانە نەبوون کە کەلامناسان، فەقیهان وموتەسەویفەکان بەکاریان دێنا. بۆ نموونە چەمکی ((واجب الوجود)) یان پەیوەندیکردن بە عەقلّی چالاکەوە (وەحی) یان خواوەند وەك مەعشوقێك لەو چەمکانە نەبوون کە کەلامناسانی سەدە بەراییەکان بۆ خواوەندی وەحی

بەکاریان دێنا. هەڵبەت کاتی کەلامناسی, بەفەلسەفی کرا, ئەم چەمکانەش دزەیان کردە ناویانەوە. بەڵام تەنانەت لەو قۆناغەشدا گشت دیداران تێگەیشتنێکی تریان بۆ ئایین هەبوو.

بەهەر حاڵ فەیلەسوفان وبەشێك لە عارفەکان چەمکگەلێکی جیاوازیان خستنەڕوو وئەگەر بمانەوێ حوکم لەسەر دووری ونزیکیی خوێندنەوە جیاجیاکانی ئیسلام لەم پارادایمە نوێیە بدەین, پێویستە بڵێین خوێندنەوەی بەشێك لە عارفەکان, لەرووی ئاکام وشوێنەوارەکانیەوە نەك لەڕووی ناوەرۆکەوە, لەپارادایمی نوێوە نزیکە. واتە ئەم خوێندنەوەیە, مرۆڤ لەرێکخستنی ژیانی دنیایی خۆیدا ئازادتر دەکات ورێگە بە مرۆڤ دەدات, بۆ نموونە بەو جۆرەی کە بەراستی دەزانن, سیستمی کۆمەڵایەتی خۆیان رێك بخەن. بەڵام ئەگەر سەیری ناوەرۆکی خوێندنەوەی ئەم کۆمەڵە عارفانە بدەین, ئەوا دەبینین لە پارادایمی نوێ دوور وجیاوازە.

موحسین کەدیوەر: بەرێز شەبستەری دوو خوێندنەوەو بۆچوونی جیاوازی بۆ ئایین ناساندو فەرموویان بۆچوونی نوێ بۆ ئایین بواری توندوتیژی نادات. بێ ئەوەی حوکم لەسەر راستی هەڵەی بۆچوونی نوێ بدەم, ئەو خاڵە قبووڵ دەکەم کە خوێندنەوەی نوێ رێگە بەتوندوتیژی نادات. بەڵام ئەمرۆ دەمەوێ وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە کە ئایا خوێندنەوەی کەلامی - فیقهی نەریتی بۆ ئایین, توندوتیژی بەڕەوا دادەنێت؟ ئایا ئەو دیندارانەی کە ئەم تێگەیشتنەیان بۆ ئایین هەیە, بەلەبەرچاوگرتنی بنەمای نەریتی ڕەوایە پەنابەرنەبەر توندوتیژی یان نە؟ پێش چوونە ناو باسەکەوە دەمەوێ بڵێم بەگوێرەی هەمان پرەنسیپی فیقهی وئوسوڵی, دەتوانین لانی کەم دوو تێگەیشتنی جیاواز بۆ قورئان وسوننەت بخەینەڕوو" یەکیان ((تێگەیشتنی رەسمی)) و ئەوی دیکەیان ((تێگەیشتنی نارەسمی)). خاڵێکی تر کە پێویستە باسی بکەین ئەوەیە کەلە چوارچێوەی پرەنسیپی فیقهی - کەلامی نەریتیدا باسی زات ورواڵەت وجەوهەرو قاوغ ناکرێ. بۆیە من لەجیاتی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە کە ئایا توندوتیژکاری لەجەوهەری ئایینەوە سەرچاوەی دەگرێ یان نە, وەڵامی من نەرێیە. هیچ پەیوەندییەکی زەرووری

لە نێوان ئەم دووانەدا نییە. دەتوانرێ خوێندنەوەیەکی سیستماتیك وپەسندکراوی حەوزە زانستییەکان بۆ ئایین بخەینەڕوو کە توندوتیژیی لێنەکەوێتەوە. لەچوارچێوەی ئەم پارادایمە نەریتیەشدا دەشێ توندوتیژکاریی ئایین راشکاوانە مەحکوم بکرێ وگرفتە کەلامی وفیقهییە جیدییەکانی نیشان بدرێ.

رێگەم بدەن باسی ئەو ئەحکامانە بکەم دە دەگوترێ میسداقی توندوتیژیی ئایینن. من ئەم ئەحکامانەم پۆلێن کردوون, لێرەدا ناچمە سەر باسی سزاکان وئەو ئەحکامانەی دەستبڕین, جەڵدەلێدان, بەرد بارانکردن ونموونەی لەوەیان لێدەکەوێتەوە. دەتوانین ئەحکامەکان بەم شێوەیە پۆلێن بکەین. یەکەم کۆمەڵە ئەحکام, ئەو ئەحکامانەن کە پەیوەندیان بەهەڵگەرانەوە وجنێودان بە پێغەمبەرەوە هەیە. کۆمەڵەی دووەم, ئەحکامەکانی جیهادی سەرەتاییە. جیهادی سەرەتایی واتە کۆمەڵگایەکی ئیسلامی دەتوانێت هێرش بکاتە سەر کۆمەڵگایەکی تر بۆئەوەی ئەو کۆمەڵگایانە موسڵمان بکات. جیهادی سەرەتایی واتە شەڕکردن بۆ بەموسڵمانکردن.

کۆمەڵەی سێیەم, ئەحکامی فەرمانکردن بە چاکەو نەهیکردن لە خراپە. واتە ئەگەر ببینم کەسانێك کاری چاك ناکەن ودووچاری خراپەکاری دەبنەوە, پێویستە سەرەتا بەدڵ پێم خۆش نەبێ, دووەم بەزمان ونەیاریی خۆم دەربڕم, سێیەم ئاگاداریان بکەمەوە وفەرمان ونەهی بکەم ولەکۆتاییدا فیزیکیانە رووبەڕوویان ببمەوە. لە فیقهی نەریتیدا, لەهەندێ هەلومەرجدا تەنانەت کوشتنیش رێگەی پێدراوە. بەم شێوەیە لەوانەیە, ئەویتربوون (یان لە ئێمە نەبوون) تەواو رووبەڕووی تەنگژە ببێتەوە. ئەم سێ کۆمەڵە لەگشت رێبازە فیقهییەکاندا بەدی دەکرێن, بەڵام کۆمەڵەی چوارەم تەنیا لە لای هەندێ لە فیقهەکاندا هەیەو کە لەوانەیە کەمینەش بن. مەبەستم تیۆری ویلایەتی موتڵەقی فەقیهە. بەگوێرەی ئەم تیۆرە وەلیی فەقیە لە کۆمەڵگای ئیسلامدا دەسەڵاتێکی سنوورداری شەرعیی هەیەو هەقی ئەوەی هەیە هەرچیەکی بەچاکی دەزانێت ئەنجامی بدات. ئەگەر وەلیی فەقیە بەمەسڵەحەتی بزانێت, دەتوانێت لە کۆمەڵگای ئیسلامدا حوکمی پیادەکردنی توندوتیژی بدات. ئەگەر بمانەوێ بەگوێرەی -

بەلگەی سەلماندن باسی ئایین وتوندوتیژی بکەین, بەرای من دەبێ چاوێك بەو چوار حالەتەی سەرەوەدا بخشێنین.

تێگەیشتنی قورئان وسوننەت, ئەحکامەکانی سەرەوە بەبێ قەیدومەرج قبول دەکات. لەچوارچێوەی ئەم تێگەیشتنەدا, یەکەم, سزادانی هەلگەراوە, موسادەرەکردنی مولك ومال, جیابوونەوە لە ژن وکوشتنە. سزای ئەو کەسەی کە جنێو بە پێغەمبەر یان ئیمامە مەعسومەکان بدات کوشتنە. دووەم, جیهادی سەرەتایی بۆ موسلمانکردنی کۆمەلگاکانی تریش بە ڕەوا دادەنرێت (هەلبەتە ئەمە لەم سەردەمەدا زۆر جێی باس نییە, چونکە زۆربەی فەقیهە ناودارەکان پێیان وایە جیهادی سەرەتایی تەنیا لەسەردەمی ئیمامە مەعسومەکاندا دەبێ. بەلام ئێستا ئیمامەکان لەنێو ئێمەدا نین. لاپەڕەی ئەم مەسەلەیەش هەلدراوەتەوە. هەلبەت با ئەوەش بلێم کە لە کتێبە ئیستدلالیەکاندا, مەسەلەی جیهادی سەرەتایی بەموتلەقی باس کراوە وپێویستی ئامادەبوونی ئیمامی مەعسوم بۆ جیهادی سەرەتایی وەکو پێویستی ئامادەبوونی ئیمامی مەعسومە بۆ ئەنجامدانی نوێژی هەینی, دەرکردنی حەددەکان وشتی لەم بابەتە. واتە لەوانەیە بشێ بەبێ بوونی ئیمامیشدا جیهادی سەرەتایی بکرێ. چونکە ئەگەر سەردەمێك یەکێك لە ولاتانی ئیسلامی بووە هێزێکی گەورە, لەوانەیە بەپشت بەستن بەم مەسەلەیە هەولی بەموسلمانکردنی کۆمەلگا ناموسلمانەکان بدات). سێیەم, فەرمانکردن بەچاکە ونەهیکردن لەخراپەش سێ ئاستی هەیە: ئاستی دل, ئاستی زمان, ئاستی دەست, لە ئاستی سێیەمدا حاکم دەتوانێت بڕیاری سزای فیزیکی بدات, تەنانەت ئەگەر کوشتنیش بێت. چوارەم, لەروانگەی ئەو فەقیهانەی کە بڕوایان بە ویلایەتی موتلەقی فەقیە هەیە, ئەگەر وەیلی فەقیە بیەوێ. لەسەرووی گشت ئەحکامە سەرەتایی ولاوەکیەکانەوەیە. ئەمە خوێندنەوەی رەسمیە بۆ ئایین وبەرای من توندوتیژی بەدوادا دێت.

بەلام بۆ رەتکردنەوەی توندوتیژی پێویست ناکات ئایینناسییەکی نوێ بێننە کایەوە. چونکە لەچوارچێوەی هەمان سیستمی نەریتیدا دەشێ خوێندنەوەیەکی ترمان

بۆ قورئان وسوننەت هەبێ کە توندوتیژیی لێ نەکەوێتەوە. وا چاکە ئاماژە بە مەسەلەی ئیجتهاد لە لق وبنەماکانیش بکەین. مامۆستای بەڕێز ئاماژەیان بەوەدا کە لەڕێی ئیجتهادی میتۆدیانە لە لقەکاندا ناتوانرێت ڕێ لە توندو تیژی بگیرێت, بەڵام من لەگەڵدا نیم وپێم وایە لەڕێی ئیجتهادی میتۆدیانەوە لە لقەفقهیەکاندا وئیجتهادی میتۆدیانە لەکەلامدا دەشێ ئەنجامێکی گونجاومان دەست کەوێ.

موجتەهید شەبستەری: واتە مەبەستی ئێوە ئەوەیە کەبەبێ چاوخشاندنەوە بەچەمکی خوا, وەحی, پێغەمبەرێتی, ئیمان وشتی لەم بابەتە دەتوانین بەئەنجامێکی گونجاو بگەین؟

موحسین کەدیوەر: مەبەستم لە ئیجتهادی کەلامی ئەوەیە کە بۆ نموونە ئەگەر زانایانی رابردوو لە بواری پێغەمبەرێتی, ئیمامەت, ئامادەنەبوونی ئیمام وهی تر بەڵگەیەکیان خستۆتەڕوو, پێویست ناکات ئێمە شوێن ئەو بەڵگانە بکەوین. بۆ نموونە, دەشێ خوێندنەوەیەکی تەواو نوێ بۆ بابەتی ((ئامادەنەبوونی ئیمام)) بخەینەڕوو. هەڵبەت ئەم خوێندنەوە تازەیە لەسەر بنەمای هەمان سیستمی نەریتی ئیجتهادی کەلامی دەخرێتەڕوو. چەمکی خوا لە سەدەی سێزدەهەم جیاوازە لەچەمکی خوا لەسەدەی دووەمی کۆچی. ئەم جیاوازی وگۆڕانە لەسەر بنەمای چ پرەنسیپێکدا ڕوویداوە؟ هەر ئەو پرەنسیپانە دەشێ بنچینەی ئیجتهادی کەلامی هاوچەرخیش بێت. هەڵبەت دەبێ رابگەیەنین کە چەندین سەدەیە کەلامناسیمان دووچاری بەستەڵەکی وقەیران بۆتەوە وتەنانەت کتێبێکی کەلامیی جیدی وداهێنەرانە نەنووسراوە.

بەکورتی, بەرای من دەشێ لەچوارچێوەی هەمان پارادایمی نەریتیدا, بەهۆی ئیجتهادی فیقهی وکەلامی, چاو بە ئەو چوار ئەحکامانەی ناوبراودا بخشێنینەوە. هەڵگەرانەوە یەکێکە لەو شتانەی قورئان بەئاشکرا باسی کردووە, بەڵام ئەوەی لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە, سزا دوارۆژییەکانی هەڵگەڕاوەیە. لەقورئاندا یەك وشەش ڕاشکاوانە سەبارەت بە سزای دنیەوی بۆ هەڵگەراوە نەگوتراوە. باسی سزای دنیەویی هەڵگەراوە لە ریوایەتەکاندا هاتووەو هەڵبەتە ریوایەتەکانیش زۆرن. بەڵام هەڵگەراوە

کێیە؟ ئەگەر بمانەوێ بەهۆی هەمان ئەو پرەنسیپە نەریتیانەوە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە. دەبینین بازنەی هەڵگەڕاوان زۆر بەرتەسك دەبێتەوە.

*** بەڵام مەسەلەی هەڵگەڕانەوە رەتناکرێتەوە؟**

موحسین کەدیوەر: نەخێر. من وتم هەڵگەڕانەوە یەکێکە لەو شتانەی قورئان بەئاشکرا باسی کردووە. بەڵام هەڵگەڕاوە موسڵمانێکە کە بەهۆی عینادی وکەلەڕەقییەوە دژی ئیسلام بوەستێتەوە, نەك بەهۆی لێکوڵینەوەیە. هەروەها بۆچوونی خۆی رادەگەیەنێت وبیەوێ رەوتێکی کۆمەڵایەتی - سیاسی بێنێتەکایەوە. کەسێك کە بۆچوونی خۆی بەشێوەیەکی زانستی لە کتێبێکدا بخاتە ڕوو, بەر ئەم حکومە ناکەوێ.

لە هیچ رژێمێکدا, تەنانەت لە رژێمە دیکتاتۆرییەکانیشدا قبوڵ ناکەن کەسێك بەهۆی راگەیاندنی بیروڕا نەریتەکانی خۆی بیەوێ رەوتێکی سیاسی - کۆمەڵایەتیی پێچەوانەی سیستم بێنێتەکایەوە. بۆ نموونە رژێمە دیموکراتیکەکان بەجیدی دژی رەوتە فاشیستەکان دەوەستێنەوە. خاڵێکی تر ئەوەیە کە حکومی هەڵگەڕانەوە هەبێ, حەددەکە لادەکەوێ. رای باو بەو ئاراستەیە کە حوکمی هەڵگەرانەوەیە (وەکو حوکمی زینا) ئیسپات نەبێ. بەهەر حاڵ ئیسپاتکردنی ئەم حوکمە زۆر زەحمەتە مەگەر کەسەکە خۆی دانی پێدابنێ کە هەڵگەراوەتەوە. بەڵگەی سەلماندن بۆ هەڵگەرانەوە زۆر کەمن مەسەلەی جنێودان بەپێغەمبەر وئیمامە مەعسومەکانی تریش هەر وایە. لەوانەیە بڵێین ئەگەر کەسێ گوێی لێ بوو یەکێکی تر جنێوی بەپێغەمبەر یان ئیمامە مەعسومەکانی تر بدات, رەوایە یەکراست بیکوژێ, بەڵام ئەگەر کەسوکاری کوژراوەکە شکات لە کوژەرەکە بکەن, دەبێ شاهێدیان هەبێ وبتوانێت لە دادگادا جنێوەکە بسەلمێنێت. لە فیقه و کەلامی کلاسیکدا, کۆت وبەندی زۆر دانراون کە دەرکردنی حوکم لەوباوەرە زۆر سەخت دەکات. لە کاتێکدا کە ئێستا لە کۆمەلگای ئێمەدا ئەوەندە بێ باکانە ئەم حوکمانە دەردەکرێن کە وەك بڵێی خواوەند هیچ ئیتیادێکی لەو بارەوە نەکردووە.

لەبارەی جیهادی سەرەتایش دەبێ بڵێین هێرشی سەربازی لە هەموو هەلومەرجێکدا ڕەوا نییە. دینداری بەزۆری نییە ((لا إكراه فى الدين)). مەگەر دەتوانین بێ ئەزیەت خەڵکانی تر ناچار بکەین دیندار بن. جیهادی سەرەتایی ئەو کاتە پێویست دەبێت کە سیستمێك ڕێگربێت لە بەردەم هاتنی خەڵك بۆ ناو ئایین وبۆ دینداربوونیان کوتانێك بەسەرپەنجە پێویست بێ. ئێران لە سەرەتای ئیسلامدا بەم شێوەیە بوو. جیهادی سەرەتایی تەنیا ڕێگرێکە لادەبات لەبەردەم خەڵکدا بۆ ئەوەی بەخواستی خۆیان ئیمان بێنن وئامانجی جیهاد ئیماندارکردنی خەڵك نییە بە زۆرەملێ.

بەڵام سەبارەت بە ئاستی سێیەم فەرمانکردن بەچاکەو نەهیکردنە لە خراپە, واتە ئاستی دەست پێویستە بڵێین لە کۆمەڵگایەکی یاسامەنددا لەلایەن یاساوە تەنا یاسادانەران ڕێگەیان پێدراوە سزاکان جێبەجێ بکەن, واتە چاکەو خراپە دەبێ لەیاسادا پێشتر دەستنیشان کرابێ وسزاکانیش بەشێوەی یاسا جێبەجێ بکرێن.

لەبارەی ویلایەتی موتڵەقی فەقیهیشەوە دەبێ بڵێین بەشێکی بەرچاوی فەقیهەکان ئەم تێگەیشتنەیان بۆ قەرئان وسوننەت نییە. ئەگەر کەسێك بڕوای بەم تیۆرە نەبێ, ئەوا هیچ کەسێك بە خاوەن مەئموریەتی تایبەت لەلایەن خواوەندەوە دانانێت تا بتوانێت خۆی لکایەی کاروباری گشتی هەڵقورێنێ. لەروانگەی هەندێ فەقیهیشەوە مەبەست لە دەستەواژەی ویلایەت ئەوە نییە کە وەلی فەقیە کارێك بکات کە شتە بەڵگەنەویست وپێویستییە شەرعییەکان بخاتە گومانەوەو متمانەی خەڵك بەئایین کەم بکاتەوە, دەبێ ڕووبەڕووی ئەو کارانەی بوەستینەوە. بەدەربرینێکی سادەتر, حاکمی شەرع ڕێگەی پێنەدراوە لەو ڕێیەوەی کە لەیاسادا دەستنیشان نەکراوە, توندوتیژی ئەنجام بدات.

مافی خۆرسکی مرۆڤ وئەوەی ئەمڕۆ پێی دەگوترێ مافەکانی مرۆڤ وەکو مافی ژیان, مافی ئاسایش, مافی ئازادی, مافی بەرگریکردن لە دژی ستەم وچەوساندنەوە, لەچوارچێوەی فیقهی ـ کەلامی کلاسیکیدا دەسەلمێنرێت. هەندێ لەم مافانە ڕاشکاوانە

لە فیقه و کەلامی کلاسیکدا باسکراون وهەندێکی تریشیان دەشێ هەلبێنجین, مەسەلەی...

...دان بەوەدا دەنێم کەئیجتهادی کلاسیك لە زۆربەی حاڵەتەکاندا پێویستی بەچاوپێداخشاندنەوە هەیە وئەگەر ئەم چاوپێداخشاندنەوەیە نەکرێ, رووبەڕووی بەهەڵە تێگەیشتنی وا دەبینەوە کەتوندوتیژی بەرهەم دێنن. بەڵام ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی کە گشت پرەنسیپەکانی ئیجتهاد زیانیان بەربکەوێ.

موجتەهید شەبستەری: ئەگەر کێشەی ئێمە چەند حوکمێکی فیقهی توندوتیژ بێت, لەوانەیە بەو شێوەیەی کە بەرێز کەدیوەر گوتیان کاریگەر دەبوو. بەڵام بەرای من کێشەی سەرەکی کۆمەڵگا موسڵمانە هاوچەرخەکان شتێکە لەسەرووی ئەوەوە. توندوتیژی لە کۆمەڵگا هاوچەرخە موسڵمانەکاندا بەرهەمی رەچاونەکردنی مافەکانی مرۆڤە. گرفت ئەوەیە کە ناتوانین لە سیستمێکی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای مافەکانی مرۆڤ بنیات بنێین. ئەگەر دەستووری خۆمان لەسەر بنچینەی مافەکانی مرۆڤ بەو شێوەیەی کە لەچارنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤدا هاتووە وهەمووارکراوە, دانەرێژین وسیستمی کۆمەڵایەتیی خۆمان بەگوێرەی ئەم یاسایە دانەرێژین و رێز لەو ماف و ئازادییە سیاسی ـ کۆمەڵایەتیانە نەگرین کە ئایا لەو دەستوورەدا هاتوون رووبەڕووی چەندین توندوتیژی دەبینەوە. لەم حاڵەتەدا, کێشەی سەرەکیمان ئەوەیە کە ئایا بنەمای فیقهی ـ کەلامیی رابردوومان رێگە دەدات کۆمەڵگایەك لەسەر مافەکانی مرۆڤ بنیات بنێین یان نە؟ لەراستیدا دوو پرسیار لەئارادا هەن: یەکەم ئایا ئەو مافانەی مرۆڤ لەو بنەما کلاسیکانەدا هاتوون یان نە؟ دووەم ئایا ئەو بنەمایانە رێگرن لەبەردەم پابەندبوونمان بەمافەکانی مرۆڤەوە یان نە؟ ئەگەر مافەکانی مرۆڤ بەدڵ وگیان وەرنەگیرێت وسەربژاردەی کۆمەڵگا بەهوو بوونیانەوە لە پێناوی سەقامگیرکردنیان لە کۆمەڵگادا هەوڵ نەدەن, تەنانەت خۆدی یاساش دەشێ توندوتیژی بەرجەستەبکات و رەوایەتی بەتوندوتیژی بدات. یاسای خۆی لەخۆیدا لایەری توندوتیژی نییە. یاسا دەتوانێت پشتیوانی توندوتیژی بێت.

بەرای من بنەما فیقهی - کەلامییەکانمان لەمەسەلەو بابەتە سیاسییەکاندا پەیوەندیان بە دنیای رابردووەوە هەیە. لەو دنیایەدا, پەیوەندییە سیاسییەکانی مرۆڤ لەسەر ملکەچیی خەڵك بۆ حاکمێکی دادگەر یان ستەمکار دامەزرابوو. لەو دنیادا, مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ لەئارادا نەبوون وستەم ودادگەریش, مانایەکی دیکەیان هەبووە دادگەری لەو سەردەمەدا مانایەکی تاکەکەسی وتومەژاویی هەبوو ودادگەری بەو مانایە هیچ شێوەیەك ناتوانێت ببێتە بنچینەی رێکخستنی کۆمەڵایەتی وسیاسیی دیمەکراتیك فیقه وکەلامی کلاسیك, هیچ یەك لەو چەمکانە یان تێدا نییە کە بەبناغەی رێکخستنی سیاسی لە جیهانی نوێدا لە قەڵەم دەدرێن. داکۆکیکردن لە سەر پارادایمی کەلامی وفیقهی کلاسیك واتە چاوپۆشیکردن واتە هەوڵدانی ناسەرکەوتوو ونازانستی بۆ دەرهێنانی چەمکە نوێیەکانی وەکو ((ئازادیی)) بەشداریکردن لەناو قورئان وسوننەتدا. بۆ نموونە هەندێ کەس دەڵێن لەبەر ئەوەی حەزرەتی عەلی تا ئەو کاتەی شمشێری لە خەوارج هەڵنەکێشا, بە لێبوردەییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردن, کەواتە بەگوێرەی ئەم کارەی حەزرەتی عەلی گشت گرووپە سیاسییەکان دەتوانن ئازادانە بیروڕای سیاسی خۆیان دەرببڕن, مەگەر دەست بۆچەك بەرن. کەموکوڕیی ئەم ئیجتهادە نامیتۆدیانە ئەوەیە کە دەیانەوێ بنچینەو پرەنسیپێکی گشتی لە کارێکی نەکراوی حەزرەتی عەلی هەڵبێنجێن وئەمەش ناکرێ. یەکێکی تر لە بەڵگەکانی ئیجتهادی نامیتۆدیانە ئەوەیە کە بمانەوێ پێکهاتەی شورایی کۆمەڵگایەکی دیموکراتیك لەسەر ئایەتی شورا لە قورئانی پیرۆزدا هەبوو هیچ پەیوەندییەکی بە بونیادی شورایی حکومەتێکی دیموکراتیك لەم رۆژگارەدا نییە. ئەم ئیجتهادانە نامیتۆدی ونازانستیانەن وپشتگیریان لێ ناکرێ و ناتوانین تیۆری پتەوی لەسەر بینابکەین.

حەزرەتی عەلی نموونەی باڵای دادگەرییە, بەڵام نموونەی دادگەری لەو سەردەمدا. هەرکەسێك نموونەی دادگەریی سەردەمی خۆیەتی. ئێمە هیچ نموونەیەکی سەروو مێژووییمان نییە بۆ دادگەری. لە پارادایمی نەریتیدا واتای دادگەری ئەوەبووە کە فەرمانڕەوایی موتڵەق وەهەتا هەتایی نەبێ وهەلسوکەوتی ستەمکارانە لەگەڵ

رەعیەتەکانی خۆی نەکات. بەڵام ئەمڕۆ ئەو پرسیارەمان لەبەردەمدا راست دەبێتەوە کە پێوەرەکانی رێکخستنی کۆمەڵایەتی عادیلانە چین؟ ئەگەر ئەمڕۆش حەزرەتی عەلی نموونەی باڵامانە، لەبەر ئەوەیە کە رەمزی پەیامنێری ناراستەیەکی تایبەتە واتە ئاراستەیەك بەرەو عەدلالەت. شێمە ئێمە دەبێ لەو ئاراستە گشتییەوە پەیام وەرگرین، بەڵام تەفسیرکردنەوەی عەداڵەت ودەستنیشانکردنی بەڵگەکانی ئیسپاتبوون یان نائیسپاتبوون لەم سەردەمەدا لە ئەستۆی خۆمان دایە.

موحسین کەدیوەر: بەرێز شەبستەری پرسیاریان کرد: ((ئایا بنەمای فیقهی - کەلامی کلاسیکمان توانای وەرگرتنی مافەکانی مرۆڤی وەك بناغەی رێکخستنی کۆمەڵایەتی هەیە یان نە؟)) بەرای من. بەپشت بەستن بە بنەما فیقهی - کەلامیمان دەتوانین زۆربەی مافەکانی مرۆڤ هەڵبێنجین. بەدەستەواژەیەکی دەقیقتر، جگە لە ئازادییە ئاینی وئازادییە جنسیەکان دەتوانین گشت ئازادی ومافەکانی تر بەپشت بەستن بە بنەما فیقهی - کەلامییەکان بسەلمێنین. پرسیارم لە بەرێز موجتەهید شەبستەری ئەوەیە کە ئایا بەرای ئێوە بنەمای فیقهی - کەلامیی ئێمە مەرجدارە بەنەبوونی مافەکانی مرۆڤەوە، واتە داوای نەمانی مافەکانی مرۆڤ دەکات؟

واتە ئایا مەحاڵە بتوانرێ بەم بنەما فیقهی - کەلامیانەوە مافەکانی مرۆڤ قبووڵ بکەین؟ هەڵبەت دەتوانین بڵێین هەندێ (کێشەی) فیهقی وکەلامیی خوێندنەوەی باو بۆ ئاین، پێشێلی مافەکانی مرۆڤ مرۆڤ دەکەن. بەڵام بەرای من من وا نییە کە ((بنەما)) فیقهی - کەلامیان رێگە لە مافەکانی مرۆڤ بگرێت. من چەند هەولێکم لەو بارەوە داوە ودەرمخستووە کە دەتوانین بەپشت بەستن بەهەمان بنەمای فیقهی - کەلامی، مافی دیارکردنی چارەنووس بسەلمێنین. پێم وایە دەتوانین گشت مافەکانی تریش وەکو مافی ژیان، مافی بەرگری لەبەر ستەمدا، مافی ئاسایش ومافەکانی تریش بسەلمێنین. تۆ باسی مەسەلەی دادگەریت کرد لەمەسەلە فیهی - کەلامیەکانی ئێمەدا باسی دادگەریی تاکەکەسی کراوە، بەڵام هیچ باسی دەدگەریی کۆمەڵایەتی نەکراوە قسەیەکە وئەوەی

کە دەڵێ بەگوێرەی بنەما فیقهی ـ کەلامیەکان ناتوانین دادگەریی کۆمەڵایەتی قبووڵ بکەین, قسەیەکی دیکەیە.

مەسەلەیەکی دیکە کە بەڕێز موجتەهید شەبستەری باسی کرد, مەسەلەی ئیجتهادی نامیتۆدیانیە. مەبەستم ئەوە نییە کە مافەکانی مرۆڤ لە کەلامی خواوەندیان ژیاننامەی ئیمامەکانەوە وەدەرنێین. مەبەستم ئەوەیە کە هەر کردارێك کە لەم سەردەمەدا ئەنجامدانیان عەقلیانە بێت, واتە عەقڵ ڕێگە بە ئەنجامدانی بدات, دەتوانین شەرعیبوونی بسەلمێنین. دینداران دەیانەوێ ئەو کردارانەی ئەنجامی دەدەن, هەرام نەبن وبەرای من دەتوانین نیشانی بدەین کە دامەزراندی سیستمی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای مافەکانی مرۆڤ, پەیوەندی بەحەرامی شەرعیەوە نییە وهەر ئەوەش بەسە بۆ شەرعییەت پێ دانی. من تەواو لە گەڵتدام کە ئەو شوڕایە لە قورئان وسوننەتدا هاتووە ئیلزامی نییە, لەکاتێکدا لە سەردەمی تازەدا دەسەڵات ناچارە بەپێی رای شوڕا بجوڵێتەوە, ئەم شوڕایە لەگەڵ ئەو شوڕایەی لە قورئان وسوننەتدا هاتووە [تەنیا] لە زاراوە لێك دەچن. ئەم شوڕایە دامەزراوەیەکی مۆدێرنەو ئەو شوڕایان تەنیا جۆرە راوێژپێکردنێك دەگرێتەوە. ئەگەر بمانەوێ ئەم شوڕایەیئێستا لە چەمکە نەریتییەکەوە هەڵبێنجین, ئەوە رەخنەکەی جەنابتان لە جێی خۆیدایە, بەڵام ئەگەر بڵێین ئەم شوڕایە لەگەڵ ئەم چەمکەیاندا دەگونجێ وئەم شوڕا مۆدرێنە ڕێگەی شەرعیی نییە, ئەوا قسەیەکی هەڵەمان کردووە.

کەواتە بەکورتی, بەرای من لەکایەی مەسەلە عەقلانییەکاندا. لەکایەی مامەڵە وهەڵسوکەوتدا, پێویست ناکات بەدوای بەڵگەیەك لەناو قسەو کرداری ئیمامدا بگەڕێین. هەر ئەوەندە بەسە کە ڕێگرێك لە لایەن خواوە (یاسادانەر) نەبێت. ئەگەر ئەم شتە بچەسپێ, کردارەکەش پەسند دەکرێ. زۆربەی هەرە زۆری مەسەلەی مافەکانی مرۆڤیش حاڵ ورەوشتێکی وایان هەیە. کەواتە بەرای من بنەمای فیقهی ـ کەلامیی کلاسیکمان, ملفی مرۆڤ وئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەی کە لەسەر مافەکانی مرۆڤ دامەزراوە دەخاتە دەرەوەی خۆیەوە.

موجتەهید شەبستەری: کەواتە بەرای ئێوە فیقە وکەلامی باو لەبارەی مەسلە هاوچەرخەکان بێدەنگە؟

موحسین کەدیوەر: مەبەستم ئەوەیە کە هنەر بەو پرەنسیپ وپێوەرانەوە دەتوانین ئەرك ومافەکانی مرۆڤ ئیسپات بکەین.

موجتەهید شەبستەری: واتە ئێوە لە رێی میتۆدی ئیجتهادی فیقهی, لەناو قورئان وسوننەتدا, مافەکانی مرۆڤی هاوچەرخ هەڵدێنجن؟

موحسین کەدیوەر: مەبەستم لە هەڵینجان ئەوەیە کە دەردەخەین رێگری شەرعی نین.

موجتەهید شەبستەری: ئەمە هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەوەدا کە بلێین دەمانەوێ فرۆکە دروست بکەین, دەگەڕێینەوە بۆ قورئان وسوننەت ودەبینین فرۆکە دروستکردن هیچ رێگرێکی نییە. ئایا بەراستی مەسەلەکە بەم شێوەیە؟

موحسین کەدیوەر: هەڵبەت ئەم دوو مەسەلەیە کەمێك لەیەکتر جیاوازن. لەباسی مافەکانی مرۆڤدا چەندین فەقیهمان هەن کە بەپشتبەستن بە هەندێ بەڵگەی فیقهی مافەکانی مرۆڤ رەتدەکەنەوە وبۆ پووچەڵکردنەوەی ئەم بەڵگەیە دەبێ مشتومڕێکی جیدی بکەین. هەڵبەت راستە کە ئەم بنەما ومافانە عەقڵانین. ئێمە سەرەتا بنچینەکە دادەمەزرێنین ولە ڕووی عەقڵانییەوە دەیسەلمێنین ودواتر ئەو خاڵە تاووتوێ دەکەین کە ئایا بەڵگەیەکی فیقهی هەیە کە رێبگرێت لە دەستگرتنمان بەو پرەنسیپە عەقڵانیە یان نە, ئەگەر بەڵگەیەکی ئەوتۆ هەبێ دەبێ بزانین دەتوانین ئەو بەڵگەیە پووچەڵ بکەینەوە یا نە. تەنیا ئەو کاتەی کە ناتوانین ئەو بەڵگانە پووچەڵ بکەینەوە, دەبێ دەست لەو پرەنسیپە عەقڵانیە هەڵگرین.

موجتەهید شەبستەری: ئایا مافەکانی مرۆڤ لە قورئانەوە وەدەست دێن؟ بۆ نموونە یەکسانی لەبەر چاو بگرە. بەرای من یەکسانی بە مانای ئەمرۆی بە هیچ شێوەیەك لە قورئان وسوننتەوە چنگ ناکەوێ.

موحسین کەدیوەر: لە حەدیسدا هەیە کە ((خەڵك وەکو ((ددانەکانی شانە یەکسانن)) و حەدیسی لەم شێوەیە کەم نین. هەڵبەتە ئەم حەدیسانە کۆمەڵێك مەرجیان هەیە, بۆ نموونە زۆربەی زانایان باس لە یەکسانیی نێوان ئیمانداران دەکەن.

موجتەهید شەبستەری: لە مافەکانی مرۆڤدا خەڵك بەبێ لەبەرچاوگرتنی بیروباوەڕ یان یەکسانی و ئەم بابەتە لەگەڵ زۆربەی ئەحکامە فیقهییەکان وئەو حەدیسانەی پشتیان پێ دەبەستری ناگونجێت.

موحسین کەدیوەر: تاکەکەسان لە مافی ژیان, مافی ئاسایش و هی تردا یەکسانن. تەنیا کافری شەرکەڕ لەم بازنەیە دەچێتە دەرەوە.

موجتەهید شەبستەری: ئەم تێڕوانینە بۆ مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ تەواو جیاوازە لەو روانگەیەی کە ئەمڕۆ بۆ مافەکانی مرۆڤ هەیە. تێڕوانینی نوێ بۆ مافەکانی مرۆڤ تێڕوانینێکی فەلسەفییە لە دەقێکی ئاینییەوە هەلبێنجین.

موحسین کەدیوەر: رێگەم بدە نموونەیەك بێنمەوە. عەلی کوڕی ئەبو تالب لە نامەیەکیدا بۆ مالك ئەشتر دەڵێت خەڵك دوو دەستەن: یان برای ئایینی تۆن یان هاوجۆری تۆن.

موجتەهید شەبستەری: نابێ دەق (Text) لە زەمینە (سیاق) (Context) بکەینە دەرەوە. دەبێ بزانین ئەم قسەیە لەو زەمینە مێژوویی - کولتوورییەدا چ مانایەکی هەیە.

موحسین کەدیوەر: وا باشە نموونەیەکی تر بخەمەڕوو. خوالێخۆشبوو ((نائینی)), وەك فەقیهێکی ناودار, لە کتێبی (تنبیه الّمه ...)دا دەڵێت ئەوانەی لە کۆمەڵگایەکی ئیسلامیدا دەژین, باج دەدەن, کەواتە مافی رادەربڕینیان هەیە. ئەم بەڵگە هێنانەوەیە لەگەڵ دیموکراسیدا دەگونجێ.

موجتەهید شەبستەری: بەرای من بۆ ئەوەی باسەکە روون بێتەوە دەبێ پرسیارێکی گریمانەیی لە خوالێخۆشبوو نائینی بکەین وبزانین کە ئاخۆ دەبێ چ وەلامێکی ئەم پرسیارە دەداتەوە, پێویستە بپرسین ئەگەر لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا, بۆ نموونە مەسیحیەکان لەرێی ئاشتیانەو ناتوندوتیژانەوە موسڵمانیان کردنە مەسیحی

ولەئەنجامدا موسڵمانان بوونە کەمینە وحکومەت کەوتە دەستی مەسیحیان, ئایا هێشتا پابەندی یارییەکە دەبێ, واتە مافی رادەربڕین وئازادی ویەکسانی (دیموکراسی) یان نە؟

موحسین کەدیوەر: نازانم ئەو چ وەڵامێکی ئەم پرسیارەی دەدایەوە, بەڵام بەرای من ئەم رووداوە ئاساییە. بەرای من دەبێ بەم یارییە رازی بین وپابەند بین پێیەوە.

موجتەهید شەبستەری: زۆر باشە ئەگەر تۆ پابەندی بە زەرورەتی ئەم قسەیەوە, ئەواچویتە ناو پارادایمێکی تازەوە کە ئایین بەجۆرە رەفتارێك بۆ پەیوەندی بەستن بە خواوەندەوە لەقەڵەم دەدات. بەڵام پێم وایە نائینی وای دەکرد.

*** لێرەدا دوو روانگەی بەدیل بەدی دەکەین. روانگەیەکیان پێی وایە لەرێی ئیجتهاد لە لقەکان ولە ژێر هەمان پارادایمی نەریتیدا دەتوانین قەیرانەکان چارەسەربکەین, بەڵام روانگەی دووەم پێی وایە جگە لە ئیجتهادکردن لەبنەماکان وگۆڕانی پارادایم ناتوانین بەسەر قەیرانەکاندا زاڵ بین.**

موحسین کەدیوەر: خوێندنەوەی دووەم ونوێ لە چوارچێوەی پارادایمی نەریتیدا هێشتا بڵاوبۆنەتەوە وگەڵاڵە نەبووە. واتە هێشتا دروست نەبووە. خاڵی هاوبەش لەو دوو حاڵەتەدا ئەوەیە کە هیچ کامێکیان شەرعییەت بە توندوتیژی نادات.

موجتەهید شەبستەری: ئەم دوو پارادایمە جیاوازییەکی بنەرەتیان لەنێواندا هەیە, لە پارادایمێکیاندا ژیانی سیاسی کۆمەڵایەتی وئابووری وکولتووری لەسەر بنەمای دەقە ئایینییەکانەوە دادەرێژێن. لە پارادیمیەکەی تردا خواوەمد لە رێی دەقە ئایینییەکانەوە لەگەڵ مرۆڤ دەدوێ و مانای ژیان ئازایەتیی بوونی پێ دەبەخشن, بەڵام مرۆڤ کام بنەما بۆ ژیانی کۆمەڵایەتیی خۆی هەڵبژێرێ, ئەوەیان کاری خۆیەتی ـ لەسەر مرۆڤ خۆیەتی کە بەرپرسیارێتی قورس و ترسناکی ژیان هنەلگرێ وبەو شێوەیەی کە تێدەگات ودەتوانێت دایبرێژێت بۆ دارشتنی تیۆری وپراکتیکانەی ئەم ژیانە دەستی غەیبی رێنوێنیی مرۆڤ ناکات, هیدایەت ورێنوێنی, رێگای زانستی وفەلسەفی وپیشەسازییەکانی دروستکردنی ژیان لەم جیهنانەدا ناگرێتەوە, رێنوێنیی غەیبی واتە بەخشینی ئازایەتی بوون ومانای ژیان بە مرۆڤەکان" مرۆڤگەلێك کە بەحوکمی مرۆڤ بوونیان

هەرساتەوەختێك بە جۆرێك هەوڵی بیاتنانی ژیان دەدەن. بێگومان ئەو مرۆڤانەی شوكربژێرن لەسەر نیعمەتی ئەو هیدایەتە غەیبیەو بە دەستەواژەی جوانی قورئان دەبنە یەكێك لە ((عباد الرحمن))، پابەند دەبن بە دادوەرییە ئیمانی - ئایینییەكانی خۆیان لەمەڕ گشت پرۆسە سیاسی وكولتووری وئابوورییەكان ئەم دوو پارادایمە لەبەردەمی موسڵمانانی ئەم سەردەمەدا هەیەو هەڵبژاردن بەدەست ئەوانە،

* سوپاسی هەردوولاتان لەبەر ئامادەبوونتان لەم گفتوگۆیە.

**سەرچاوە: مجله كيان، شماره ٤٥، ص٦-١٩.**

* محەمەد موجتەهید شەبستەری (حوجوتولئیسلام وەلموسلمین) لەساڵی ١٣١٥ كۆچی هەتاوی (١٩٣٦ز) لە شاری شەبستەر لە ئێران لەدایك بووە. دوای تەواوكردنی خوێندنی سەرەتایی، لە ساڵی ١٩٥٠ بۆ فێربوونی زانستە ئیسلامییەكان ڕووی لە شاری قوم كرد و لە حەوزەی زانستیی دەستی بە خوێندن كرد. لە ماوەی هەژدە ساڵ مانەوە لە قوم، زانستە باوەكانی حەوزەی بە چاكی وەرگرت و لە ساڵی ١٩٦٩ وەك بەڕێوەبەری سەنتەری ئیسلامیی هامبۆرگ ڕووی لە ئەڵمانیا كرد و تا ساڵی ١٩٧٨ لەو سەنتەرە بە كاری فكری و كولتووریی خەریك بوو. لە دوای شۆڕشی ئیسلامیی ئێران، لە خولی یەكەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی، نوێنەری شاری شەبستەر بوو. دوای ئەو ماوەیە تا ئێستا لە كۆلێژی ئیلاهیاتی زانكۆی تاران وانەی ئیلاهیاتی (تیۆلۆژیای) نوێ دەڵێتەوە. شەبستەری وەك نوسەر و وەرگێڕیش لە كایەی زانستی و ڕۆشنبیریی ئێراندا ڕۆڵی بینیوە. چەندین وتار و كتێبی تا ئێستا چاپ و بڵاوكراونەتەوە. لە كتێبە ناودارەكانی دەتوانین ئاماژە بەوانە بكەین: *چەند لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی وەحی و قورئان* (وەرگێڕان)، *هێرمێنۆتیك، و كتێب و سوننەت* (چاپی یەكەم لە ١٩٩٦)، *ئیمان و ئازادی* (١٩٩٧)، *ڕەخنە لە خوێندنەوەی ڕەسمی بۆ ئایین: قەیرانەكان، دژایەتییەكان، ڕێگەچارەكان* (٢٠٠٠)، *ڕامانێك لە خوێندنەوەی مرۆڤانە بۆ ئایین* (٢٠٠٤).

* *موحسین كەدیوەر لە ساڵی ١٣٣٨ كۆچی هەتاوی (بەرامبەر ١٩٥٩ز) لە ئێران لەدایكبووە. دوای تەواوكردنی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە شیراز، لە ساڵی ١٩٧٧ لە زانكۆی شیراز دەستی كردووە بە خوێندنی ئەندازیاریی كارەبا و ئەلیكترۆنیك. لە ساڵی ١٩٨٠ەوە بۆ ماوەی ١٧ ساڵ لە حەوزەی زانستیی قوم فیقە، ئوسوڵ، فەلسەفە، كەلام، عیرفان و تەفسیری خوێندووە. هەروەها دكتۆراشی لە بواری فەلسەفە و كەلامناسیی ئیسلامی لە ساڵی ١٩٩٩ وەرگرتووە. كەدیوەر چەندین وتار و لێكۆڵینەوەی لە بواری فكر و فەلسەفە و فكری سیاسیی بڵاوكردۆتەوە و تا ئێستا چەند كتێبێكی چاپكردووە، لەوانە «تیۆری دەوڵەت لە فیقهی شیعەدا» كە لە ساڵی ١٩٩٧ بڵاوكراوەتەوە.*

# عەقلانیەت

## جۆن کۆنتگهام و خوێندنەوەیەك بۆ مێژووی عەقلانیەت

## فەلسەفە: پرسیارێکی مرۆییە لە بوون و بوونایەتی (الوجود والکینونە)

نەجمەدین سمان

و: چالاك سەلاح

لە پۆلین کردنێکدا کە تا ئێستاش کاری پێ دەکرێت دادوەر (طلیطلة)ی ئەندەلوسی (صاعدی کوڕی ئەحمەد) دەڵێت: هەموو نەتەوەیەك لە دوو چین پێکهاتووە, یەکەمیان بایەخ بەزانست دەدات. دووەمیان بایەخی پێنادات, بگرە دژیشی دەوەستێتەوە جا لە رووی زانینیەوە بێت یان نەزانیەوە, ئەم جۆرەی دووەمیان لەدوای رووخانی غەرناتەوە لە ماوەی چەرخی دووەمی فەرمانڕەوایی پاشا خێڵەکیەکاندا گەشەی سەندوو, لە ئێستای عەرەبی دا هێشتا وەسفەکانی (صاعدی کوڕی ئەحمەد)ی بەسەردا دەچەسپێ لەو رووەوە کە "هیچ سودێکی حەکیمانەی لێوە نەگوێزراوەتەوەو ئەنجامی هیچ بیرۆکەیەکی تیادا بەدی ناکرێ".

## عەقلانی کێیە؟, Rationalist

جۆن کۆنتگهام لە کتێبەکەیدا بەناوی عەقلانییەتەوە: فەلسەفەیەکی تازەگەرانە دەخاتەڕوو بە پوختەیەکی تازەگەرا بێخەوش لە عەقلانیەتی فەلسەفی و لە ئەفلاتونەوە هەتا ئەمڕۆ, دوور لە پیشەی ڕۆژئاواییەکان– فەیلەسوفی عەقلّی عەرەبی "ئیبن روشد و ئەوانی دی" لە هاوکێشەیەکی دوولایەنەدا: لایەنی یەکەمی بەرز ڕاگرتنی ڕۆژئاواییەکانە لەوەی کە بەدەستیان هێناوە, لایەنی دووەمی بەسبوونی عەرەبەکانە لەوەی کە بە تێپەڕبوونی (کات) ڕۆژگار بەدەستیان هێناوە, و تێبینی دووەم کە لەکورت کردنەوەکەی (کوتنگهام)ەوە تێبینی دەکرێ, خۆ گێل کردنیەتی لە بەشدارییە فەلسەفییەکانی فەرەنسییەکان لە کتێبەکەیدا, بەتایبەتی قوتابخانە فەلسەفییە تازەکانیان.

عەقلانی لە گۆشەنیگای (کۆتنگهام)ەوە ئەو کەسەیە کە باوەڕی بە عەقڵ و بە پێویست زانینی هەیە وەك مەرجێکی پێشینە بۆ هەموو باسێکی فکری, ناوەڕۆکەکەی ئەوەیە (کە مرۆڤی عەقلانی بە مانا فەلسەفییەکەی, مانای ئەوە نییە کە نکۆڵی لە بوونی خودا دەکات) هەندێ لە بەناوبانگترین فەیلەسووفە عەقلانییەکان خودایان لە چەقی سیستەمە فکرییەکانیان دانابوو.

لەگەڵ ئەوەشدا مێژووی پرسیارکردن لە (عەقڵ) لە ڕۆژهەڵاتەوە دەست پێدەکات لە پاشەکشێ کردنیدا بەرەو ڕۆژئاوا.

کۆنتگهام خۆی بە دوور دەگرێ لە "کۆنفۆشیوسی" و پرسیارەکانی کتێبی (تاو تە.کینغ) هەروەها لە تێکڕای زەردەشت و بوداو کلتووری غنووسی سوریە کۆنەکان. بۆ ئەوەی لە ئەسینای گریکیەوە دەست پێبکات و, لە (سوکرات)ەوە کە جەختی کردووەتەسەر بەکارهێنانی عەقڵ, لەبەر ئەوەی "ئەو دنیایەی کە تاقی نەکرابێتەوە شایەنی تیادا ژیانی نییە" و ژیانی خۆی لە پێناوی باوەڕبوونی بە عەقڵ و مومارەسەکردنی سەربەخۆیی دا بەخشی, لە ساڵی ٣٩٩ پ.ز بە دوایدا (ئەرستۆ)

بەتیۆرەکەی لە سروشتیی مرۆیی دا, وایکرد عەقڵ سیفەتێکی جیاکەرەوەبێت کە مرۆڤی پێجیابکرێتەوە بەوەی کە بوونەوەرێکی عاقڵە.

بە جەخت لەسەر کردنەوەی لە کتێبی (ئەخلاق)دا بەوەی کە خۆشبەختی مرۆڤی رەسەن وابەستەیە بە مومارەسەکردنی توانا عەقڵیە تیۆرییە پوختەکانیەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا (ئەرستۆ) بە مانای تەکنیکیەکەی عەقلانی نەبووە, سەرباری جەختکردنەوەی زۆری لەسەر (عەقڵ و عاقڵی), وەك دیارە چەمکی (عەقلانیەت) لای کۆتنگهام فراوان و هەمەڕەنگە.

زۆربەی بیریارە رۆشنگەرە ئەوروپیەکان لە سەدەی (١٨)دا بەگشتی وا پێناسە دەکران کە عەقلانین. لە کاتێکدا (لایبنتس) بە ئاشکرا لایەنگیری قوتابخانەی (عەقلانی) بووە, بە دڵنیاییەوە (دیڤد هیوم) لە دەرەوەی ئەو قوتابخانەیە دەبینینەوە. و لە کاتێکدا کارەکانی (بتراند راسل) بە شێوەیەکی تر دەوڵەمەندمان دەکات لەمەڕ ئاڵۆزی سیفەتی (عەقلانی) پشتگیری راسل بۆ عەقڵ و پێویستبوونی دژی ناعەقلانیەتی (لورانس) وادەکات لە خۆوە بە مانایەکی فراوان بە (عەقلانی) ناو ببەین, هەرچەندە هەموو پەیڕەو و پرۆگرامە فەلسەفییەکانی سەر بە کلتوری ئەزموونکارییە, بەمەش دەکەوێتە ململانێیەکی نیمچە گشتییەوە لەگەڵ تیۆری عەقلانیەتدا بە مانا تەکنیکیەکەی ئەزموونیە.

### ئەزموونکار: مێروولە...عەقلانی: جاڵجاڵۆکە..

(عەقلانییەکان) جەخت لەسەر ئەو رۆڵە دەکەن کە عەقڵ پێیهەڵدەستێ, بە جیا لە هەستەکان لە بەدەستهێنانی مەعریفەدا, لەکاتێکدا ئەزموونگەراکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە لە بەدەستهێنانی مەعریفەدا, لەکاتێکدا ئەزموون گەراکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە مەعریفەی مرۆیی هەموویان لە ئەزموونی هەستیەوە سەرچاوە دەگرن, لەوکاتەدا کە عەقلانیەکان, هەست وا دەبینن کە سەرچاوەی گومانە جەخت

کردنەوەیان لەسەر (مەعریفەی پێشینەیی) بەو پێیەی مەعریفەیەکە لەپێش ئەزموون کردنەوە هەیە, بەتەنیا بە (رووناکی عەقڵ) جیا لە ئەزموون.

لەکاتێکدا کە ئەزموونگەراکان وای دەبینن کە هەموو ئەوانەی مرۆڤ پێشینە دەیزانێ لە کۆمەڵی "دەستکەوت و دەستهاتەکان" هیچ زانیارییەکی بەرچاو (ملموس) ناخاتەڕوو, بۆ نموونە: (هەموو رەبەنەکان هاوسەریان نییە).

دانەر بەوە کۆتایی پێ دەهێنێ کە دنیای "ئەنگلۆسەکسۆنی" کراوەترن, بۆ تێڕوانینە ئەزموونی ئەوەی کە پەیوەندی بەزانستی سروشتییەوە هەیە, کە بە پرۆژەیەکی عەقڵانی دادەنێن لە توێژینەوەی پوخت و ئەبستراکت و سەربەخۆ لە ئەزموونە هەستییەکاندا. یارییەکی بەکۆمەڵ پشتی بە قوڵبوونەوەی خودی تاك بەستووە و جگە لە بەهایەکی زانستی کەم هیچی تر نییە, ئەوەش هەڵوێستێکە کە (فرانسس بیکۆن) پێش سێ سەدە ئاشکرای کردووە, دەڵێ: "ئەزموونگەراکان وەکو مێرووله وان هەموو شتێ لە شوێنی سود لێوەرگرتندا هەڵدەگرن و کۆدەکەنەوە, بەڵام عەقڵانیەکان وەك جاڵجاڵۆکە وان دەزوو لە خۆیان دەناڵێنن".

ململانێی نێوان ئەزموونگەراکان و عەقڵانیەکان درێژکراوەی ململانێی نێوان (ئەپۆلۆییەکان) عەقڵیەتی پوخت و (دیۆنۆزیسیەکان) لە سروشتی مرۆییدا, لەبەر ئەوە دەبینین (نیچە) لە فەلسەفەکەیدا نهێنییە (دیۆنۆ زیسیەکان) بەرز رادەگرێ و زۆر رقی لە (ئەرستۆ) دەبێتەوە, کاتێ "فەیلەسووفەکان بنچینەدانەری رۆشنبیری یۆنانی بوون" هەروەها لە گومانی خۆی بەرامبەر بەهای عەقڵی پوخت, و رۆماننووس (د.ه.لورانس) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە مەعریفەی راستەقینە لە کۆی گشتی ئاگاییەوە دێت, بەهەمان ئەو برەی کە لە مێشك و عەقڵەوە دێ لە سکیشەوە دێت, عەقڵ جگە لە بیرکردنەوەو شیکردنەوە هیچی دی لە تواناداا نییە" لە شەڕی واڵای نێوان عەقڵانی و ئەزموونگەراکاندا رێگەی بۆ خۆبەدەستەوەدان نەهێشتۆتەوە, بۆ سەرکەوتنی لایەکیان, بەجۆرێ مێژووی فەلسەفە توندترین ئاژاوەی هەڵگرتووە لەو شێوازەی کە کێشە فەلسەفییەکان تیایدا لە یەکلایی کردنەوەی کۆتاییدا بە بنبەست گەیشتوون.

**لە ئەفلاتونەوە باوکی عەقلانیەت, بۆ رۆڵەکانی (کورەکانی).**

ئەفلاتون لە کتێبی (کۆمار)ی دا جیاوازی دەکات لەنێوان مەعریفە و باوەڕدا, مەعریفە پابەندە بەوەوە کە هەیە لەکاتێکدا باوەڕ پابەندە بەوەوە کە هەیەو ئەوەشی کە نییە, بەڵام (جوانی) بۆ خۆیی و لە خۆیدا جوانە, واتە جوانی رەهایە کە لە ژیانی رۆژانەدا رێکەوتی ناکەین و هەستەکان پەی پێنابەن بگرە لە سروشتێکی تەواو ئەبستراکتدایە, بە رێگەی عەقڵی پەتی لێیتێدەگەی.

ئەفلاتۆن سورە لەسەر ئەوەی کە پێویستە مەعریفەی راستەقینە لە دنیای هەستیەوە بۆ دنیای رێتێچووەکان بگوێزرێتەوە کە بە تەنیا عەقڵ لە بابەتەکانی تێدەگات, نەك هەموو عەقڵێکیش بەڵکو عەقڵی فەیلەسووفەکان, کە بەپێی قسەی ئەو "کۆتایی نەهامەتییەکانی مرۆڤایەتی نابینین بۆ ئەوەی فەیلەسوفەکان ببن بە پاشا", ناکرێ بەشێوەیەکی پارچە پارچە لە واقیع تێبگەین, بەڵکو دەبێ لە گشتێتی بوونیدا لێی تێبگەین, پێویستە فەیلەسووف تێگەیشتنێکی یەکگرتووی لەلابێ- ئەمەش ئەوەیە کە سپینۆزاش جەختی لەسەر کردەوە. ئەزموونگەراکان لە سەدەی (١٧-١٨)دا بەپرسیارێکی جەوهەری بەرپەرچیان دایەوە کە "ئایا تێگەیشتنی یەکگرتوو بۆ واقیع لە رووی (پراکتیکیەوە) کردەییەو دەکرێ هەبێ)"؟

**ئەرستۆی ئەزموونگەرا... ئەفلاتۆنی عەقڵانی.**

ئەرستۆ بایەخێکی (نا ئەفلاتۆنی) بە هەڵسوکەوت و بونیادی شتە مادییەکان دەدا لە جیهانی نیشانکراودا, بەڵام بە بەراوردکردنی بە ئەنتۆلۆژیا- گەڕان بەدوای ئەوەی کە لە دنیادا (هەیە) دەستدەکەوێت- ئاماژە بەوە دەکرێ کە لە ئەفلاتۆن زیاتر لە زەوی (واقع)ەوە نزیکە. ئەو پەیرەوە ئەزموونگەرایەی داڕێژا کە دەڵێت: "هیچ شتێ لە عەقڵادا نییە ئەگەر پێشتر لە هەستەکاندا نەبووبێ", ئەوەیە کە دواتر "تۆما ئەکوینی" بینایکرد. ئەرستۆی قوتابی ئەفلاتۆن بە توندی (بیردۆزی رەهاگەرا) رەتدەکاتەوە. لەگەڵ مامۆستاکەیدا وادەبینێت کە مەعریفە هەمووی پێکەوە بەستراون, سوورە لەسەر

جیاوازی میتۆدی ئەخلاق لە میتۆدی زانست, لە خاڵی تریشدا جیاوازە لێی کەوای لە فەیلەسووفە ئەزموونگەراکان کرد دوای چەندین سەدە بە باوکی ئەزموونگەراکانی دابنێن لە ململانێ سەرەتاییەکانیدا.

## من بیر دەکەمەوە... کەواتە من هەم.

رینە دیکارت (١٥٩٦-١٦٥٠) فەلسەفەی لە کلاسیکەوە بۆ نوێگەری گواستەوە, لەو رووە کە "فەیلەسوف" لەلای لەهیچەوە دەستپێدەکات, بە رزگاربوونی لە گریمانەو بیروڕا پێشینەکان کە لەدایك و باوك و مامۆستاکانیەوە بەدەستیهێناوە, پرنسیپی "گومانی دیکارتی" لەسەر سێ بنەما راوەستاوە: گومان لە بوون, مادام رۆحی شەڕانی هەیە, بەڵام "تاکی دیکارتی" دەزانێ کە هەیە (موجود) و بیرەوەرێکی بیرکەرەوەیە, کاملە و دەرك بە کەموکووڕییەکانی دەکات, ئەوەش ئەو بیرۆکەیەیە کە خودا لەناخی دا دایناوە, وەکو (ئەفلاتۆن) سوورە لەسەر جیاکردنەوەی عەقڵ لە هەست, بۆ گەیشتن بە زانینێکی عەقڵی پوخت, کە کلیلەکەی "رووناکی سروشتییە" ئەوەش توانایەکی خۆرسکە خودا لە عەقڵماندا چاندوویەتی بۆ گەیشتن بە حەقیقەت.

دریکارت وادەبینێ فەلسەفە درەختێکە: میتافیزیکیا رەگەکەی و فیزیا قەدەکەی و زانستەکانی تر لق و پۆپەکانی پێکدەهێنێن, بەڵام پێشنیاری بۆ وازهێنان لە (چۆنایەتی) لە بەرژەوەندی "چەندێتی" بووە سیمایەکی جیاکەرەوەی زانستی نوێ. کاتێ کە (نیوتن) هات بۆ ئەوەی هاوکێشەی بیرکاری بۆ مرۆڤایەتی بەرهەمبهێنێ کە پێوانەیەکی حەقیقی دەداتێ بۆ پێشبینی کردنی رێڕەوی سروشت و بەردەوام بوونی.

## سپینۆزا: هەڵهێنجێنەر- استنباطی

لە بەرامبەر ئەندازەی "ئیقلیتس"دا, سپینۆزا تیۆرەی میتافیزیکی گەردوونی دانا, لە جەوهەرییەکی سەربەخۆی هەتاهەتاییەوە دەستی پێکرد کە هۆکارەکەی لە خۆیدایە, بە پێویست و بەشێوەیەکی ئەزەلی هەیە, لێرەدا گونجانێ لەنێوان بیرۆکەکەو شتەکەدا

هەیە, بەجۆرێ هەموو بەشێ لە سروشت گونجاوە لەگەڵ گشتدا, ناكرێ كردار یان دژە كردارێك هەڵبسەنگێنرێ مەگەر لەسەر ئاستی وابەستەبوونی نەبێ بە بونیادی گەردوونەوە لە گشتێ تیدا.

سپینۆزا: دوانەی دیكارتی رەتكردەوە كە عەقڵ لە جەستە جیادەكاتەوە بەو پێیەی كە هەردووكیان هەمان شتن, كاتێ هەموو شتێ لە بووندا مەرجەكە هەبێ و بەشێوەیەكی تایبەت ئیشبكات بەپێی پێویستی سروشتی خودایی, بەڵام سپینۆزا دان بە بوونی بڕێك لە "ئازادی تاكەكەسی"دا دەنێت لەلای مرۆڤ, لەو توانایەدا رەنگدەداتەوە كە هەموو شتێ كە لە رێگەیەوە هەوڵدەدات بۆ ئەوەی لە بوونی دا بەردەوام بێت, بە جەختكردنەوە لەسەر پرنسیپی زۆرلێكردن (الجبرية) بە جۆرێ لە هۆیەكی دیاری كراودا هۆكارێ بەپێی پێویست پەیدا دەبێ.

دوای ئەو "لایبینتس" هەستا بە وەسفێكی فەلسەفی گشتی گشگیر (شمولی) بۆ بوون: بەوەی كە دانی بە فرەیی لە جەوهەردا نا, بەگوێرەی ئەرستۆ, كە قەزیەكان دوو بەشن: یەكەمیان راستیەكانی عەقڵن, كە گرنگن و هەڵوەشاندنەوەی مەحاڵە, دووەمیشیان راستیەكانی واقیعە, كە چاوەڕوانكراوەو هەڵوەشاندنەوەی شیاوە, بۆ ئەوەی بەمە بنچینە بۆ پرنسیپی (دژیەك) دابنێ كە دان بە راستی هەر قەزیەیەكدا دەنێ ئەگەر دژەكەی دژیەكی تیادابێ, بەوەی كە یەكێتی تاكەكەسی بۆ جەوهەر (موناد). بە رابردوو باركراوەو بەستراوە بە داهاتووەوە. هەموو (مونادێك) بە تەواوی سەربەخۆیە لە جەوهەرەكانی تر, لەبەر ئەوەی ئاوێنەی درك كردنی هەستی زیندووە بۆ بوون, كە خودا لە خەڵق كردنی بووندا, پێویستی كردووە (واجبی كردووە) لەسەر هەموو (مونادەكان) كە پێكەوە بەشێوەیەكی سەربەخۆ كار بكەن بۆ پێكهاتنی گشتی كامڵتر, كە ئەو لەسەر شێوەیەتی. خودا ئەو جەوهەرە باڵایە بەو یاسایەی كە دایناوە بۆ هەموو شتێ, سەیری هەموو شتێكی كردووە, تەنانەت جەوهەریش.

**عەقلانیەت و دژە شۆڕشی ئەزموونگەرایی.**

"جۆن لۆك" تیۆری "بیرۆکە خۆڕسکەکانی" خستەژێر ناچاری" پشکنینی وردەوە بەو پێیەی کە بنچینەیەکن بۆ فەلسەفەی ئەفلاتۆن (تیۆری ئایدیا) بۆ پێشکەوتنی لای (دیکارت) بۆ (نوری خۆڕسك), لۆك جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە گەیشتن بە (زانین) مەعریفە, پێویستی بە مەعریفەی پێشینە (قبلیە) نییە, و بە یارمەتی هەڵهێنجانی (استنباطي) خۆڕسکەوە نابێ کەوا دەبینێ پیتە چاپکراوەکان لە زەینی مرۆڤدا, لەگەڵیدا لەدایکبووە, لای "لۆك" زەین لەکاتی لەدایك بووندا لەوحێکی ساف و لاپەڕیەکی سپی خاڵییە لە هەر پیت و مەعریفەیەك بە هەموو جۆرەکانیەوە, بەدەستهێنانی مەعریفە تەنیا لە ڕێگەی ئەزموونەوە دەبێ نەك پێشینەی خۆڕسك.

هەمان ئەو شتەیە کە (دیڤد هیوم)ی سکۆتلەندی بەدوایدا چوو, جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە منداڵ ئەگەر لە شوێنێکدا بەند بکرێ هیچ ڕەنگێکی تیادا نەبێ جگە لە –ڕەش و سپی– هەتا دەبێ بە مرۆڤێکی کامڵ هیچ بیرۆکەیەکی پێشینەیی لەسەر سەوز و سوور لا نییە بە قەدەر ئەوەی کە لەسەر تامی گوێچکە ماسی و ئەناناس هەیەتی کە لە منالی دا چێژی نەکردوون.

فەیلەسووفی عەقلانی "لایبینتس" دەستیکرد بە بەرپەرچدانەوەی "جۆن لۆك" بە باوەڕهێنان بەوەی کە دەرك پێکردنی هەستی مەعریفە دێنێتە کایەوە, بەڵام بەس نییە بۆ وەرگرتنی, کاتێ تیۆرێکی تەواو کامڵمان لە مەعریفەدا نییە کە دان بەو بەشداری کردنەدا بنێ کە عەقڵ خۆی پێی هەڵدەستێ, ئەو بیرۆکەیە ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لە بەشدارییە "ڕاست و ڕەوانەکانی "کانت"دا لەنێوان ئەزموونگەرایی و عەقلانی و لە پشتپێبەستنەکانی "نعم چۆمسکی"دا لە سوربوونی لەسەر گرنگی بونیادی زەینی پێشینەدار "پێشینە هەبوو"و تەنانەت لە مەودای زمانیشدا.

"هیوم" لە هێرشی بۆ سەر عەقلانیەکان, جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە بیرو بۆچوونەکانمان لە ئەزموونەوە سەرچاوە دەگرێ کە لە عەقڵدا هەیە. هەر ئەمەش بوو

"کانت"ی بە ئاگا هێنا لە خەونە دۆگمایستەکانی، بۆ ئەوەی باشترین کتێبی پێشکەش بکات: "رەخنە لە عەقڵی پەتی"کە بانگەشەی هەڵوێستێکی دژە عەقڵانی دەکرد.

مەبەست لە بەشی دووەمی لە باسی دیاریکراویدا بە ناوی (جەدەل)ەوە، بۆ لاوازکردنی بانگەشەکانی میتافیزیکیای عەقڵانی بوو، بە جەختکردن لەسەر ئەوەی کە بابەتەکانی "مەعریفەی رێتێچوو "دەرکەوتەکانە" واتە بابەتەکانی جیهانی فیزیاییە کە قابیلیەتی نیشانەکردنی ئەزموونی هەبێ، لە هەمانکاتدا، بە رەخنەگرتن لە تێڕوانینی ئەزموونگەراییانەی (لۆك) و (هیوم)، کە وا لە دەرکەوتنە هەستیەکان دەکات بە تەنیا سەرچاوەی مەعریفەبن، بە وتەی ئەو "بیروبۆچوون بەبێ ناوەڕۆك بەتاڵە و رووداوەکان بە بێ تێگەیشتنیان کوێرانەیە" بە وەرگرتنی چەمکی (وشە بنچینەییەکان) لە میتافیزیکیای ئەرستۆوە بەو پێیەی کە سەرچاوەی گشت زاراوەکانی لێتێگەیشتن، بەو سیفەتەی کەوا زاراوە پێشینەکان و ئەزموون لە رێگەی ئەوەوە نەبێ روو نادات و، وابەستەیە بە پێویستی و ئەزموون پێکەوە، (کانت) ئەم لێك نزیك بوونەوە مەعریفیەی ناونا "شۆڕشە کۆپەرنیکۆ سیەکەی" لەسەر شێوەی راڤەکردنەکانی "کۆپەرنیکۆس" بۆ سوڕانەوەی خۆر و ئەستێرەکان، بەگریمانە کردنی ئەوەی کە زەوی نیشینەکان (بوونەوەرانی سەرزەوی) خۆیان دەسوڕێنەوە نەك ئەوان (خۆر و ئەستێرەکان).

"دیڤد هیوم" بۆ ئەمە پێشی کەوت کاتێ کە چەمکی "پەیوەندییە هۆکارییەکان- رابطة السببية"شیکردەوە، لەو رووەوە کە هیچ پێویستییەکی راستەقینە لە دونیادا بوونی نییە، بەڵکو هەستکردن بە پێویستی لە زەینی مرۆییەوە سەرچاوە دەگرێ، (جۆن کۆتنگهام) لە کتێبەکەیدا ئاماژەی بە کتێبەکەی (کانت) "رەخنە لە عەقڵی پەتی"دەکات وەك گرنگترین کاری فەلسەفی هاوچەرخ و، وەك خاڵی وەرچەرخان بۆ هەر گفتوگۆیەك لەنێوان عەقلانی و ئەزموونگەراکاندا، وەك چۆن فەلسەفەی عەقڵانی لە سەدەی بیست دا لەسەر دەستی (فیختە)و (هیگل) دەستی پێکرد.

لە هەڵکشانی عەقڵانیەتدا بەرەو سەدەی بیست کلتووری (هیگل) بەدیاردەکەوێ وەك فەلسەفەیەك کە (دیالەکتیك، و پرسیارکردن) دەوروژێنێ، بەرەو خۆگیل کردن و

پشتگوێخستن, تەنانەت لە کلتووری ئەنگلۆسەکسۆنیی دا هەتا سەرەتاکانی سەدەی بیست لە ئینگلتەرا و بەڕادەیەکی کەمتر لە ئەمریکادا.

## هیگڵ: دیالەکتیکی عەقڵانی..

وەسفی دیالەکتیانەی, "هیگڵ" بۆ دەرکەوتنی هۆشیاری زاتی لە کتێبەکەیدا بەناوی (فینۆمینۆلۆژیای گیان) پێگەیەکی زانستی گرنگ لە گەشە سەندنی بیری عەقلانی دا پێکدێنێت, بەو سیفەتەی کە دەرگای رزگاربوونە لەو ناڕەحەتیانەی کە زۆربەی بیریارە گەورەکانی میتافیزیکیا لە سەدەی هەژدەیەمدا تووشی بوون, بەجەخت کردنەوەی لەسەر ئەوەی کە فەیلەسووف نابێ ئەزموونی هەست پێکراو رەتبکاتەوە, لەبەر ئەوەی درك پێکردنی هەستپێکراو ئاڵۆزیەکانی لادەبات لەوەدا کە فەیلەسوف توخمە بەنرخەکانی دەپارێزێت, بۆ دووبارە پێکەوە بەستنەوەی لە جۆری مەعریفەی بالاتر لە درك پێ کردنی رۆژانەمان, لێرەدا بە پشتبەستن بە ئەفلاتۆن کە بیرکردنەوەی جەدەلی ململانێیەکی بالادەستی عەقڵە لە هەوڵدانە پێشکەوتووەکانی دا بۆ بەدیهێنانی دوایین تێگەیشتنی فەلسەفی. بە وەرگرتنی ئەو بیرۆکەیەی (سپینۆزا) کە دەڵێت: تێگەیشتن لە رووداوو وشە تایبەتەکان پێویستییان بەپێکەوەبەستنی هەیە لە "گشتێکدا" کە هەریەکێکیان هەمووان بگرێتەخۆی. بە درێژەپێدانی بیرۆکەی "محاجە مفارفە- ئارگۆمێنتی جیاکار"ی (کانت) کە پەردەی لە رووی بونیادی تێگەیشتنی عەقلی لاداوە, کە ئەوەش پێشتر لە ئەزموونی مرۆیی دا پێشبینی کراوە.

## "ئەزموونگەرایی نوێ" وەك هێرشێك بۆ سەر عەقڵانییەت

زۆری نەخایاند بیرووبۆچوونە هیگلیەکان لەسەرەتای سەدەی رابردووەوە, رووبەڕووی هێرشێکی بەهێزی "فەلسەفەی ئەزموونگەرایی و -الوضعیة المنطفیة- پۆزەفیزمی لۆژیکی" بووەوە, کە رێگەی بۆ سەرقاڵی فەلسەفی (بتراند راسل) خۆشکرد و لە گەڵیشیدا (فیتگشتاین)- لەو رووەوە کە نایزانن- ئەوەش کاتێ کە (راسل) بەرگری

لە تێڕوانینی (دیڤد هیوم) کرد, بەوەی کە پێویستە مەعریفەمان لەسەر دنیا لەسەر ئەزموونی هەستی بوەستێ. زاراوەی مەعریفە بە ناچاری زاراوەیەکی ئەزموون گەراییە, ئەمەش لە پاڵنەرێکی مەعریفیەوە هاتووە (سەرچاوەی گرتووە) کە گرنگی دانی بەو مەسلەیەی کە" چۆن مەعریفەی مرۆیی پەیدا دەبێ, چۆن قسەکانمان دێنەدی".

لەکاتێکدا "فتگشتاین", بێئەوەی ببێتە لایەنێك لە ململانێی نێوان میتافیزیکی و ئەزموونگەراو عەقڵانیەکان, بیرۆکەی "وێناکردن"ی پێشنیارکرد, بەڵام ئەزموون گەراکان چەکێکی تریان لە تیۆرەکەیدا دەستکەوت, لەو رووەوە کە (ونیا) زمانی ئاماژەکردنە بۆ واقیع, وەکو چۆن لە نووسینی مۆسیقی دا(نۆتە) و نووسینی دەنگی (ئەلفابێ) دا هەیە, هەتا لە مانا زۆر سادەکانیشدا کە دەینوێنێ, بە جەختکردن لەسەر ئەوەی کە هەر بەهایەك هەبێت پێویستە لە دەرەوەی دنیادابێت, یان لە دەرەوەی ئەوەی کە واقیعە, ئەمەش ئەوەیە کە ئەزموونگەراکانی بە خاڵی وەرچەرخانی نوێی دادەنێن, دژ بە عەقڵانیەتی میتافیزیکی, لەو رووەوەی کە (فتگنشتاین) جەخت لەسەر دەربڕینی زانستی دەکات وەك نموونەیەکی پڕ مانا لەکاتێکدا کە پێشڕەوە میتافیزیکییەکان بەرپەرچی دەدەنەوە بەو سیفەتەی بێمانایە لەم بارەیەوە دەڵێت: ئەوەی کە ناکرێ باسی لێوە بکرێ پێویستە پشگوێ بخرێ.

### "بازنەی ڤییەننا" پۆزەتیڤزمی لۆژیکانە

ئەم بازنەیە لە بیست و سییەکانی سەدەی رابردوودا گەشەی سەند بە نوێنەرایەتی دیارترین ئەندامانی وەك (مورتیس شلیك) و (رودولف کارناپ) و (ئۆتۆنیورات) و هاوکاری پایە بەرزیان لە جیهانی ئەنگلۆسەکسۆنی دا "ئای, جەی, ئایەر" کاتێ کە تەحەدای عەقڵانیەتیانکرد بەوەی کە هەر دەربڕینێك کە ئاماژە بۆ واقیعێك بکات کە سنووری ئەزموونی هەستی ببەزێنێ ناتوانێ ببێتە هیچ بەڵگەیەکی حەرفی باوەڕپێکراو. کەواتە چۆن دەکرێ بانگەشەکانی (سپینۆزا) دەربارەی (جەوهەر) و بانگەشەکانی (لایبینتس) دەربارەی (مۆنادەکان)ی (هیگڵ) دەربارەی (رەها) ناچارکردن بۆ

بەدەستهاتن و لێکۆڵینەوەی ئەزموونی هەتا دانیان پێدابنرێ کەوا مانادارن؟ (ئای. جەی. ئایەر) وای بۆ دەچوو کە بەڕاستی فەلسەفە بەبێ زانستی بوونی بەتاڵە، پێویستە فەلسەفە گەشە بکات بۆ ئەوەی لۆژیکی زانستی بەدەست بهێنێ، هەتا لە بازنە زارەکییە داخراوەکانی دەرچێ. نووسەر (مەبەستی کوتنگهامە– وەگێڕ) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە کاتێ پۆزەتیفیزمەکان (وضعية) لە زانستی سروشتی دا گوتاری ماناداریان بینی، خۆیان لە بارێکی ناهەمواردا بینیەوە، یان دەبوایە فەیلەسوفی پۆزەفیتیزمی پێوەرەکانی خۆی لە بەدیهێنانی دا تەسك بکاتەوە بە ڕادەیەك تیایدا خۆی لە گشتاندنی زانست و دەستەواژە تیۆرییەکانی بە دووربگرێت، یان پێوەرەکانی بەڕادەیەك لاواز بکات رێگەبدات بە کرانەوەی بەڕووی تێڕامانە میتافیزیکییەکاندا. بۆ ئەمەش "کارل پۆپەر" لە شیاو بوونی بەتاڵکردنەوەدا دەڵێت: تیۆر شایەتی (قابیلی) بەتاڵبوونەوەیە بە تاقیکردنەوە، هەتا ئەگەر دەشتوانرێ لێیبکۆڵرێتەوە، هەروەها فەیلەسووفە رێژەگەراکانیش بەدوای ئەمەدا رۆشتن (هەنگاویان بۆ ئەمەنا).

فەیلەسوف (کواین) ئەوە رەتدەکاتەوە کە هەر جیاکارییەك لەنێوان ئەوەی کە (شیکارییە) و ئەوەی کە (پێکهاتەیە) ئەوە باوەڕێکی نا ئەزموونییە بۆ ئەزموونگەراکان، بگرە ئەوە میتافیزیکیایەکی ئیمانی رووتە، هەروەها هێرش دەکاتە سەر فەلسەفەی (کورتبڕی– اختزالی) Reducationism بە کۆتایی پێ هێنانی بەوەی کە رووبەڕووی دنیا بووەتەوە تاقە دەستەواژە نییە، بەڵکو سیستەمێکی گشتییە لە بیروباوەڕ و تیۆرەکانی زانستی گشتی لە مەودای هێزدا، لە تیشکی ناوك دەچێ لە گەردیلەدا، بەڵام مەرجەکانی بریتین لە ئەزموون کردن کە لە خولگەی ئەلیکترۆنەکانی دەوری گەردیلە دەچن.

بەڵگەکانی (کوایت) "لێرەدا بەپێی (کۆتنگهام) بەرگری کردن نییە لە عەقڵانیەت، چونکە نەزمە فەلسەفییە ئەزموونگەراییەکەی تەحەدای ئەزموونگەرا دۆگماکان دەکات کە عەقڵانیەت تاوانبار دەکەن بەبێ ئەوەی گوێ لە بەڵگەو گفتوگۆکانی ناوی بگرن بۆ گەیشتن بە هەڵوەشاندنەوەو تێپەڕاندنی.

**کریبکی فەیلەسوف و زیندووکردنەوەی جەوهەرگەرایی**

(کۆتنگهام) ئاماژە بۆ هەوڵدانێکی نموونەیی دەکات بۆ عەقڵانیەت لە ئەفلاتۆنەوە تالای ئەرستۆ و هەمیشە دووبارە بوونەوەی لەدوای ئەوانیش, بۆ پەردە لەسەر لادان و دۆزینەوەی راستیە پێویستەکان, لە سروشتێکی جەوهەری دا بۆ واقیع. بە مانای تێگەیشتنی فەلسەفی بۆ ئەوەی کە پێویستە ببێت یان جگە لەوە هیچی تر کریّ ببیّ.

هەریەکە لە (دیکارت و سپینۆزاو لایبینتس)– بە پلەی جیاواز– هەوڵیاندا بۆ بنیادنانەوەی سیستەمی– فەلسەفی, کە پرنسپە جەوهەرییەکانیان پیّ نەوتین, ئەوەی کە هەندیّ جار وا دێتەپێش چاو حەقیقی بیّ, بگرە ئەوەی کە پێویستە حەقیقی بیّ– ئەمەش کارێکە بۆ فەیلەسووفی ئەزموونگەرا, وادێتەپێشچاو کە بەپێی پێویستی لە جەوهەر شێوابیّ. بەپێی (دیڤد هیوم) شتێکە بۆ ئاستی بیروبۆچوونەکان و تێگەیشتنە رووتەکان کورت دەبێتەوە, لەبەر ئەوە ئەمە ئەنجامێکی زانراوی بەڵگەیی نییە لە دنیادا کە پێوەرەکەی ئەزموونبیّ.

لێرەوە فەیلەسوف (سوك کریبك) دەستی پێکرد بۆ بەدەستخستنی چەند دەستەواژەیەکی حەقیقی کە وەسفی تایبەتمەندییە جەوهەرییەکان بکات بۆ شتەکان لە دنیادا. لەو رووەوە (زانست) بەدوای تایبەتمەندییە بونیادییە بنچینەییەکاندا دەگەڕیّ بۆ سروشتی جۆرە سروشتییەکان بۆ گەیشتن بە جەوهەرەکەی بە مانا فەلسەفیەکەی, بە پشت بەستن بە وتەکەی (ئەرستۆ) سەبارەت بە (چیەتی) جۆرە سروشتییەکان, دانەر واباس لە تیۆرەی (کریبك) دەکات دەربارەی واتاو چییەتی, وای دادەنیّ کە زیندووکەرەوەیەکی عەقڵانییەتی نامیتافیزیکییە بۆ گۆڕینەوەی بەگریمانەی (هیومی) دیڤد هیوم کە باس لە نەبوونی راستیەکانی فەراهەم کردنی زانیارییەکان دەکات لە دنیای حەقیقەتدا لەکاتێکدا (کریبك) وای دەبینیّ کە ئەمە بەتوێژینەوەی زانستی بەدی دەهێنرێت, دوای ئەمە فەلسەفە هەستا بە پەردە لادانی لەسەر چییەتی خۆی, بەم جۆرە لەو شێوە توندڕەوەی عەقڵانیەت دوورکەوتەوە کە بەردەوام ئامانجی تێپەڕاندنی ئەزموونی هەستییە, بە هەموو ماناکانیەوە, بۆ گەڕان بەدوای واقیعی جەوهەریدا.

**تیۆری چۆمسکی لە بەدەستهێنانی زماندا.**

لەکاتێکدا کە فەیلەسووفی ئەزموونگەرا "جۆن لۆك" وا دەبینێ کە زەینی مرۆیی لاپەڕەیەکی سپی و لەوحێکی سافە, چاوەڕوان دەکات ئەزموونی لەسەر بنووسرێت, عەقلانی وایدەبینێ کە زەینی مرۆیی وا دروستکراوە کە لەمەوپێش ئامادەی کردووە بۆ راڤەکردنی ئەزموون, بەشێوەیەك لە شێوەکان بەبێ روونکردنەوەی ئەوشێوەیە" کە روونکردنەوەیەکی میتۆدی بێ وەکو ئەوەی (چۆمسکی) پێیوتووە کە مرۆڤ لەدایك دەبێ و مەعریفەیەکی خۆڕسکیان هەیە" بە پرنسیپەکان کە ناوی ناوە "بنەما گشتگر و هاوبەشەکان" وەکو ئەوەی کە لە هەموو زمانەکانی مرۆڤدا هەیە, وەکو بکەری لۆژیکی و (سیستەمی پۆلەکان و رستەی ئەبستراکت و رستەی کرداری... هتد) چۆمسکی هەر بەوە وازناهێنێت و دەڵێت: لە رووی مێژووییەوە راست دەردەچێت بیروڕا سەبارەت بە بونیادی زمان بە زاراوەی عەقلانی بۆ سروشتی زمان وەسف بکەین, و پشت راستکەرەوەی بۆچوونەکانی عەقلانیەتە سەبارەت بە وەدەستخستنی مەعریفە, و ئەو دەرهاویشتانەی کە فێرکەری زمان ملکەچیەتی بە تەنیا بونیادی زمانەوانی رووت و بەرنا بۆ داڕێژراوی بۆ ماوەیی لە مێشکی مرۆڤی وەکو ئێمەدا چالاك دەکات.

لەکاتێکدا ئەزموونگەراکان تیشکدەخەنەسەر (وروژێنەر و وەڵامدانەوە) دەکەن لەبەدەستهێنانی زماندا, کاتێ کە لە هەر وشەیەك کە منداڵ گوێی لێدەبێ شێوەیەکی وروژێنەر وەردەگرێ کە عەقڵ بە فێربوون بۆی داڕێژاوە لە رێگەی پێنج هەستەوەرەکەوە. بۆ بەدەستهێنانی وەڵامدانەوە لە پاشاندا و دووبارە بەرهەمهێنانی و بەکارهێنانەوەی.

"کۆتنگهام" ئاماژە بۆ ئەو لێکچوونە دەکات کە (چۆمسکی) وێنای کردووە لەگەڵ پەیڕەوی عەقلانی تەقلیدی دا, لەکاتێکدا کە تیۆرەکەی لە بنەمای خۆڕسکی زمانەوانی دا گریمانەیەکی ئەزموونگەراییە, کە راستیەکانی دەروونزانی و فیسیۆلۆجیا رادەگەیەنێ. وەکو کردارێك لەسەر زمانەوانییەکانی ئەزموونگەری, وادەبینێ وەزیفەی گیانی ناماددی لە توانا زمانەوانییەکاندا دەبینێ کە ناکشێ و دابەش نابێ, ئەوەیە کە

خودا لە جەستەی ئێمەدا دایناوە و (چۆمسکی) هەوڵی کەشفکردنی دەدات لە بونیادی ماددی مێشکی مرۆڤدا, لەو رووەوە کە مێشك لەوەوپێش بەرنامە بۆ داڕێژراوە.

## عەقلانیەت و ئەزموونگەراو میتۆدی زانستی

لەگەڵ پێشکەوتنی بەردەوامی زانستیی دا, زۆرێك لە عەقلانیەکان کاریگەرن بە میتۆدی هەڵهێنجەری (استنباطي) مەعریفە, وەکو لای (سپینۆزا) هەیە بە جۆرێ قەزیەکان (پرسەکان) هەنگاو بە هەنگاو لە پرنسیپە سەرەتاییەکان وەرگیراون و راستیەکانی پارێزراون, چونکە دەدرێتە پاڵ ئەو پرنسیپانە, لەکاتێکدا ئەزموونگەراکان وای دەبینن کە هەڵهێنجاندنی لۆژیکی هیچ هەوڵدانێکمان پێ راناگەیەنێت جگە لە دەرەنجامی شتێ نەبێ, لەکاتێکدا کە نیشانەکەمان بۆ کەشف دەکات, لەبەر ئەمە پێویستە یاسازانستییەکان بە (استنباطي) دانەمەزرێن بەڵکو بە (استقرائی).

(کارل پۆپەر) زۆر هەوڵی دا- عەقلانی و ئەزموونگەرایی لە هەمان کاتدا پێکەوەبن- بۆ ئەوەی لەوە دوورکەوێتەوە بە پێشنیارەکەی (توانای پوچەڵکردنەوە) بەو پێیەی کە پرنسیپێکە بۆ جیاکردنەوە, جیاکاری, تیۆرە زانستییەکان لە زانست جیادەکاتەوە بە جۆرێ بونیادی هەڵهێنجاندن بۆ زانین شیاو بوونی خۆی لەدەستدا, لەکاتێکدا کە توانای روودانی دەرەنجامی دژیەك لەگەڵ ئەزموونی کردارەکی دا, بەوەیە کە رێگە بە زانست دەدات شوێنی بابەتیانەی خۆی بگرێت.

## شۆڕشی نوێ لە فەلسەفەی زانست.

ئەم شۆڕشە لە فۆرمە توندڕەوەکەیدا هەردوو نموونەی عەقلانی و ئەزموونگەرایی بۆ مەعریفە رەتدەکاتەوە, وایدادەنێ هەردووکیان لە جەوهەریاندا سەر لێشێوێنەرن, گومڕاکەرن بەجۆرێ (تۆماس کۆهن) وایدادەنێ کە هەر تیۆرەیەکی زانستی بگاتە حاڵەتی نموونەیی باوی پارادیم هەتا ئەگەر بشخرێتەڕوو کە ئەوە راست نییە پێویستە لە شوێنەکەیدا ئەڵتەر ناتیڤێکی نموونەیی هەبێ.

بەم شێوەیە ئەستێرەناسەکان لەدوای شۆڕشی کۆپەرتیکییەوە لە جیهانێکی جیاوازدا دەژیان, لەگەڵ ئەو زانایانەش دا کە لەکاتی دۆزینەوەکانی (ئەنیشتاین) دا و لەدوای ئەویشدا دەژیان, (پۆل ڤایربند) زیاتر دەڕوا کە دەڵێ : (زانستی رۆژئاوایی جگە لە ئایدۆلۆژیایەکی باڵادەست هیچی تر نییە و لاسایی کردنەوەیەکی زۆرەو ئەو مافەی نییە کە داوامان لێ بکات قبوڵی بکەین) لەکاتێکدا (کۆهن) وای بۆ دەچێت کە دونیا لە دوای هەموو تیۆرێکی تازەوە بەشێوەیەکی جیاواز دەبینرێ نەك بە حەقیقەتێکی جیاواز.

دانەر دەپرسێ: کلتووری زانستی ئێمە تا چ رادەیەك نوێنەرایەتی ئەو پێشکەوتنە دەکات کە سیستەمی فکری رابردوو کردوویانە, بێئەوەی بەرپەرچی راکەی (فایربند) بداتەوە کە دەڵێ: (پێویستە لەسەر مرۆڤـ, کە ئایدۆلۆژیاکان بخوێنێتەوە وەکو چۆن ئەو سەربوردە سەیرانە بخوێنێتەوە کە چەندین شتی بریقەدار دەڵێن, و لە هەمانکاتدا لە چەند دۆریەکی گەورە پێکهاتوون) یان لەگەڵ فەیلەسوف رێژەگەرا (پیتەر فێنتش) دا کە دەڵێ "پێوەرەکانی لۆجیك بەخشراوێکی راستەوخۆ نییە, بەڵکو لە چوارچێوەی چەند رێگەیەکەوە دروست دەبێ بۆ شێوەی ژیانی کۆمەڵایەتی, ناتوانین لەخۆیدا نەبێ لێی تێبگەین".

(کۆتنگهام)دان بە هاوسۆزی خۆی لەگەڵ عەقڵانیەتدا دەنێت لە میانەی کتێبەکەیدا چەند کێشەیەك هەیە کە رووبەڕووی عەقڵانی دەبێتەوە لە دیاری کردنیدا لەوەی کە تیۆرێکی دیاریکراو لە ئاستی پێشکەوتنی دایە بەسەر پێشینەی خۆیدا یان نزیکتر نییە لە حەقیقەتەوە, بەخستنە یادی ئەوەی کە هەر فەیلە سوفێکی رێژەگەرا– لە میراتگری ئەزموونگەرایی– لەوەدا کەوتنە ناو بیرکردنەوەیەکی رەسمی کە بە عەقڵانیەت بناسرێت. بەڵکو چەند ئاراستەیەکی بەیەکدا چوو دروستدەکات کە بە کەلەپوری عەقڵانی ناودەبرێ.

# سەرەتاکانی رۆشنگەری لای کورد

## رەنگدانەوەی لە یەکەمین رۆژنامەی کوردیدا

## خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنە

بەهات حەسیب قەرەداخی

### پێشەکییەکی پێویست

ماوەیەکی زۆربوو چەند پرسیارێکمان لە لا دروست ببوو، کە ئایا کەی‌و چۆن ، بزاڤی رۆشنگەری لە لای کورد سەری هەڵداوە ؟ کێن ئەو رۆشنگەرە - رابەرانە-ی سەرەتاکانی ئەو کاروانەیان جوڵاندو لە کوێوە دەستیان پێکردووە؟ بە چ شێوازێك ئەو بزاڤەیان هێنایە ئاراوە؟ دواتر، ئاخۆ کاردانەوەی ئەو خەباتەی ئەوان، رەنگدانەوەی ئەو تێکۆشینەی ئەوان، لەناو کۆمەڵی (کوردەواری ) دا چۆن‌و چی بووە ؟ ئایا رەنج و ماندووبوونی ئەورۆشنگەرانە چیی لێ شینبوو؟!

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، وامان بە باش زانی بگەڕێینەوە سەر کۆنترین‌و یەکەمین بەڵگەنامەی چاپکراوی کوردی کە {ڕۆژنامەی کوردستان}ـەو لە ساڵی ١٨٩٨دا، واتە ١٠٥ ساڵ لەمەوبەر، یەکەمین ژمارەی لە قاهیرە دەرچووەو لەوێوە بە هەزاران دانە لەهەر ژمارەیەکی بە دیاری نێردراوەتەوە بۆ ناو کوردستان، بە تایبەت لە خولی یەکەمیدا و گەیشتووە بە دەستی خوێنەواری کورد لەناو کوردستاندا.

گەڕانەوەمان بۆ ئەم ڕۆژنامەیەی بە دایکی ڕۆژنامەنووسی‌و ڕۆژنامەوانیی کوردی دادەنرێ، لەبەر ئەوە بوو کە، بڕوامان وایە ڕۆشنگەرانی رابەر، حەتمەن دەبێ سوودێکی یەکجار زۆریان لە (جەریدە !) (ڕۆژنامە) وەرگرتبێ بەو پێیەی کە تاکە کەناڵێکی ڕاگەیاندن بووە لەو سەردەمەدا، ئەمە ئەگەر زیادەڕۆیی نەکەین‌و نەڵێین ئەسڵەن هەر بە مەبەستی بەرپاکردنی ئەو بزاڤە ڕۆشنگەرییە بووە، کە دەستیان داوەتە دەرکردنی ڕۆژنامە !

بەو خولیایەوە دەستمان کرد بە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی (کوردستان)و سەرلەنوێ خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنی وتارەکانی, بە تایبەت (خولی یەکەمی),لەگەڵ چەند سەرچاوەی دیکەدا کە لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا ناویان هێنراوە.

## ڕۆشنگەری

## هەنگاوی یەکەم

لە ئەوروپادا سەدان ساڵ بوو، مرۆڤ وەك كۆیلە مامەڵە پێدەکرا. کەنیسە و پیاوانی ئایینی‌و پادشا خاوەن دەستەڵاتە خوداییەکان (وەك خۆیان ناویان لە خۆیان نابوو) ببوونە (وەصی) بەسەر هەموو میللەتانی خۆرئاواوە، ئەو دنیا فراوانە و ئەو ژینگە دەوڵەمەند و بەربڵاوەیان لە چەند یاساو ڕێساو ڕێوڕەسمێکی لاساییکارییانەی بێ پێزو نائەقڵانیدا کورت کردبۆوە و تاریکستانێکی ڕاستەقینە باڵی بەسەر خەڵك‌و ژیاندا کێشابوو.

لە هەناوی کۆمەڵگە ئەوروپاییەکانداو لە ناوەندە فیکری و ئایینیو هونەری و بازرگانیو پیشەسازییەکاندا کە لە سەرەتای ڕێنسانسەوەو پێشتریش لەسەر هەڵدانی گۆڕانکارییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی ناو خودی ئەوروپاوە، هێواش هێواش سەریان هەڵدا و کەوتنە جموجوڵی نائاسایی، تا دواجار لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەیەمەوە، بزاڤێکی ڕۆشنگەری، سەرتاسەری کایە و بوارەکانی ژیانی گرتەوە.. ئەم بزاڤە(لە ئەوروپادا) تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمی خایاند، بۆیە سەرتاسەری ئەو چاخە لە مێژووی ئەوروپادا بە (چاخی ڕۆشنگەری) ناسراوەو ناو دەبرێ.

(ڕۆشنگەری) ئەو بزاڤە مێژووییە بوو کە دەیان فەیلەسووفی گەورە، دەیان هونەرمەند و دەیان زاناو سیاسیی مەزن لە وڵاتانی فرەنساو ئەڵمانیاو بەریتانیاو هۆڵەندە و ئیتالیادا بە حەماسێکی زۆرو بە گیانێکی خەباتگێڕییەوە بەشدارییان لە هەڵایسان و بەردەوامبوون و سەرگرتن و سەرخست نو بە ئامانج گەیاندنیدا کرد و بووە مایەی وەرچەرخانێکی هەرە گەورە لە سیستمی ژیان و بنیادنانی ئەم شارستانییەتە عەلمانییەی وا تەمەنی نزیك دەبێتەوە لە سەدە و نیوێك.

ئەو ڕۆشنگەرە رابەرانەی ئەوروپا، خەباتێکی سەخت و بێ وچانیان لە دژی، نەخوێندەواری، نەزانی، کۆیلایەتی و نایەکسانی و ئۆرۆستۆکراتی و دواکەوتوویی و خورافە و بڕوای هیچ و پووچی ئایینی و نائایینیو پەیوەندییە نائینسانییەکانی ناو کۆمەڵگەکانیان، بەرپا کردو لەو ڕێگەیەدا ، بە گیان و بە جەستە، بە موڵك و ماڵ و بە بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان باجی گەورەیان دا ، بەڵام نەوە لە دوای نەوە ئاڵاو بەیداخی ئەم بزاڤ و شۆڕشە سەرتاسەرییەیان بە یەکتری دەسپارد، تا دواجار کاروانیان گەیاندە مەنزڵ.

شارە گەورەکانی پاریس و لەندەن، بوونە دوو پایتەختی گەورە و ناوداری جیهان، لە هەموو ڕوویەکی ژیانەوە گەشەیان کردوو و ڕۆشنگەرانیش برەویان بە چالاکییە فیکری و هونەری و ئەدەبییەکانیان داوفەرهەنگێکی نوێ وبناغەکانی کەلتورێکی نوێیان دارشت , دواتریش لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەمدا شۆڕشێکی کشتوکاڵیو لە

نیوەی دووەمیشیدا شۆڕشی پیشەسازی لە بەریتانیاداو بە دوای ئەویشدا لە وڵاتانی تری ئەورووپیدا بەرپا بوو.

بزاڤی رۆشنگەری، کە برێك چەمك و تێڕوانینی نوێی هێنابووە ئاراوە بە یەکەمین و بەراییترین ئەزموونەکانی خۆیدا تێپەڕی و سەرکەوتنی بەدەست هێنا، یەکەمین ئەزموونیان، شۆڕشی رزگاریخوازی ئەمریکا بوو لە ساڵی ١٧٧٦دا، پاشان شۆڕشی گەورەی فرەنسا ١٧٨٩ کە ,سەر لەبەر سیستمی سیاسیو کۆمەڵایەتیی ئەو وڵاتەی گۆڕیو تیشك و پریشکی گەیاندە هەموو ئەورووپاو دنیاش. پێشتریش لە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمیندا لە میانەی (شۆڕشی شکۆمەند)ی بەریتانیادا ساڵی (١٦٨٨) گەلێ دەستەڵاتی گرنگ لە کەنیسە سەندرابۆوە و لەوساوە ئەو وڵاتە بوو بە لیبرالترین وڵاتی ئەورووپاو دنیا.

هەرچەندە لە رووی تیۆرییەوە، ناوەندی ئەم بزاڤە، شاری پاریس بوو، بەڵام ئەوەندەی نەخایاند سەرتاسەری ئەورووپای گرتەوەو رووی کردە ئەمریکا و ناوچەکانی ژێردەستی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییش.

رووناکبیرانی چاخی رۆشنگەری، ژیانی مرۆڤایەتییان بەرەو رێگایەکی رۆشن ئاراستە کردو کۆمەڵێك ئامانج و هیوای نوێی ئەوتۆیان بۆ مرۆڤایەتی خوڵقاند، کە هەندێکی تا ئێستاش لە هەندێ جێی (تاریکی ئەم دنیایەدا) نەهاتوونەتە دی و خەڵکانێك هەن بە هەمان حەماسی رابەرانی رۆشنگەریی سەرەتاوە خەبات دەکەن لەپێناو هێنانەدییان.

### سەرەتاکانی رۆژنامەوانی لە ناوچەکانی ژێردەستی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا,

### سەرەتای رۆشنگەری

ئەگەرچی لە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمەوە رۆژنامە، تاکو تەرا، دواتر لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەمەوە، چەندین رۆژنامە، لە وڵاتانی ئەورووپادا (ئەڵمانیا، فەرەنسا، بەلژیك، هۆڵەندە، بەریتانیاو روسیا)و لە ئەمریکاشدا، هاتنە دەرچوون،

کەچی دەرکردنی رۆژنامە لە ناوچەکانی ژێردەستی عوسمانیدا تا چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم دواکەوت.

لە ساڵی ١٥٤٦دا جوولەکەکان چاپخانەیان بردۆتە تورکیاو لەوێ (تەورات)یان بە حەرفی عیبری چاپکردووە.. ئەرمەنییەکانیش لە ساڵی ١٦٤٠دا چاپخانەیان بۆ خۆیان دامەزراندووە. لە ساڵی ١٧٠٢ دا قەشە مەسیحییەکان چاپخانەیان بردە شاری حەڵەب لە شام، ناپۆلیۆنیش لە هێرشەکەیدا بۆ سەر وڵاتی میسر لە ١٧٩٨ تا ١٨٠١ جگە لەوەی ژمارەیەکی زۆر زاناو پسپۆڕی لەگەڵ خۆیدا برد، چاپخانەیەکیشی لەگەڵ خۆی بردە میسرەوە کە هەم حەرفی لاتینیو هەم حەرفی عەرەبیشی هەبوو، وێڕای ئەوەش کۆڕی زانیاریی بۆ میسرییەکانو کتێبخانەیەکی فرەنسیو دوو قوتابخانەی فەرەنسی بۆ منداڵان و دوو رۆژنامەی (فرەنسی)و یەکێکی عەرەبیشی بە ناوی (التنبیه) وە لە وڵاتی میسر دەرکرد، کە دەکرێ ناوبرێ بە یەکەمین رۆژنامەی عەرەبی لە مێژوودا.

هەر دوابەدوای ئەو گۆڕانکارییانە و بە هاتنی (محمد علی پاشا)، بزووتنەوەیەکی گورجوگۆڵ لە کایە شارستانییەکانی ژیانی میسرییەکاندا سەری هەڵداو پێیان نایە قۆناغی ( بەمۆدێرنکردن )و ( رۆشنگەری )یەوە. لە ساڵی ١٨٢١دا چاپخانە کۆنەکەی ناپۆلیۆن چاککرایەوە و خرایەوە گەڕ و ناونرا ( المطبعة الأهلية ) یان (مطبعة بولاق) کە لە سەرەتادا بۆ چاپکردنی نووسراوە رەسمییەکانی حکوومەت و پاشان لە ساڵی ١٨٢٨ دا بۆ چاپکردنی رۆژنامەی ( الوقائع المصرية ) بەکار دەهێنرا.

لە سەنتەری دەستەڵاتی عوسمانییەکانیشدا: لە تورکیا، یەکەمین رۆژنامە بەزمانی تورکی، بە ناوی ( تەقویمی وەقائع ) لە ساڵی ١٨٣١دا , دەرچووە و هەواڵ و فرمانە سوڵتانییەکانی تێدا بڵاو کراوەتەوە . ئەگەرچی بەر لەم رۆژنامە تورکییە چەندین رۆژنامە و بڵاوکراوەی تر، لە لایەن میللەتانی ژێر دەستە و ناموسڵمانەوە، (ئەرمەنی، بولگاری، یۆنانی، ئاشووری، فرەنسیو ئینگلیزیش), بە زمانی خۆیان دەرکراون .

چاپ و چاپەمەنی و رۆژنامەوانی، کە کەرەسە و هۆکاری سەرەکی بوون لە بەرپابوون و سەرخستنی بزاڤی رۆشنگەری لە ئەوروپاو ئەمریکادا، لە وڵات و ناوچە و

ویلایەتەکانی ژێردەستی عوسمانییەکاندا، بقەو قەدەغە بوون، ماوەیەکی زۆریشی خایاند تا پەراوێزێکیان لە ئازادی بۆ خۆیان بچڕی .. ڕۆژنامەوانی کە نەبووە دیاردە و نەریتێکی باو و بەربڵاو لەم ناوچانەدا، هیچ یاساو ڕێسایەکیشی نەبوو بۆ ڕێکخستنی، ئەوەندە نەبێ کە جارجارە، لابەلاو لە حاڵەتی نائاساییدا لە لایەن وەزارەتەکانی مەعاریف و ناوخۆوە، لە جێی (بابی عالی) کە باڵاترین دەستەڵاتی عوسمانی بوو، سانسۆریان دەخستە سەر ڕۆژنامەکان و دایاندەخستن و سزاشیان بەسەر خاوەنەکانیدا دەسەپاند، تەنانەت فەلاقەشیان دەکردن. ئەو بێ یاساییە هەروا بەردەوام بوو تا ساڵی ١٨٥٨ کە یاسایەکیان بۆ (سزادان) نەك بۆ ڕۆژنامەنووسی، دەرکرد . بەگوێرەی ئەو یاسایە کەمترین ئازادی و مافی ڕەخنەگرتن و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی نوێ و نائاسایی ، قەدەغە و بقە کران و سزا و غەرامەی داراییشیان بۆ دیاری کرابوو. بەڵام لە ساڵی ١٨٦٣ دا و بۆ هاندانی ڕۆژنامەکان کە بە شان و شەوکەتو گەورەیی و کارە باشەکانی سوڵتان و داوودەزگاکانی دەوڵەتەکەیدا هەڵبدەن ، بەگوێرەی یاسایەکی نوێ، سوڵتان عەبدولعەزیز، هەندێ ئازادیی سنووورداری (دوور لە مافی ڕەخنەگرتن) بەخشی بە ڕۆژنامەوانان، تا لەو ڕێگەیەوە بەرپەرچی ئەو ناو و ناتۆرەیە بدەنەوە کە ڕوس و ئەوروپاییەکان خستبوویانە دوای دەوڵەتی عوسمانی، کە گوایا (پیاوە نەخۆشەکەیە)! ئیدی والییە تورکەکانی ویلایەتە جیاجیاکان، کەوتنە خۆیان و دەسیان دایە هێنانی چاپخانەی نوێ و دەرکردنی ڕۆژنامە بە هەردوو زمانی تورکیو عەرەبی. ڕۆژنامەکان گشتیان حکوومی بوون و بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵە باش و دڵخۆشکەرەکانی دەوڵەت بوون. بەوجۆرە لە شارەکانی: بەیروت، بەغدا، موسڵ و بەسرە، ڕۆژنامە حکومییەکان هاتنە مەیدانەوە.

بە پاڵ ئەم ڕۆژنامە حکومییانەوە جارجارە، ڕۆژنامەی ئەهلیش لێرەو لەوێ دەردەچوون، بەڵام هەربەهەمان نەفەسی ڕۆژنامە ڕەسمییەکانو بە بێ پرکێشیکردنی ڕەخنەگرتنو بڵاوکردنەوەی بیری نوێ.

وەك وتمان هەموو گەلانی ژێردەستی عوسمانی، بە زمانەکانی خۆیان، بوونە خاوەنی رۆژنامەی خۆیان، لەسەر زەویی نیشتمانی خۆیان، تەنیا کورد نەبێ. بە بڕوای ئێمە ئەم مەسەلەیەش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە رۆشنبیرانی کورد رازی نەبوون بەوەی رۆژنامەیەك دەربکەن هیچ پەراوێزێکی ئازادیی را دەربڕینی تیا نەبێ‌و بڕواشیان بەوە نەبووە کە رۆژنامەیەکی کۆت و پێوەندکراو بتوانێ پەیامی (رۆشنگەرییانەی) رۆژنامەوانی بگەیەنێ, تورکەکان خۆیشیان رێیان نەدەدا بە هیچ کوردێ،لەژێردەستی خۆیاندا رۆژنامەیەکی کوردی دەربکات.

حاڵ هەر بەوەوە نەوەستا، بەڵکو بە هاتنی سوڵتان عەبدولحەمید بۆسەر تەختی سەڵتەنەتی عوسمانی، بەجارێ دەرگاو دەروازەو پەنجەرە و دەلاقە و تەنانەت کلاوڕۆژنەکانیش لەسەر ئازادییە سنووردارەکەی رۆژنامەوانی داخران‌و چەندین رێنومایی کە دەشێ ناوبنرێن بە (قەدەغەنامە) بۆ کۆنترۆڵکردنی تەواوی ئەو بوارە، لە بابی عالییەوە دەرچوو.

رۆژنامەکان و رۆژنامەوانانی شارو ویلایەتەکانی ژێر دەستی سوڵتان و دەوڵەتەکەی، هەلاتن، کۆچیان کردو تاراوگەیان هەڵبژارد تا لەوێوە جارێکی تر دەستپێبکەنەوە.. شاری قاهیرەش، کە بەر لە دەیان ساڵ چاپخانەی تێچوو بوو، نەریتێکی لە بوارەکانی چاپگەریدا بۆ خۆی دامەزراندبوو، ژمارەیەکی زۆر رۆشنفکرو خوێنەوارو رۆشنگەری تیا کۆببوونەوە، ئەو ولاتە لە ژێردەستی سوڵتاندا نەمابوو، کەوتبووە دەس ئینگلیزەکان.. قاهیرە ئەو شارەبوو کە رۆژنامەنووسانی هەلاتووی ژێردەستی سوڵتان، لێی دەگیرسانەوە، لەدایکبوون وبەردەوامیی‌چەندین رۆژنامەی عەرەبی‌و تورکییشی بەخۆوە بینی کە درێژەیان دەدا بە رووناککردنەوەی زەینی خەڵك و بەرهەڵستکارییەکی سەرەتاییان لە دژی دەستەلاتی عوسمانلی دەستپێکرد.

هەموو ئەم رۆژنامانە، بە پاڵ سالۆنە فیکرییەکانەوە، کە لە شارە گەورەکانی وەك قاهیرە و ئەسکەندەرییە و بەیروت و دیمەشق‌و بەغدا بە ئاشکراو بە نهێنی لە کۆشك و سەرای خاوەن نفووزو سەروەتەکاندا سازدەکران، جگە لەو چاکسازییانەی کە (محمد

علی پاشا) لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا دەستی دابوویە لە میسر، هەر هەمووی پێکەوە یەکەمین هەنگاوەکانی بزاڤی ڕۆشنگەریو تازەکردنەوەو هوشیارکردنەوەو ڕزگارکردنی مرۆڤ ـ بوون لەژێر باڵی ڕەشی نەخوێندەواریو نەخۆشیو هەژاریو دواکەوتوویی.

بە هەرحاڵ ئێمە لەم باسەماندا لەوە زیاتر لە بارەی سەرەتاکانی ڕۆشنگەری لە لای عەرەبو میللەتانی تری ژێردەستی عوسمانی نادوێینو ڕاستەوخۆ دەچینە سەر باسی: ( سەرەتاکانی ڕۆشنگەری لە لای کورد, ڕەنگدانەوەی لە یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی دا ).

## کوردستان
## یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ،
## یەکەمین هەنگاو بەرەو دونیای ڕۆشن!

لەبەر ڕێنەدان و لەبەر بڕوا نەبوونی ڕۆشنبیرانی کوردیش بە تورکو یاساکانی، لە سنووری دەستەڵاتی ڕاستەوخۆی عوسمانییەکاندا، هیچ ڕۆژنامەیەکی کوردی دەرنەچوو.. کاتێکیش میرانی بەدرخان، بە تەواوی هەموو گەندەڵیوکاری دوژمنکارانەی عوسمانییەکانیان بۆ دەرکەوت ، ئیدی وەك (سورەییا بەدرخان) لە سەر وتاری یەکەمین ژمارەی خولی سێهەمی دەرچوونی (کوردستان) دا –ـ ١٩١٧, کە لە قاهیرە دەرچووە ، دەڵێ:

( ....وتیان مادام حکوومەتی عوسمانی خۆی خراپە ئەکات بۆچ ئێمەش لەگەڵ ئەو خراپ ببین) بۆیە ( مقداد مەدحەت بەگی کوڕی میر بەدرخانی میری بۆتان) هەڵساو ڕووی کردە قاهیرە، قاهیرەش ئەو قاهیرەیە بوو کە پێشتر باسمان کرد. هەر لە سەروتاری (تورکی)ی هەمان ژمارەدا (سورەییا بەدرخان) نووسیویە دەڵێ: (....ئەو ئیدارە هەڵەیە کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر کوردەکان، بۆیە هیچ هیوایەکیان نەماو دەستیان لە چاکبوونی بارودۆخەکە شوشت. هەندێ لە سەرکردەکانی کورد بۆ ڕزگارکردنی کوردەکان لە دەست زوڵمو زۆرداریی نەتەوەکانی عوسمانی، ساڵی "١٣١٣ :

١٨٩٦" کۆمەڵەیەکی نهێنییان دامەزراند).. کاتێکیش مەدحەت بەگ گەیشتە قاهیرە, لەوێ (.... بۆ بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونی ئەو کۆمەڵەیە ساڵی "١٣١٥ : ١٨٩٨" رۆژنامەی کوردستانی لە قاهیرە دەرکرد....).

یەکەم رۆژنامەی کوردی( کوردستان ): یەکەمین دەنگ هەڵبڕینی ئاشکرای رۆشنفکرانی کورد بوو، کە بە شێوازی رۆژنامەو بەکەڵك وەرگرتن لە چاپخانەو بە زمانی کوردی، بدرێ بە گوێی کورد و جیهاندا، هەم کۆشش و پرۆژەیەکی جیدی بووە بۆ ناساندنی کوردو زمان و مێژوو و ئەدەب و قوربانییەکانی‌و ئازایەتییەکانی بە دنیاودەورووبەر، هەم یەکەمین پەیامی ناڕەزاییو رەخنەی توند و ئاشکرابوو لە دەستەڵاتدارانی عوسمانی( کە نوێنەری کۆنەپەرستترینو رەشترین دەستەڵاتی سیاسیو ئیداریی دنیای ئەو کاتە بوون) ، لە لایەکی تریشەوە (کوردستان) ئەو مامۆستایە بوو کە خەڵکی کوردستانی هوشیار دەکردەوە و ئەو بانگەوازە بوو کە لە خەوی قورسی دواکەوتوویی وەئاگای دەهێنانەوە و زۆر بەتوندی رەخنەی جددیی لە هەل ومەرجی سیاسی،کۆمەڵایەتیوفەرهەنگیی کوردستانی ژێردەستە دەگرت . ئەو چرا رووناکەیش بوو کە رێگای بۆ نەوەی نوێی کورد رۆشن دەکردەوە. (کوردستان) یەکەمین مینبەری دەستەبژێری میللەتێکی بێ مینبەر بوو , یەکەمین بلندگۆی رۆشنگەریی کوردی بوو.

خاوەن و سەرنووسەری (کوردستان) خۆیشی درکی بە ناوازەییو دەگمەنی کارەکەی خۆی کردووە بۆیە لە سەر وتاری یەکەمین ژمارەیدا، کە لە ١٨٩٨/٤/٢٢دا دەریکردووە دەڵێ:

(بەداخەوە، کورد کە لە زۆر نەتەوە زیاتر خاوەنی بیروهۆشن، جوامێرن، لە ئایینی خۆیاندا رەواو بەهێزن، بەڵام وەکو نەتەوەکانی دیکە خوێندەوارو دەوڵەمەند نین. نازانن دراوسێکانیان چۆنو چی ئەکەنو لێیان بێ ئاگان . بۆیە پشت بە خوا ئەم رۆژنامەیەمان نووسیو بە پشتیوانیی خوای گەورە لەمەودوا هەر پانزە رۆژ جارێك بڵاوی دەکەمەوە.

ناوی رۆژنامەکەیشمان ناوە کوردستانو لەم رۆژنامەیەدا سوودەکانی زانست و زانیاری باس دەکەم، لە چ جێگایەك مرۆڤ فێر دەبێت، لە چ جێگایەك خوێندنگای باش هەیە پیشانی کوردی دەدەم، لە چ جێگایەك شەڕ ببێت هەڵوێستی وڵاتانی گەورە چی دەبێ و چۆن شەڕ دەکەن، چۆن بازرگانی دەکرێت، هەموویان باس دەکەم. تا ئێستا هیچ کەسێك رۆژنامەیەکی وەك ئەمەی بڵاو نەکردۆتەوە).

خاوەن و سەرنووسەری (کوردستان) پێی وابووە، پەیامێکی پیرۆزو مەزنی پێیە و لە رێی ئەم رۆژنامەیەوە دەتوانێ بیگەیەنێ.. پەیامەکەیشی وەك لەم چەند نموونەیەدا دەردەکەوێ ( کە لە دەقی نامەیەکیهاوپێچی یەکەمین ژمارەی رۆژنامەکەدا بۆ برادەرە فەرەنسییەکانی و بە فەرەنسی نووسیوێتی) ئەو پەیامە دەقاودەق پەیامێکی رۆشنگەرانە و تازەگەرانە بووە، کە بۆ یەکەمین جار بووە کورد، رۆشنگەری کورد، لە رێی وتارو رۆژنامەوە بیگەیەنێ بە خوێنەرانی لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستاندا، مقداد مەدحەت بەدرخان لەو نامەیەدا، لە جێیەك دەڵێ: (ئەمە یەکەمین جارە کە بەم زمانە ئەم رۆژنامەیەم بڵاوکردۆتەوە، بۆ مەبەستی تێگەیاندنی زانیاریو گیانی خۆشەویستی لەناو رۆڵەکانی نەتەوەکەمداو هاندانی کوردەکان بۆ ئەوەی رێگەی پێشکەوتنو شارستانێتیی نوێ بگرن،...).

لە جێیەکی تریدا دەڵێ: (... بڕیارمدا لە رێگەی ئەم رۆژنامەیەوە هەموو توانای خۆم لە دوورەوە تەرخان بکەم بۆ هەموو کارێك کە قازانجو بەختیاریو پەروەردەکردنی بیری تێدابێت بۆ هاوڵاتیانی کورد).

بە هەمان دەستووری رۆشنگەرانی رابەر لە ئەوروپادا، کە لە سەرەتادا بە زمانێکی نەرم، بە بێ هێرش و پەلامار، قسەو ئامۆژگاری و دواتر رەخنەیان بە رووی کەنیسە و دەستەڵاتی ئۆرۆستۆکراتی و پیاوانی ئایینیدا دەدا، ئەمانیش، سەرنووسەرو نووسەرانی تری (کوردستان) لە سەرەتادا زمانیان نەرم بوو لە بەرامبەر سوڵتانی عوسمانی، بەڵام کە تێگەیشتن ئەو زمانە کاری خۆی ناکات و بە دەردی ئەمان ناچێ.. بەرەبەرە و ژمارە لە دوای ژمارە، توند و توندتریان کردو گەیاندییانە ئەو رادەیەی بە ئاشکرا و

راشکاوانە، تاوانی هەموو ئەو زوڵم و زۆرە، ئەو نەفامیو نەخوێندەواری و برسێتی و دواکەوتوویییەی میللەتان و وڵاتان، بدەنە پاڵ داو و دەزگای عوسمانی و دواتریش بیخەنە ئەستۆی خودی سوڵتان و داوای گۆڕین و لادانی بکەن، تا گەندەڵی و دواکەوتوویی و زوڵم و زۆر نەمێنێ. واتا هەروەك چۆن بزاڤی رۆشنگەری لە زەمان و زەمینەی رەسەنی خۆیشیدا (ئەوروپا) لە سەرەتادا تەنیا بزاڤێکی ئەدەبی، هونەری، فیکری بوو، کەچی ئەوەندەی نەخایاند بە تەواوی ئاوێتەی خەباتی سیاسی بوو، هەر بەو چەشنە هەنگاوەکانی سەرەتای رۆشنگەریی کوردیش،هێشتا زۆر لە خاڵی دەست پێکردنەوە دوور نەکەوتبووەوە، کە بە تەواوی ئاوێتەی خەباتی سیاسی و نەتەوەیی بوو، بە جۆرێك کە شەخسیەتی (رۆشنگەر و سیاسیی کورد) وەها لەو سەردەمە و سەردەمانی دوای خۆیدا، ئاوێزانی یەکدی بوون، ئیدی زۆر بەدەگمەن لە یەکدی جیا دەکرانەوە یان جیا دەبوونەوە . لە سەر وتاری ژمارە (٢٩)دا کە بە کرمانجیی ژووروو نووسیویە، دەڵێ: (.... ئەمە دە ساڵە بە ئیفساد و تەشویقی خونکار شەڕی گەورە لە کوردستان ئەقەومێ و کەس ئاسایشی نەماوە، کەس ئومێدی چاکە ناکا، خەڵك هەمووی چاوەڕوانی گۆڕینی ئیدارەی حکوومەتن، بۆ سەلامەتمان هیچ رێگەیەکی دیکە نەماوە).

## بایەخدان بە خوێندەواری و زانست

(کوردستان) هەر لە پاش سەر وتاری یەکەمین ژمارەیەوە، خۆی بۆ سەرنجڕاکێشانی، پیاوانی ئایینیی ئیسلام، میرو ئاغایان و کورد بە گشتی، تەرخان دەکات، تا گرنگی و بایەخی لە کۆتا نەهاتووی خوێندەواری و زانستیان پێ رابگەیەنێ.. (العلماء ورثة الأنبياء) واتا زانایان میراتگرانی پێغەمبەرانن ، ئا بەم رستە بەهێزەوە دێتە ناو باسو زانایان و زانستخوازان دەباتە ریزی پێغەمبەران، بە پشتبەستن بە فەرموودەیەکی (پێغەمبەر د.خ)، لە دوای چەند وشەیەکی بەرایی راستەوخۆ بە گلەییەوە روو دەکاتە زانایانی ئایینیی کورد و دەڵێت: (.... ئەی زانایانی کورد وەك چۆن ئێوە ئەو وەعز و ئامۆژگارییانە بۆ نوێژ دەدەن، هەرواش دەبێ ئەو میر

و ئاغاو کوردانەی کە دەیانناسن، بیانکەنە خەمخۆری زانین‌و مەعریفەت و ڕێگای باش و بەسوودیان پیشانبدەن، ئەگەر ئەمە جێبەجێ نەکەن ئەوا تاوانەکەی لە ئەستۆی ئێوەدایە).. ئەم ڕۆشنگەرە ڕابەرەی کورد هەر بەوەوە نەوەستاوە کە زانست‌و مەعریفەت لە لای خەڵك خۆشەویست بکات، بەڵکو چەند هەنگاوێك پێشتریش چووە، ئەوەتا بەرنامەڕێژیی بۆ دەکات، ئەرکی ئەم پرۆسەیە دابەشدەکات.. خەڵکانێك کە خۆیان بە زانای ئایینی دەزانن لەناو کورداندا، دەکاتە بەرپرس لەو مەسەلەیەو لە بەرامبەر گەل و لە بەرامبەر پێغەمبەرو خوداشدا ڕووبەڕووی بەرپرسیارێتییەکی مێژوویی و دینی و دنیاییان دەکاتەوە،. ئەو جەخت خستنە سەر جیاکردنەوەی (وەعز بۆ نوێژ) لە (ڕێگای باش و بەسوود) بۆ خۆی نەفەسێکی ڕۆشنگەریی یاخیی هەڵگرتووە، کە ناڕاستەوخۆ دەڵێت: نوێژ و وەعز و ئامۆژگاریی ئایینی بەس نییە بۆ پێشکەوتن و سەربەرزی.. بگرە لەبەر ئەوەی ئێمە تەنیا ئەو دیوەی ژیانمان گرتووە بۆیە وامان بەسەر هاتووە.. لەمەودوا پێویستە بە پاڵ نوێژەوە ڕوو لە دنیای ڕۆشنی زانستیش بکەین , ئەگەر نا ئەوا چارەنووسمان زۆر خراپ دەبێ.

هەر لەو وتارەدا پاش ئەوەی فەرموودەیەکی تری پێغەمبەر (د.خ) دەهێنێتەوە، کە دەفەرموێ: (العلم علمان، علم الأبدان وعلم الأديان) واتا( زانست دوو زانستە یەکێکیان تایبەتە بە جەستە و تەندروستی‌و ژیانی مرۆڤ، ئەویدیکەیش تایبەتە بە ئایین و ئیمان ) ئینجا دێت و جارێکی دی بە زمانی گلەیی ڕووی قسەی لە زانایانی ئیسلام دەکات و دەڵێ: (ئەی زانایان بۆچی ئێوە ئەو فەرموودانە بۆ میرو ئاغایان ناخوێننەوە،.؟..)، مەبەستی ئەوەیە بڵێت: ئێوە ئەی پیاوانی ئایینی، ڕاستییەکان لە خەڵك بۆ دەشارنەوە، ئێوە بۆچی خوێندەواریتان بۆ خۆتان قۆرخکردووە؟ ئەی ناترسن خودا و پێغەمبەرتان لێ بڕەنجێ ؟ هەمان ڕەوش لە سەدەی ١٧و ١٨ لە ئەورووپادا زاڵبوو، پیاوانی کەنیسە خوێندەوارییان بۆخۆیان قۆرخکردبوو، زۆریان بەلاوە ناخۆش و نابەجێبوو، کە خەڵکی شارەکان، گوندەکان، فێری خوێندەواری بن، نەبادا چاویان بکرێتەوە و هۆش و بیریان ئازاد ببێت، ئەوساش هەموو درۆ و دەلەسە و

خورافاتەکانی کەنیسەوپیاوانی ئاین ئاشکرا بن و بەوجۆرە هەم دەستەڵات و هەم سەروەت و سامانیشیان لەدەس بچێت . لەو سەردەمەدا زۆر لە مەلاو زانایانی ئیسلام دەستیان بە کلاوی خۆیانەوە گرتبوو بای غەزەبی سوڵتان نەیفرێنێ ! بۆیە ئەوەندەی لە خەمی پاراستنی مەعیشەت و گوزەرانی خۆیاندا بوون، ئەوەندە لە خەمی رابەریکردنی خەڵکدا نەبوون بەرە و خوێندەواری، خۆ هەر هیچ نەبێ لەترسی ئەوەی نەبادا ئەو خەڵکە وایان لێبێت خۆیان (بە بێ پەنابردن بۆ مەلاو فەقێ) بتوانن قورئان و فەرموودەکان بخوێننەوە !

سەرنووسەری کوردستان، لەوەشی تێدەپەرێنێ و بە مەلاکان دەڵێ: (.... بۆچی رۆژنامە عەرەبییەکان ناخوێننەوە، تا بزانن لەم دنیایەدا چی روو ئەدات؟) بەراستی ئەم رستەیە هەر خۆی لە خۆیدا پرکێشییەکی گەورەیە (بە بەراورد بەو زەمان و زەمینەیە). لێرەدا نەك هەر مەلاکانی ئەوسەردەمە بە کەمتەرخەم و بیرتەسك ناودەبات ، بگرە ناڕاستەوخۆ پێیان دەڵێ: ئێوە مادام رۆژنامە ناخوێننەوە خۆشتان رۆشنبیر نین، ئاگاتان لە دنیا نییە و ئەوەشی خۆی حاڵی وابێ، بەکەڵکی رابەرایەتی نایە ، کەواتە تا بەبەرییەوە ماوە و بەرغەزەبی خوا نەکەوتوون، فریای خۆتان و ئایینەکەتان و میللەتەکەتان بکەون!.

هەر لە هەمان وتاردا، لا دەکاتەوە بەلای میرو ئاغایانی کورد و پێیان دەڵێ، ئێوە (ئەی میرو ئاغایان، تاوانی مناڵەکانتان لە ئەستۆی خۆتاندایە، ئێوەش مناڵی خۆتان بنێرنە خوێندنگا بۆ ئەوەی بخوێنن، دەوڵەتمەندانی ئێوە با، لە رێگەی خودا خێر بکەن و لە گوندەکان خوێندنگا دروست بکەن).... (ئەگەر گوێ لەم ئامۆژگارییانە نەگرن و دیسانەوە تەنها شوانی و کاسبی بکەن، ئەوا لە ماوەیەکی کەمدا کوردستان بە یەکجارەکی کاولو وێران دەبێت).... (ئەی میرو ئاغایان باش تەماشای دەوروبەری خۆتان بکەن و ببینن رۆژبەرۆژ هەژارترو سووکتر دەبن، هۆیەکەیشی جەهالەت و نەزانینتانە)... (...خەڵك دەڵێن ئەگەر کورد بخوێنێت ئەوا لە هەموو جیهان بەهێزترو دەوڵەمەندتر دەبن).

هەر لە درێژەی ئەو وتارەدا، کە دەکرێ بە وتاری یەکەم و هەنگاوی یەکەمی بزاڤی ڕۆشنگەریی کوردی، ناو ببرێ، دەم لە زۆر شتەوە دەدات , لەوانە هێنانەوەی چەند نموونەیەك لەسەر میللەتی بەژمارە زۆری بەڵام بێ هونەر, کە چۆن میللەتێکی گچکەو زانا بەسەریدا زاڵ دەبێو ئینجا باسی ئەو کوردانە دەکات کە لە جامیعەی ئەزهەر لە قاهیرە دەخوێنن، کوڕانی (سلێمانی و سۆران و کەرکوك)ن‌و داخێکی زۆری هەیە کە هیچ کەسێکی ناوچەکانی (بۆتان، غەرزان، شێروان و هەکاری) ی نەدیوە، ئەوەش بە گرفت و کەموکوڕییەکی مەزن دادەنێ. باسی خەڵکی میسر دەکات کە خەریکی خوێندن و کار و بازرگانیو هونەرو پیشەسازیین، تەنانەت هەندێ لە ژنەکانیشیان دەخوێنن ! بەڵام بە گشتی کوردەکانی میسر ی دیوە کە خزمەتکارو دەرگەوان‌و بێدەرامەتن، چونکە خوێندەوار نین‌و هیچ سنعەتێك فێر نەبوون. جارێکی دیکەش دێتەوە بە سەرو پۆتەڵاکی مەلاکاندا و لێیان دەپرسێ (.... ئەی زانایانی کورد، ئێوە بۆچی لە مزگەوتەکاندا باسی خراپیی نەزانین و سوودی عیلم ناکەن؟).

لە سەر وتاری ژمارە دوودا ، جارێکی دیکەو بە ڕوونتر، دێتەوە قسەو ڕوو لە میرو ئاغایانی کورد دەکات و لێیان دەپرسێ: (.... حەزرەتی پێغەمبەر "د.خ" فەرموویەتی "حب الوطن من الایمان") .... (....ئەی میرو ئاغاو پادشایان لە ئێوە دەپرسم تاکو ئێستا کێ لە ئێوە شتێکتان کردووە بۆ نیشتمانی خۆتان بۆ ئەوەی بزانین کە ئێوە نیشتمانی خۆتان خۆش دەوێت؟)....(....خۆشەویستیی نیشتمان ئەوەیە کە مرۆڤ نەهێڵێت یا ڕێگا نەدات دوژمنان بێنە ناو نیشتمان، خۆشەویستی نیشتمان ئەوەیە کە مرۆڤ ئاوەدانی بکاتەوە، خوێندنگا و قوتابخانە و خێرو خێراتی تیا دروستبکات، خۆشەویستیی نیشتمان ئەوەیە کە مرۆڤ مناڵانی ئەو نیشتمانە بخاتە بەر خوێندن و خوێندنەوەو فێری پیشەو زانستیان بکات).

لە درێژەی هەمان وتاردا دەڵێ: (.... وەرن با بزانین چۆن لەپێناو دنیا و چۆن لەپێناو ڕۆژی دواییدا کار بکەین؟ دەبێ چۆن بۆ دنیا کار بکەین وەك بازرگانی، کاسبکاری، فێربوونی پیشەو زاست....)... (... الحمد لله کورد لە کاروباری ئایینی

خۆیدا زۆر باشن بەڵام نەخوێندەوارن بۆیە ناتوانن بۆ رۆژی دوایی بە باشی کار بکەن!).
(.... خۆزگە بەو کەسەی چاکە دەکات، چاکەکردن نە نوێژە و نەڕۆژوو، چونکە نوێژ و ڕۆژوو ئایینی مرۆڤە و بیەوێت و نەیەوێت پێویستە بیکات، بەڵکو چاکە ئەوەیە مرۆڤ خوێندنگا و قوتابخانەو مزگەوت دروستبکات)... (... سەیری منالانی بێ باوك بکەن و بیانخەنە بەر خوێندن...)... (... ئەی دەوڵەمەندی کورد، باوکتان بە چەند گەزێك کفنی سپی چۆتە بەر رەحمەتی خوا و ئێوەش بە هەمان شێوە دەچن، ئەو زێڕو زیوە لەناو عولبەکانتان بێننە دەرێ و لە ڕێی خوا قوتابخانەو خوێندنگا دروستبکەن، منالانی بێ دایك و باوك بخەنە بەر خوێندن بۆ ئەوەی لە دنیاو ئاخیرەدا ئارام بن و خوا لێتان رازی بێت).

ئێمە پێمان وایە هەموو ئەو نموونانەی سەرەوە، بەڵگەی حاشا هەڵنەگرن بۆ پەرۆشی ئەم رۆشنگەرە گەورەیە، کە هەرچی زووە خوێندەواری لەناو منالانی کورددا بلاو بکرێتەوە و زۆر جەخت لەسەر (منالانی کورد) و گەنجەکانی دەکاتەوە ، چونکە وەك پیاوێکی منەوەرو رابەر، دەرکی بەوە کردووە کە ئەو رەوشە خراپە پێویستە لە بناغەوە چارەسەر بکرێ، بۆ ئەوەی دواڕۆژ مسۆگەر بکرێ دەبێ لە مندالانەوە دەستپێبکرێ. بۆ ئەوەی پەیامی رۆشنگەریی خۆی بگەیەنێ هەموو جۆرو شێوازێکی دەربڕینی بەکارهێناوە .. گاه بە هەڕەشە و گاه بە لەلا خۆشەویستکردن، جارێك بە رێگەی مەنتیق، جارێك لە ڕێی فەرموودەی پێغەمبەر و هینانەوەی نموونەی مێژوویی لە مێژووی دەوروبەرو ئیسلامەوە .

ئەم پەرۆشییە، هێدی هێدی بەرنامەڕێژ دەبێ و لە سەر وتاری ژمارە (٣)دا دەگاتە ئەوەی بڵێ: (... ئەی میرو ئاغایانی کورد وەك چۆن نوێژکردن لەسەر ئێوە فەرزە، فێربوونی عیلمیش بە هەمان شێوە لەسەرتان فەرزە، بە بێ عیلمو خوێندن، نوێژ و ڕۆژوو ناتەواون، مرۆڤ چەندە نیشتمانەکەی خۆشبوێت و حەز بە نیشتمانەکەی بکات، بە بێ عیلم ناتوانێت کارێکی باشی بۆ بکات. لەم سەردەمەدا کتێبی زۆر باش نووسراون و باس لە چۆنێتیی رواندن و چاودێریکردنی دار و درەخت و بەخێوکردنی مەڕوماڵات و

چاندنی گەنم و جۆ دەکەن. هەموو شتێك باس دەکەن، خەڵکی خوێندەوار دەتوانن لە رێی ئەو کتێبانەوە دار و درەخت و مەڕوماڵات و دانەوێڵەی خۆیان زیاد بکەن....) , لەم وتارەدا بۆ ئاستێکی باڵاتر هەڵدەکشێ و بەوەوە ناوەستێ کە ئامۆژگاریی ئەخلاقیی خەڵك بکات، بەڵکو لە دوو روانگەی ترەوە سەرنجی خەڵك بەلای خوێندەواریدا رادەکێشێ.. روانگەیەکیان (ئیمان و دینە) کە بەلای خەڵکی ئەو سەردەمەوە زۆر گرنگ و بە بایەخ بووە و خوێندنو زانستیان لەلا فەرز دەکات وەك چۆن نوێژ و رۆژوو فەرز بوون. دووەمیشیان گرێدانەوەی بایەخی خوێندنە بە ژیانی رۆژانە و گوزەرانی خەڵکی کوردستانەوە کە بەشێکی هەرە زۆریان باخەوان و جوتیارو خاوەن مەڕوماڵات بوون و لەبەر نەزانی و دواکەوتوویی گیرۆدەی دەستی ئافات و دەردو بەڵای بەردەوامیبێچارەی ساڵانە بوون کە لە کشتوکاڵو بەروبووم و مەڕوماڵاتیانی داوە و نابووتی کردوون.

لە وتارێکی تردا بە ناونیشانی (ليس للانسان إلا ما سعى) جارێکی تر پەنا دەباتەوە بەر نموونە هێنانەوەو سەرگوزشتە گێڕانەوە تا لە ئەزموونی میللەتانی پێشکەوتوو، عیبرەت وەربگیرێ و لەو رووەوە باسی هۆکارەکانی پێشکەوتنی (فەرەنگ) دەکات ، تا بە خەڵکی کوردستان بڵێ، دەی ئێوەش هیچتان لەوان کەمتر نییە تەنها جووڵەو زانست نەبێ.. (...... فەرەنگ فێری خوێندنەوە و زانین دەبوون...... مێشکیان وشیار بووەوە دەستیان کرد بە خوێندنەوەو منداڵەکانیان ناردە بەر خوێندن و رەوانەی جێگا دوورەکانیان کردن بۆ ئەوەی فێری سنعەت و هونەر ببن).

راکێشانی سەرنجی خوێنەری کورد بەلای ئەزموونەکەی (فەرەنگ) دا خۆی بۆ خۆی سەرسامیو شەیدایی، رۆشنگەرانی ئەوسای کورد، بەرامبەر بەو ئەزموونەی فەرەنسا و وڵاتانی تری ئەوروپا دەردەخات... ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە هێنانەوەی وڵاتانی فەرەنگستان (کە دەیکردە ئەوروپای مەسیحی ) بە نموونەیەك بۆ چاولێکردن، وێڕای ئەوەی بۆ ئەو سەردەمە و لەسایەی باڵادەستیی خەلافەتی ئیسلامدا, جورئەت و لەخۆ بوردنێکی زۆری ویستووە, جۆرێکیش بووە لە خرۆشاندنی خوێنەر لە رێی چەشەیەکەوە کە نیشانەی زیرەکیی رۆشنگەرەکەیەو نیشانەی پەرۆشییەتی بۆ

نەتەوەکەی و بەڵگەی ئەوەیە کە بەهەر چۆنێك بێت دەیەوێت میللەتەکەی بجوولێنێو بیخاتە سەر رێگەی راست و رۆشن، رێگای زانست و مەعریفەت،جێی سەرنجە کە لێرەشدا جەخت لەسەر بایەخدان بە منالآن دەکاتەوە، وەك بڵێی دەیەوێت بڵێ: (سبەی لەم رۆوە دەستپێدەکات). هەر لەو روانگەیەوە و لە درێژەی هەمان وتاری ژمارە (٣)دا دەڵێ: (.... ئێمە بە باو و باپیرانمانەوە میرەکانی بۆتان و گەورەی کوردین، بۆیە ئەرکی سەرشانمانە کە بۆ چاکەی کورد خەبات بکەین، دەبێت ئێمە وەك منالآنی خۆمان تەماشای مندالآنی کورد بکەین، کێ لە خەڵکی کوردستان بیەوێت منداڵەکانی بنێرێتە "ئەستەمبووڵ " بۆ خوێندن، با بچێ بۆ لای براکانم لە " ئەستەمبوڵ "، هەرکەسێکیش دەیەوێت بێت بۆ میسر پێشتر نامەم بۆ بنێرێت و لەسەر نامەکە بنووسێت...... هتد).

ئەم پەرۆشییە کە گەیشتۆتە رادەی بەشداریکردنی خۆی و براکانی بە کردەوە، گومان لە مەسەلەکەدا ناهێڵێو بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم پیاوە و براکانی بە کردەوە نەك بە وتن، لەو سەردەمە تاریکەی کورددا , رابەری رۆشنگەریی کورد بوون .

هەر لەو ژمارەیەشدا سەرنجی خوێنەر بۆ لای دوو پیاوی منەوەری کورد رادەکێشێ و بە خوێنەری کوردیان دەناسێنێ، ئەوانیش: (شێخ یوسف ضیاء الدین باشا)یە کە خاوەنی کتێبێکە لە بارەی (رێزمانو لەهجەکانی کوردییەوە) بە زمانی عەرەبی بە ناوی (الهدية الحميدية في اللغة الكردية)، هانی میر و خوێنەرانی ناو کوردستان دەدات کە ئەم کتێبە پەیدا بکەن چونکە زۆر بەسوودە بۆیان.

دووەمیشیان: (حاجی عەبدولقادر)ـە کە دەکاتە شاعیری رۆشنگەرو شۆرگێری کورد(حاجی قادری کۆیی), ئاماژە بە رۆڵی ئەو پیاوە و زانایی‌و خەبات و تێکۆشانی لەپێناو فێرکردنی عیلم و مەعریفەتدا، دەکات.

لە درێژەی ئەو خەبات و تێکۆشینە فیکرییەی رۆشنگەرانی رابەردا، مقداد مەدحەت بەدرخان و عەبدولرەحمان بەدرخانی خاوەن و سەرنووسەری رۆژنامەی کوردستان، چەندین وتارو سەروتاری تر لە ژمارەکانی (٤ و ٥ و ٨ و ٩) دا دەبینین، کە باس لە (فضيلة العلم)و (فضيلة التعلم)و (هل يستوي الذين يعلمون والذين لا يعلمون) و (رتبة

العلم أعلى الرتب) دەکات و لەو ژمارانە و چەندینی تریشدا گەلێ وتار و هەواڵ بەرچاو دەکەون کە لەبارەی شەڕی نێوان وڵاتانەوەیە و سەرنجی خوێنەری کورد، مرۆڤی کورد، بەلای ئەو راستییەدا رادەکێشن کە سەردەم سەردەمی زۆری و قەرەباڵغی و دەنگەدەنگ نییە، بەڵکو سەردەم سەردەمی پێشکەوتنی پیشەسازی و تەکنیکی و زانستییە، هەر میللەتێك لەم بوارانەدا خۆی پێشنەخات، بازۆریش بێ و بائازاو چاونەترسیش بێ، بالەخواترس و نوێژکەر ورۆژووگریش بێ، هیچی دادی نادات و دەبێ هەر بە دواکەوتوویی و ژێردەستەیی بمێنێتەوە و تا هەتایە نوقمی تاریکی بێ و دنیای رۆشن بە چاوی خۆی نابینێ !.

**رەواندنەوەی وەهم :**

**رۆشنکرنەوەی ئەقڵی زوڵملێکراوە دژەکان !**

پەیوەندییەکانی نێوان گەلانی ژێردەستی عوسمانی، بە تایبەتی نێوانی کورد و ئەرمەن، بە فیتی حوکمڕانەکانی تورك‌و بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دستەلاتی تورکی عوسمانی، سالانێك بوو گرژی و ئالۆزیی تێکەوتبوو، کار گەیشتبووە کوشت و کوشتارو پیلان لە دژی یەك گێڕان و تالان و بڕۆی یەکتر و دەستدرێژیکردنە سەر موڵك و ماڵ و سەر و سامانی یەکتری . لە بارودۆخێکی وەهادا کەم کەس هەبوون لە هەردوولا، بە فیکری تیژو رۆشنیان دەرك بە راستییەکان بکەن و حەق و ناحەق لە یەکتر جیا بکەنەوە. رۆشنگەرانی رابەری کورد، بە تایبەت عەبدولڕەحمان بەدرخان و ئەو زاتە منەوەرانەی کە کاریان لەگەڵ کردووە یان هاوکاری بوون و ناویان نەهاتووە، رۆڵێکی یەکجار گرنگ و چارەنووسسازیان گێڕاوە، بۆ رۆشنکردنەوەی بەرچاوی خەڵکی چەواشەکراوی هەردوو میللەتی زوڵملێکراوی بەگژ یەکدا چوو، خەباتێکی بێ وچانیان کردووە لەپێناو هوشیارکردنەوە و خستنەوەگەڕی مێشك و ئەقڵی لەکارخراویان، هانیان داون بۆ خۆ رزگارکردن لە وەهم و کۆیلایەتی فیکری و خۆشباوەڕی‌و تەسلیمبوون بە لێکدانەوەکانی دەستەڵاتدارانی تورك لە بارەی دین و دنیاو دۆست و دوژمنەوە

.ڕۆشنگەرانی کورد، بە ئەرکێکی مێژوویی خۆیانیان زانیوە بەستەڵەکی بیری کورد بشکێنن و تاریکستانی ئەو ئەقڵیەتەی لە دەرەوەی ئیرادە و بەرژەوەندیی خۆیانەوە بەسەریاندا سەپێنرابوو، بە تیشکی زانست و ڕۆشنایی حەقیقەت، رابماڵن و ڕۆشن بکەنەوە . لەم بوارەدا چەندین وتاری زۆر گرنگ لە ڕووپەڕەکانی (کوردستان) دا دەخوێنرێنەوە.

لە وتارێکی ژمارە (٢٥) دا سەرنووسەر بە جەنگاوەرانی چەواشەکراوی کورد دەڵێ: (.... لەجیاتی ئەوەی پەلاماری کۆمەڵێك پەككەوتەی ئەرمەنی بدەن کە لە ژێر باڵی ئێوەدا خۆیان کز کردووە، هەوڵبدەن و غیرەت بکەن بۆ شکاندنی ئەو تەوقە زوڵم و زۆرداریيەی کە ئێوەی بێبەش کردووە لە هەموو خۆشییەکی ژیان و پێشکەوتن‌و بەختەوەری، ئەوە بزانن کە ئێوە لە ڕوانگەی حەقیقەتدا پەنجا قات لەو ئەرمەنییە مەزڵوومانە مەزڵوومترن..). ئەم رستەیەی دواییان وەك داکوتینی دوا بزمارە بە تابوتی ( ئەقڵێکدا کە کۆیلەی وەهمە ) و زۆر بە ڕاستەوخۆیی‌و ڕۆشنی ئەو ڕاستییە دەدات بە گوێی مرۆڤی جەنگاوەر و موسڵمانی کورددا، کە ئیتر بەسیە چەواشەیی‌و گێلی و نەفامی.. ئیتر بەسیە خۆشباوەڕیی بەوەی کە گوایە ئەمە شەڕی نێوانی (ئیمان و کوفرە)، نەخێر ئەمە شەڕێکە بە فیتی سەردەستەکان و ناوماڵی کۆیەلەو ژێردەستەکانی گرتۆتەوە ، ئەمە شەڕێکە لەبەرژەوەندیی تورکاندا، کە تەوقی زوڵم و کۆیلایەتییان کردۆتە گەردن‌و دەست و پێ و ئەقڵی ئەرمەنیی مەزڵووم و کوردی لەوان مەزڵوومترەوە . بۆیە : ئەقڵی خۆتان بخەنە گەڕ و حەق و ناحەق، راستی و درۆ بە چاوی خۆتان ببینن و خۆتان مەکەن بە سووتەمەنیی شەڕێکی ناڕەوا و ناحەق. لە درێژەی هەمان وتاردا دەڵێ: (...بەینا وبەین کەسانێکی گێرەشێوێن هەڵدەکوتنە سەر ئەرمەنییەکان، ئەو حکوومەتە زاڵمەشمان بە تۆپ و تفەنگ و پارە و جاسووس و جەللادەکانی، بیست و پێنج ساڵە خۆی سەپاندووە بەسەر ئێوە و هەموو ئیسلامدا ! ) تا دەڵێ: (... ئایین و غەزا چۆتە حاڵەتێکی نادیارەوە و ئێوەیش بۆ شەڕکردن لە دژی ئەرمەنییەکان، دەبنە داردەستی کاربەدەستانی حکوومەت. کوردەکان، تا ئێوە

لەو شێوەیەدا بن، پلەی ئاگایی‌و هوشیاریتان هەر لەو ئاستەدا دەمێنێتەوە کە شاخەکان دەوریان داوە، توانای ئەوەتان نابێ بیر لە گەورەیی رابردووتان بکەنەوە. توانای ئەوەتان نابێ ئەو شتە گرنگانە ببینن کە میللەتان پێی گەیشتوون. گەورەیی و شان و شەرەف ئەوە نییە کە لەژێر دەستی زەکی پاشادا یەکێك بن لە رەعیەتی حەمیدییە، بەڵکو ئەوە دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەتان لە هەموو گەورەییەك، ئەبێ ئێوە خۆتان شەرەف و بەرزیتان بەدەست بێنن).

ئەم تێڕوانینە رۆشن و ئەقلانییە دوور لە وەهم و غەیبانییەت و دوور لە خۆبەدەستەوەدانە،جارێکی تریش لە وتارێکی زۆر گرنگی ژمارە (٢٦)دا رەنگ دەداتەوە: (...لەگەڵ ئەو زوڵم و زۆرداریيەی لەپێناو بەرژەوەندیی زاتی خاوەن شکۆ ئەنجام دەدرێت، هەروەها بە پێی وتەی بەناوبانگی (فرق تسد) هەر لەگەڵ بینینی دوو کەس کە پەیوەندییان رێکوپێکە، یان دوو برا کە پشتیوانی یەکتر بن، بە چەندین نموونەی جۆراوجۆر سەلماوە کە دەستدەکەن بە هەوڵی تێکدانی ئەو پەیوەندییە باشەی لە نێوانیاندایە، تەنانەت دەیانکەن بە دوژمنی یەکتری. هەر بەو جۆرەیش ئەو دوو نەتەوەیەی کورد و ئەرمەنی کە چەندین سەدەیە لەو نیشتمانەیاندا بە پەیوەندییەکی برایانەی باش ژیاون، لە ئەنجامی رشتنی تۆوی فەسادی و نیفاق‌و نەزانی و بێئاگایی خۆیان، لە یەکتر بوون بە دوژمن و دەستیان کرد بە کوشتنی یەکتری لەپێناو جێبەجێکردنی ئارەزووی خوێنرێژی و جینایەتکارانەی پاشامان). لە درێژەی ئەم وتارەدا، تیشك خراوەتە سەر گەلێ بەڵگەی ئەقڵی‌و لۆژیکی کە لە رووداوەکانەوە، لە واقیعەوە، نەك لە وەهم و ئیددعاوە، هەڵهێنجراون، کە هەرهەموویان ئەوە دەسەلمێنن شەڕی نێوان کورد و ئەرمەنییەکان هیچ پاساوێکی نییە و نە ئەقڵ و نە زانست و نە ئیمانیش رێی پێنادات و لە فیتنە و فەسادی حکومەتی زاڵم بەولاوە هیچی تری لە دواوە نییە و لە کۆتاییشدا زۆر بە روونی، رێگەی رزگاربوون لەو کارەساتە، چ بۆ کوردو چ بۆ ئەرمەنییەکان، دیاری و رۆشن دەکاتەوە: (...چ کوردو چ ئەرمەن،

ئەگەر ئەیانەوێت لەم بارودۆخە پڕ ئازارە و لەم زوڵم و زۆردارییە رزگاریان بێ، ئەوا بە رێککەوتنو یەکگرتن سەرکەوتن بەدەستدێنن).

لە وتارێکی تری ژمارە (٢٧)دا، روونتر، راستەوخۆتر، راشکاوانەتر لە دژی ئەو وەهمە دەوەستێتەوە کە گوایا ئەم شەڕەیان شەڕێکە لەپێناو ئیسلامدا، شەڕێکە لەپێناو {خودا} دا !.. (کوردەکان! ...... عەبدولحەمید، کە ئێوەی لە هەموو سەرکەوتنێکی شارستانی و زانستی و بەختەوەری و ئازادی بێبەش کردووە، لەپێناو جێبەجێکردنی مەبەستە گڵاوە ناشەرعییەکانی خۆیدا، کۆمەڵێك پەککەوتە و ئافرەت و منالی ئەرمەنی هاونیشتمانیی خۆتانی پێ کوشتوبڕ کردوون، بۆ لەکەدارکردنی ناوی میللەتەکەتان لە هەردوو دنیا. دەرکەوتووە کە ئێوە لە خزمەتکردن و جێبەجێکردنی مەرامەکانی عەبدولحەمید و فەرمانبەرە زاڵمەکانی بەولاوە هیچ شتێکی تر ناکەن. پاشا لە نەزانی و بێهۆشیتان سوودمەند بووە، ئێوەی کردووە بە داردەستی خۆی و هەموو زۆرو ستەم و خراپەکارییەکانی خۆی پێ داپۆشیوە، هەرچی روو ئەدات، ئەڵێن کوردەکانن...) تا دەڵێ : (کوردەکان! دڵنیا بن ئەو پلەو نیشانانەی کە ئێوە بە شەرەفمەندییەکی بەرزی دادەنێن، چاوتان لە ئاستی بینینی راستییەکاندا دەبەستنەوە، دەبنە هۆی کوژانەوەی چرای میللەتتان و لەناوبردنی پاشەڕۆژتان...) ... (ئایا هاوکاریکردنی ئەو پاشایەی مەبەستی ئەوەیە ئێوە بە میللەتێکی وەحشی بە دنیا بناسێنێت، شیاوی مرۆڤایەتیتانە؟ ئایا کوشتوبڕکردنی کەسانێکی پەککەوتەی ئەرمەنی، رووخاندنی نیشتمانو ماڵ و حاڵی خۆتان ناگەیەنێ؟).

هەر لە هەمان ژمارەدا و لە بەشی ژێرەوەی دوالاپەڕەیدا، لە ژێر سەردێڕی (رووداوەکان) دا، گەیشتووە بە ترۆپکی ئەقڵانییەت و دەڵێ: (بۆ حکوومەتێکی شارستانی، ئەوە بەس نییە کە تەنیا لە کاتی رووداوەکاندا توندوتیژی بنوێنێ بۆ دامرکاندنەوەیان، بەڵکو پێویستە هەوڵبدات بۆ دۆزینەوەی رێگە و شێوازێکی حوکمڕانی کە لە چوارچێوەی ئەقڵو ئینسافدا بێ ، تا ئەو رووداوانەی دامرکاونەتەوە ، جارێکی تر

روو نەدەنەوە . ئەو بەندەی خودایە کە بە (مرۆڤی) هاتۆتە دنیاوە، پێویستە مرۆڤانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت !).

**هەنگاوەکانی دیکە...**

ئەگەرچی وەك دیمان رۆشنگەرانی کورد، لە (کوردستان)ی دەرچووی دەرەوەی کوردستاندا، هەمیشە لە هەوڵی رۆشنکردنەوەی (ئێستا)و (دوارۆژی) کورددا بوون، بەڵام ئەوەشیان لەیاد نەکردووە کە بەشێکی گرنگ لە بزاڤی رۆشنگەری بریتییە لە بووژاندنەوەی سامانی ئەدەبیی میللەت و رۆشنکردنەوەی مێژووی پڕ سەروەریی باو و باپیران و ناساندنی‌نەوەکانی ئەمڕۆیەتی بە کەسێتیی ناودارو خۆبەختکەرانی ئێستا و رابوردوویان.

لەم روانگەیەوە، هەر لەژمارە (٣)وە سەرنووسەر بەڵێنی خۆی لە بارەی بڵاوکردنەوەی شیعر و بەیتی کرمانجی و حیکایەتی (قنج) لەسەر خواستی هەندێ لە میر و ئاغایانی خوێندەوار کە نامەیان بۆ ناردووە لەناو کوردستانەوە، دێنێتەدی و بە بەشبەش داستانەکەی (مەمو زین)ی (ئەحمەدی خانی)، بڵاو دەکاتەوە . دیارە بایەخ و گرنگیی (مەمو زین)یش لای هیچ کەسێکی ئاگادار، ون نییەو بە بڵاوکردنەوەیشی لە رۆژنامەی (کوردستان)دا ئەرکێکی گەورە و گرانی ئەستۆی رۆشنگەرایەتی کوردی جێبەجێ بووە.

جگە لەمەیش، دەکرێ بڵێین (کوردستان) یەکەمین مینبەرێکە لە مێژووی کورددا کە (حاجی قادری کۆیی)ی شاعیرو رۆشنگەرو خەباتگێڕی کوردی بە کوردو بە میللەتانی تر ناساندبێ و شیعرێکی بەهاداری بە ناوەڕۆکی حاجیشی بڵاو کردۆتەوە.

لە رووی زیندووکردنەوەی مێژووی میللەتی کوردیشەوە ، هەر لە ژمارە (٨)ی رۆژنامەکەوە بە زنجیرە، باسی مێژووی حاکمەکانی (جزیرەو بۆتان)بڵاوکراوەتەوە و لە ژمارە (١٣)شدا بە کوردی و لە ژمارە (١٤)یشدا بە تورکی، دوو وتاری گرنگ و مێژوویی دەربارەی سەردەمی حوکم و شۆڕشی (بەدرخان بەگ)ی میری بۆتان، بڵاو کراونەتەوە،

بەو کارەیشیان چەند بەشێکی گرنگو برگەی بنەڕەتیی مێژووی سیاسیو کۆمەڵایەتیی (نوێی) کوردیان ڕۆشن کردۆتەوە .

## ئەو هەنگاوانە چییان لێ شین بوو؟

بۆ ئەوەی بزانین بەرهەمی ئەو خەبات و تێکۆشینە، چیی لێ شین بووە؟ بەری ڕەنجی ئەو ڕۆشنگەرانە، لەناو کورداندا چی بووە ؟ دەبێ چاوێ بەو دوو نامەیەدا بخشێنینەوە کەیەکێکیان لە شامەوە و ئەویتریان لە کوردستانەوە گەیشتوون بە سەرنووسەری (کوردستان)، بە خوێندنەوەیەکی وردی ئەو دوو نامەیە، زۆر شتمان بۆ ڕوون دەبێتەوە و وەڵامی ئەو پرسیارەیشمان دەستدەکەوێت.

لە دوالاپەڕەی ژمارە (٣)دا، لە ژێر سەردێڕی ("تقریض" لە شامەوە هاتووە) دەڵێ: (ئەم ڕۆژنامەیە کە لە لایەن میری ئێمەوە بلاو دەبێتەوە گەیشتۆتە شام و دانەیەکم پەیدا کردو هەموو کوردەکانی نزیکمانم کۆ کردەوە بۆ ئەوەی ڕۆژنامەکە ببینن کە ناوی (کوردستان) ـەو خاوەنەکەیشی میری ئێمەیە، هەموویان لە سەرەتادا ماچیان کردو خستییانە سەر سەری خۆیانو زۆر شاد بوون، دواتر بۆم خوێندنەوە دڵیان خۆش بوو هەروەك تۆ ئەم دنیایەت پێ بەخشی بن. ئەو ئامۆژگاری و پەیامانەی نووسیوتن بە باشی وەریانگرت. زانییان کە شتێکی باشەو ئەو هەواڵەیان لەناو خۆیاندا بڵاو کردەوە، کە لەمەودوا هەرکەسێك گەورە بێ خۆی لە ئیشی حەممالی ڕزگار بکات و فێری وەستایی ببێت و فێری چەکی تازە ببێت و لەناو خۆیاندا پارە بە یەکتری بدەن و منالەکانیان بنێرنە بەر خوێندن و ڕەوانەی شارەکانی خاوەن سنعەت و فەنیان بکەن....)... (... تۆ ئەم عەزیەتو مەسرەفە بۆ چاکەی کورد دەکێشیت، تۆ ئەم ڕۆژنامەیەت بۆ ئێمە بڵاو کردۆتەوە، خوا لە تۆ ڕازی بێت، گەلێك ئایەت و حەدیسو ڕێگای باشت پیشان داین، ڕەحمەت لە باوکت بێ...)..(... خواو پێغەمبەریش لەمەودوا هاریکاریتان دەکەن، ئێمەیش هەر چاوەڕێی پۆستەی ڕۆژنامەکەتانین ... هتد.)

لە ژمارە (١٧)یشدا لە ژێر سەردێڕی: (نامەیەك لە كوردستانەوە پێم گەیشتووە) نووسەری نامەكە دەڵێ: (جگە لە یەك ژمارەیان، سەرجەم ژمارەكانی تری ڕۆژنامەی كوردستانم خوێندۆتەوە، ئەم پێشكەوتن و دەسكەوتە بە سایەی خۆڕاگریو تێكۆشینی لەڕادەبەدەری ئێوەوەیە كە میللەتێكتان بە ئەلف و بای سەرنجدانو وردبوونەوە ئاشنا كردووە، دەستتان خۆش بێو پیرۆزباییتان لێدەكەم...).

(لەوانەیە ناحەزانتان بڵێن ڕۆژنامەیەك بە زمانی نەتەوەیەك كە خوێندەوارەكانی بە ڕێژەی لە هەزاردا یەك بن، دەشێ چی لێ چاوەڕێ بكرێ و بەرهەمی چی بێ؟ ئەوانەی ئەم جۆرە كێشانە دەهێننە ئاراوە، نازانن ورییایی لەحەد بەدەری میللەتێك، زۆرجار بە سایەی یەك دوو كەسەوەیە، بە تایبەتی لەناو نەتەوەی كورددا كە شاعیری وەك (فضولي)و جەنگاوەری وەك (صلاح الدینی ئەیوبی) پێگەیشتبن، ئیتر بۆچی ڕووناكبیرانی نەبنە ڕووناككەرەوەی ئاسۆی عیرفان......هتد).

(.... هەروەكو چۆن ئەندامێكی لەش كە لێی ئەدرێت، نیشانەیەكی ئەو لێدانەی پێوە دیار ئەبێ، بیرو بڕوایەكیش كە بەر مێشك بكەوێت، مەحاڵە شوێنەوارێك جێ نەهێڵێت، ئێوە كە دەستەبژێری ئەم میللەتەن ئەركی ویژدانیتانە كە میللەتەكەتان بە مافە سروشتیو سیاسییەكانیان ئاشنا بكەن).

(ئەمڕۆ خەڵك هوشیار بوونەتەوە، لە توانایاندایە ئەو دەستی مەرحەمەتو هاوڕێیەتییەی بۆی درێژ ئەكرێت، لە دەستی خوێناویی زۆردارێكی خوێنڕێژ، كە ماڵ و حاڵی زەوت ئەكات و ڕۆڵەكەی لەناو ئەبات، جیا بكاتەوە).

(كوردەكان تا ئێستا نەیانئەزانی "خەلیفە" چییە، تێگەیاندنیان لەم بارەیەوە، چەند هیممەتێكی گەورەیە !).

(كوردەكان لایان وابوو كە حكوومەت هەرچییەك بكات حەقی خۆیەتی و پاشا هەرچییەك بكات كەرامەت و عینایەتە. ئێوە لە كوردەكانتان گەیاند كە ئەو بیروباوەڕانە ڕاست نین و هەركەسەو خاوەنی مافێكی دیاریكراوی خۆیەتی. ئەو

موناقەشاتو مشتومڕی قەڵەمە، کە خستووتانەتە ئەستۆی خۆتان، غەزایەکی زۆر پیرۆزە).

(لەوانەیە ئەم زۆرانە قەڵەمییەتان .زۆر بخایەنیو ئێوە بە بەرهەمەکەیو نەتیجەکەیدا نەگەن، بەڵام هەردوو چاوەکەم عەبدولڕەحمان بەگ، دڵنیا بن لەوەی بەرەکەتی سروشتی تێگەیشتن، لە بەرەکەتە پرشنگدارەکانی مێشکی مرۆڤە، ئەو بەرەکەتە بەرزە هەمیشە دەبێتە هاندەرو یاریدەدەری هیممەت و غیرەتتان......).

(هەتا ئێستا زوڵم و ستەم حوکمڕان بوون، لەمەودوا حوکمڕانی بۆ دادپەروەری و رووناکییە !).

(ئیدی زمانی حاڵمان دەڵێت: "زۆر لەمێژە لەناو گومانداین.. ئێستا راستیمان دەوێ......"، دەرخستنی راستییەکان هیچ کاتێك زیانبەخش نابن). کوردێك.

بە راستی قەڵەم لە توانایدا نییە، لەوە زیاتر کە لە دەقی ئەو دوو نامەیەدا هاتوون، لەبارەی ناوەڕۆكو رەنگدانەوەی هەنگاوەکانی رۆشنگەران و (کوردستان ) ـــەوە لەناو کورداندا، شتێکی تر بڵێ. ئەو دوو نامەیە بۆ ئەوە دەشێن وەك دوو بەڵگەنامەی مێژوویی تەماشابکرێن، دوو بەڵگەنامە کە شاهێدی حاڵن و دوو وێنەی بەرجەستەن بۆ دیمەنی دەور و تەئسیری هەنگاوە سەرەتاییەکانی بزاڤی رۆشنگەریی کوردی لەناوخۆی کوردستانی داگیرکراودا .

بە دیوەکەی تردا، ئەم رۆژنامەیە کە هەڵگری ئەو گوتارە رۆشنگەری و خەباتگێڕییە بووە، وەك چۆن هەر لە سەرەتاوە، رێی نەدرا لەناو تورکیادا دەربچێ یان بڵاو بکرێتەوە ، هەروا لە قاهیرەیش کەوتنە راوەدوونانیو بڵاوکردنەوەیشیان لەناو تورکیادا قەدەغە کرد .. لە ژمارە (١٣)دا لە ژێر سەردێڕی (کاغەزێ لە کوردستانەوە هاتووە) خاوەنی نامەکە نووسیوێتی: (ئەمە دوو سێ مانگە جەریدەی کوردستان دێتە وڵاتی ئێمەوە، بەڵام مەئموورەکانی حکوومەت نامێڵن بە سەربەستی بیخوێنینەوە. بە دەستی هەرکەسێکەوە بیبینن ئەیگرنو ئەو کەسەیش ئەگرن و ئازاری ئەدەن. لەگەڵ ئەوەیشدا کرمانج هەمووی گەلێ مەیلی ئەکەن).

سەربارى قەدەغەكردنى (كوردستان) لەناو قەڵەمڕەوى توركاندا، مەدحەت بەدرخان لەدوورەوە حوكم درا، براكانى گیران و وەك فشارێك بەكاریان هێنان تا ( مەدحەت و عبدالرحمن ) ناچار بكەن دەست لە بڵاوكردنەوەى (كوردستان) هەڵبگرن و خۆیان بدەن بەدەستەوە، ئەگەریش نا ئەوا داوا لە كاربەدەستانى میسر بكرێ كە تەسلیمیان بكەنەوە بە توركیا..

لە ژمارە (٧)دا (عبدالرحمن بەدرخان ) لەو بارەیەوە نووسیویێتى: ( ئەگەر مەبەست و ئامانج لە گرتنو ئازاردانى براكانم، ئەوە بێت كە بیروباوەڕو عەزمم وەلاوە نێم و بگەڕێمەوە بۆ ئەستەنبووڵ، ئەوا قەسەم بەخوا، تەگبیر لە بەهێزتركردنى عەزم و خۆڕاگریم بەولاوە، هیچى تر نابێ) (شێر تا زامدار بێ، چنگەكانى تیژتر دەبن).

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، (كوردستان)و گوتارى نوێخوازو رۆشنگەرانەى ئەم رۆژنامەیە، نەك هەر لەناو كورددا، بگرە لەناو خودى توركاندا جێى بایەخ و سەرنج بووە، دیارە ژمارەیەكى زۆر خوێنەرى توركیشى هەبووە، یان هەر هیچ نەبێ ئەوانەى بە تەنیا توركییان بۆ خوێندراوەتەوەو نەیانتوانیوە كوردى بخوێننەوە، بە ئاواتەوە بوون بەشێك لە رۆژنامەكە بە زمانى توركى دەربچێت.. لە (راگەیاندنێكى تایبەت)ى ژمارە (١٨)دا، سەرنووسەر باسى ئەوە دەكات كە: (بەم دواییە خەڵكێكى زۆر داوایان لێكردم زمانى توركییش، كە زمانى رەسمییە، لە رۆژنامەكەدا بەشدار بكەم، بۆ جێبەجێكردنى ئەو داوایە، بڕیارم دا، بە هاوكاریى "فەوزى بەگ"ى خۆشكەزام، كە لەم رۆژانەدا بەهۆى بێزاریى لەو كارە نامرۆڤانەیەى لەناو سوپادا دەكرێ، پەناى هێناوەتە خانەى ئازادى و سەربەستى، نیوەى رۆژنامەكەم بە زمانى توركى بڵاو بكرێتەوە).

ئەو رۆژنامەیەى كە بە سەردێڕى: (هاندەرى كوردەكانە بۆ هوشیاربوونەوە و وەدەسهێنانى صەنایع) و بە پەیامى: (ئەمە یەكەمین جارە كە بەم زمانە ئەم رۆژنامەیەم بڵاو كردۆتەوە، بۆ مەبەستى تێگەیاندنى زانیارى و گیانى خۆشەویستى لەناو رۆڵەكانى نەتەوەكەم و هاندانى كوردەكان بۆ ئەوەى رێگەى پێشكەوتن و شارستانییەتى تازە بگرن، لە هەمان كاتیشدا ئەدەبى نەتەوەیى خۆیانیان پێ پیشان

بدەم...... بڕیارمدا لە رێگەی ئەم رۆژنامەیەوە هەموو توانای خۆم لە دوورە ولاتدا، تەرخان بکەم بۆ هەموو کارێك کە قازانج و بەختیاری و پەروەردەکردنی بیری تێدابێت بۆ هاولاتیانی کورد). دەستی بەکاری خۆی کرد.. بەم چەند رستەو دەربڕینە دەگاتە لوتکەی پەیامی رۆشنگەرانەی خۆی، کە لە وتارێکی ژمارە (١٨)دا هاتووە دەڵێ: (... بڕیاری هەڵهاتنم دا، چونکە گەیشتمە ئەو بڕوایەی جوولانی قەڵەمێك لە ئازادیدا، زۆر لە شمشێرێکی خراپەکاری پەککەوتووی هەڵواسراو کاریگەرترە.......). (نازانم ئیتر کێ شکات بکات و داوای ماف لە کێ بکرێت...... ئیتر کاتی سەیرو چاوەڕوانی بەسەرچووە، سەبری لەمەودوا ئاژەڵییە، بە دوای خاوەندا مەگەڕێن. خۆتان چارەسەری خۆتان بکەن. منیش بێدەسەلاتانە سەرکەوتن لە یەزدان داوا ئەکەم و بۆ ئارامیی ویژدانم لە میسرەوە لە رێی بلاوکراوەکانمەوە هەوڵی دەرخستنی راستییەکان ئەدەم).

## دەرئەنجامو پوختە:

رۆژنامەی (کوردستان) لەسەر دەستی رۆشنگەرانی رابەری کورد، لە دواساڵەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا کە سەدەی دووەمی رۆشنگەریی ئەورووپاو خۆرئاوا بوو، هاتە دنیاوە و هەم یەکەمین هاوارو هەم یەکەمین هەنگاوی رێی سەختی تێکۆشینێکی مۆدێرنانەی کورد بوو.

(کوردستان) مینبەری رۆشنگەریی کوردی بوو، پەیامی هەڵسانەوەی رۆشنگەرانەی مرۆڤی کوردبوو لە پاش شکستی دوایین میرنشینیو نشوستی خوێناویی دوایین شۆڕشی سەربەخۆخوازی سەدەی نۆزدەهەمی.

بایەخدان بە گرنگیی لەکۆتا نەهاتووی خوێندن و خوێندەواری و بلاوکردنەوەی زانست و مەعریفەت، پێشخستنی ولات لە رووی پیشەسازی و کشتوکاڵی و زانستی و سەربازییەوە، رۆشنکردنەوەی بەرچاوی خەڵکی مەزڵووم و چەواشەکراوی کورد و ئەرمەن ، رەواندنەوەی وەهمی راستگۆییو حەقخوازیی خەلیفە و دارودەستەکەی لەلای کوردی خۆشباوەڕ، هوشیارکردنەوەیان لە یاریی تەڵەکەبازانەی دوژمنان بۆ بەشەڕدانیان لەگەڵ ئەرمەنییە مەزڵوومەکاندا.. سەرباری ئەوانەش ناساندنی کورد بە

مێژووی خۆی و بە داستانێکی ئەدەبیی پڕ بایەخی وەك (داستانی مەموزین)...
هێنانەوەی باس و خواسی میللەتان و وڵاتانی پێشکەوتوو، وەك نموونە بۆ
چاولێکردنیان... وەبیرهێنانەوەی ئەرکی نیشتمانیو نەتەوەییو ئایینی لە
خزمەتکردنی وڵاتدا، لە ڕێی ئاوەدانکردنەوەو دروستکردنی قوتابخانەوە، هەموو ئەمانە
ناوەڕۆکی پەیامو گوتاری سەرەکی و لاوەکیی – کوردستان – بوون، کە هەر هەموویان
گەوهەری گوتارو پەیامی ڕۆشنگەری پێکدێنن .

ئەم هەوڵ و تێکۆشینە هەم دۆست و لایەنگر و هەم ناحەز و دوژمنیشی هەبووە...
پڕۆژەیەکی هوشیارانەی ڕۆشنگەریی کورد بوو، شوێنەواری بەرچاوی بەسەر ئاراستەی
بیرکردنەوە و هەڵوێستی نەوەکانی دواتری ڕۆشنگەرانی کوردەوە جێ هێشتووە و تا
ئەمڕۆیش نەفەسی ئەو پڕۆژەیە حزووری هەیە ، بارگەی بەهێزی ئەو هەوڵ وهەنگاوەی
یەکەم، هەر زیندووەو دڵی گەرمی لە لێدان نەکەوتووە !

**لیستی ناوی سەرچاوەکان :**


* ئەم باسە : سەرلەنوێ خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنە و بەپێزانین وسوپاسێکی زۆرەوە , ئەم سەرچاوانەم بەکارهێناوە ،
چ بە وەرگرتنی دەقی تێکستەکان لێیانەوە ، یان بە سوود وەرگرتن لە راو بۆچوونی نووسەرەکانیان :

1 – (کوردستان) یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی – ١٨٩٨ – ١٩٠٢ کۆکردنەوەو پێشەکی: دوکتۆر کەمال فوئاد/ بەغداد
.١٩٧٢

2 –وەرگێڕانی بەشە تورکییەکەی (کوردستان) یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی– چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٠ چاپخانەی داناز /
لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژ.

3 –(چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی ڕۆژنامەوانیی کوردی ١٨٩٨ – ١٩١٨ ) بەرگی یەکەم، نەوشیروان مستەفا ئەمین. چاپ
و ئۆفسێتی دەزگای سەردەم – ساڵی ٢٠٠١ لە زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم (١٣٤).

4 – ( ڕۆشنگەری ـ هەنگاوی یەکەم) / لوید سپینسەر و ئەندریژ کرۆز / وەرگێڕانی لە فارسییەوە – پێشڕەوحسێن –
لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری ڕاگەیاندنی کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان – ژمارە (٢) پڕۆژەی وەرگێڕان – ٢٠٠١ –
سلێمانی.

5– ڕێنیسانس / د.کەمال مەزهەر

# نەتەوایەتی و پۆست مۆدێرنیزم

ئەکرەمی میهرداد

بیروباوەڕی پۆست مۆدێرنیزم دەربارەی پرسی نەتەوایەتی، زیاتر لە مۆدێرنیزم گرنگی بە نەتەوایەتی دەدات و لە هەندێك لایەندا بەشدارییەکی زیاترە لە مۆدێرنیزم بۆ شیکردنەوە و لێکدانەوەی نەتەوە و نەتەوایەتی . سەرەتا بۆ ئەوەی بتوانین لەم پرسەدا بەشدارییەکی باشتر بکەین و بتوانین لە روانگەی پۆست مۆدێرنیزمەوە زیاتر لە راستینەی نەتەوایەتی و ناسنامەکان بگەین، پێویستیمان دەبێت کە زانین و لێکۆلینەوەی نوێ و هاوچەرخ بۆ هەردوو دیاردەکە بکەین، کە ئەوانیش دیاردەی نەتەوایەتی و پۆست مۆدێرنیزمە. دەمەوێت وەبیرهێنانەوەیەك بۆ ئەو بیر، ئاست و لێکدانەوانە بەیان بکەم کە تا ئێستا دەربارەی نەتەوایەتی من بۆ خۆم پێیان گەیشتوومو باسی ئەوەش ناکەم کە ئەم شیکردنەوەیە، تاکە شیکردنەوەی راست و گونجاوە، بەڵکو دەتوانین بۆ دیاردەیەکی دیاریکراو، بۆ نموونە نەتەوایەتی، بیرو لێکدانەوەی جیاواز و جۆراوجۆرمان هەبێت و سەرەنجام لە گفتوگۆی نێوان ئەو پێناسە و لێکۆلینەوانە، بۆ هەمان دیاردە، بتوانین لە راستی نزیك ببینەوە.

یەکەمین ئاست و ئاسۆی تێگەیشتن لە پرسی نەتەوایەتی ئەوەیە کە, نەتەوەکان وەکو دەرکەوتەیەك یان دیاردەیەکی مێژوویی, سیاسی, ئابووری, فەرهەنگی و کۆمەلآیەتی دەناسرێت, واتە نەتەوە دیاردەیەکە کە هەموو ئەو رەوشانەی کە ناوم هێنان کاریگەرییان هەیە لەسەر دەرکەوتنی و پێشکەوتنی، نەتەوەش پەیوەندی و کاریگەری لەسەر ئەوان هەیە. مەبەست لە باسکردنی ئەم ئاستە(ئاسۆیە) بۆ ناساندنی نەتەوە ئەوەیە" کە نەتەوایەتی تەنها لێکدانەوەیەکی فەرهەنگی یان (زمانی) بۆ ناکرێت, ئەگەرچی هێندێك بیروباوەڕ هەن کە نەتەوایەتی بە زمان یان فەرهەنگ یان وەکو ڕێبازی ئەلمانی نەتەوە بە پەروەردە دادەنێن. قوتابخانەی ئەلمانی لەسەر دەستی (فیختە ١ ) نەتەوە و نەتەوایەتی وەکو دیاردەیەکی نەژادی و فەرهەنگی دەناسێنن و دەلێن هەموو ئەو کەسانەی بە ئەلمانی دەدوێن لە ئەوروپا بە ئەلمانی و ئەلمانیان دەزانن. ئەم بیروباوەڕە یەکێك بوو لەو هۆیانەی بە داخەوە لە ئەنجامدا نازیزم و فاشیزمی لێپەیدا بوو, سەرەئەنجام گەیشتنە ئەو رادەیەی کە ئەلمانیا و ئارییەکان بەرتر(امتیاز)یان هەیە بەسەر نەتەوەکانی دیکەدا. لێکدانەوەی ستالین و مارکسیستەکان لە نەتەوە, وەکو دیاردەیەکی ئابووری و بە تایبەتیش ئابووری سەرمایەداری دەزانن، ئەگەر نەتەوەیەکیش (وەکو کورد یان ئەرمەن یان یەهودی پێش ١٩٤٨) بێبەش بووبێت لە ئابووری هاوبەش, بەپێی لێکدانەوەی تاك رەهەند و تاك ئاسۆکەی ئەوان (لێکدانەوەی ئیکۆنۆمیستی), ئەوا لە نەتەوەیی بوون دەکەوێت و پێکهاتەکانی دیکەی نەتەوە فریای ناکەون. لێکدانەوەی تاك ئاستی, یان تاك بیروباوەڕی کە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی شیکردنەوەی مۆدێرنێتی بەهەموو بیروباوەڕەکانی (ناسیونالیستی, مارکسیستی و لیبرالی)یەوە, کە بەپێی مەبەست و بەرژەوەندییەکی دیاریکراو نەتەوەیان تا رادەی ئەو تاك رەهەندییەی خۆیان هێناوەتە خوارەوە و ئەمەش وێرای ئەنجامی جەنگ و توندوتیژی وەکو بەرئەنجامێکی مەنتقی ئەو بیروباوەڕانە و بەگژاچوونی بیروباوەڕەکانی دیکە.

ئـەو بیرانــە, ئاســتانە, سیاســەتانە لــەوە بێئاگــان (یــان نەیاندەویســت کــە بــزانن!)نەتــەوەکان دیاردەیــەکی مێــژووین و هــەموو رەوشــەکانی ئــابووری, سیاســی, فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی کاری تێدەکـەن و هـەموو بیروباوەڕەکـانیش بـەدەوری خۆیـان کاریگـەری و بەشـدارییان لـە نەتەوایەتیـدا هەیـە و نەتەوایـەتیش جێگادەسـتی تائێسـتا بـەوان و بـە مێـژوو, ئـابووری , فەرهـەنگ و سیاسـەتی جیهانییـەوە دیـار و ئاشـکرایە. رەخنەی نوێ و پۆست مۆدێرنیزم لە بۆچوونی زمانـەوانی و فەرهـەنگی وامـان لێـدەکات کە تەماشای نەتەوەکان بکەین و ببینین, کە بەشی زۆری ئـەمریکای لاتـین بـە ئیسـپانی دەدوێن و زمانی ئیسپانی زمانی رەسمیانـە، بـەڵام (ئیسـپانی) نـین. چـەندین نەتـەوە و وڵات بە فارسی دەدوێـن و فـارس یـان (ئێرانـی) نـین. چـەند وڵات و نەتـەوە بـە تـورکی دەدوێـن و تـورك و (تورکیـا) نـین. بەشـێکی زۆری ئـەفریقا بـە فەرەنسـی و ئینگلیـزی دەدوێن و لە راستیدا ئینگلیز و فەرەنسی نین و لەمانـەوە دەگەینـە ئـەو ئەنجامـەی کـە هەموو ئەو وڵات و نەتەوانەی بە ئینگلیزی دەدوێن (جگە لە ئینگلانـد) هیچیان ئینگلیـز نین و بۆمان دەردەکەوێت کە بەشی زۆری جیهان بە زمانی نەژادی و فەرهـەنگی خۆیـان نادوێن، بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە تەنها شیکردنەوەی زمـانیی و فەرهـەنگی بـۆ نەتەوەکان بەتەنها نابنە ئاست و ئاسـۆیەکی گونجـاو بـۆ ناسـین و دیـاریکردنی چـەمکی نەتەوە . ئەوەی کە پۆسـت مـۆدێرنیزم فێرمـان دەکـات, ئەوەیـە کـە هەمیشـە لەچـەند ئاست, ئاسۆ, بیر و بەرژەوەندیدا دیاردەکان بناسین و لە ئەنجامی گفتوگۆی نێـوان ئـەو بیرانەدا دەتوانین زیاتر لە راستی نزیك ببینەوە. لێـرەدا دوو رەوش و میتـۆدی گرنگمـان بۆ دەردەکەوێت" یەکەم, ئەوەیە ئێمە لە زانستی کۆمەڵایەتیدا تـەنها دەتوانین لە راستی وبەرژەوەندی و بەهرەمەندی و ئازادی زیـاتر نزیـك ببینـەوە, واتـە زانسـتی کۆمەڵایـەتی وەکو زانستی ئەزموونی یان زانستی ئەبستراکت (ماتماتیك, فیزیك, بایۆلۆجی) نییـە کـە بتوانین بە ئەنجامی تەواو و راست بگەین, بەڵکو ئەوەیە کە لە زانستی کۆمەڵایـەتی یـان دیاردەکـان (وەکـو نەتەوایـەتی) هـەموو هەوڵـەکان, بیرەکـان, ئاسـۆکان, بـۆ زیـاتر

نزیکبوونەوە لە راستی و دووەم, دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئێمە لە نێوان گفتوگۆی ئەو بیرانە,(ئاستانە) و بەرژەوەندییانە دەتوانین لە راستی زیاتر نزیك بینەوە (٢)

. کاتێك کە باسی ئەوە دەکەین نەتەوایەتی دیاردەیەکی فرەیە و هەموو رەوشەکانی ئابووری, سیاسی, فەرهەنگی, و کۆمەلایەتی دیاری دەکەن, تەنانەت سیاسەتی نێودەوڵەتیش کاریگەری هەیە لەسەر دیفاکتۆی نەتەوەکان, ئەگەر تەماشای ئەوروپا بکەین کە کێشەی نەتەوایەتی لەو کیشوەرە زیاتر لە هەموو شوێنێك چارەسەر کراوە, بەلام هێشتا کەم ولات هەیە لە ئەوروپا کە تاك نەتەوە بێت, کارل پۆپەر دەڵێت: ((تاکە ولاتێك تاك نەتەوە بێت تەنها ئەلمانیایە)) (٣).

ئەمە پەیوەندی بەو دیفاکتۆیە هەیە کە سیاسەتی نێودەولەتی لە دوای ساڵی ١٨١٥ تا رادەیەك توانی جێگیرییەکی سیاسی بۆ ئەوروپا لەسەر بناغەی بەناو (دەوڵەتی نەتەوە) یان (دەوڵەتی نیشتمان) پەیدا بکات، ویرای ئەوەش تا ئێستا کێشە و پرسی نەتەوایەتی ماوە و لە سالانی نەوەدەکاندا گەلێك کێشەی لەو جۆرەمان لە خودی ئەوروپاشدا بینی, ئەمە سەرەڕای بوونی پرس و کێشەی نەتەوایەتی لە ولاتانی دیکەی دنیا، بوونی ولاتانی چەند نەتەوە لە ئەوروپایەکی چارەسەرکراوی کێشەی نەتەوایەتی بە تەواوی, لێکدانەوەی نەژادی یان زمانی بۆ نەتەوەکان پەسەند ناکات.

**دووەمین** ئاستی ناسین و لێکدانەوەی نەتەوە و نەتەوایەتی, ئەوەیە کە نەتەوەکان خاوەنی چەند پێکهێنەرێکی میللین و ئەو پێکهێنەرانە هەموویان کاریگەریان هەیە لەسەر پرسی نەتەوایەتی, واتە نەتەوە چوارچێوەیەکی گشتییە کە خاوەنی چەند تایبەتمەندی هاوبەشە لە زمان, خاك, فەرهەنگ, ئابووری, باری سایکۆلۆژی و دەسەلات (٤). لێکدانەوەی پێشو کە لێکۆلینەوەکەی ستالینە بۆ پێکهێنەرەکانی نەتەوە تا ئێستا باشترینە لەو مەیدانەدا, بەلام خراپی دیدی ستالین ئەوەیە کە ئەگەر یەکێك لەم پێکهێنەرانە لەنەتەوەدا نەبوو, ئەوا ئەو کۆمەڵە خەڵکە لە حالەتی نەتەوەیی دەکەون، بە تایبەتیش ستالین سەبارەت بە پابەند بوونی بۆ شیکردنەوەی ئابووریانەی مارکسیزم مەرجی ئابووری هاوبەش لەوانی دیکە بە گرنگتر دەزانێت و دەڵێت ئەوکۆمەلانەی

خاوەنی ئابووری هاوبەش نین نابنە نەتەوە. ئەگەر تەماشای نەتەوەکانی "( سیرب, کروات, و بۆسنە) بکەین دەرئەکەوێت کە هەرسێکیان( سرب و سلاڤن), بەلاّم پێکهێنەری دینی ئەوانی بەم جۆرە لێك جیا و جیاواز کردووە, سیربی ئەرسەدۆکس, کرواتی کاسۆلیك و بۆسنەی ئیسلام بوونەتە سێ نەتەوەی جیاواز لەیەك و گەلێك توندوتیژی و دوژمنکارییان لە دژی یەکتری نواندووە. جیابوونەوەی پاکستان و بەنگلادیشی ئیسلام لە هیندستانی هیندۆس, جیابوونەوەی ئەو ئۆردوو نەژادانە بەهۆی دەسەلاّتی بەریتانیا و دینی ئیسلامەوە بۆ نەتەوەی جیاواز. لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە ئاست یان پێکهێنەری دینی کاریگەری گەورەی لەسەر نەتەوەکان هەیە, جیابوونەوەی ئیرلەندای کاسۆلیك لە بەریتانیا و ئێرلەندای پرۆتستانت و جیابوونەوەی کورد و فارسی (ئاری نەژاد) لەسەر بناغەی شیعە و سوونەبوون ئەو دیاردە و دیفاکتۆیانەن کە کاریگەرییان هەیە لەسەر رەوشی نەتەوەیی و نەتەوەکان.

بەم جۆرە دەرئەکەوێت کە تەنانەت ئەم ئاستەش بۆ خۆی فرە پێکهێنەر و فرە رەهەندە و هەموو تایبەتمەندی و پێکهێنەرەکان کاریگەرن لەسەر رەوشی نەتەوایەتی، مەرجیش نییە نەتەوەیەك بە شێوەیەکی ستاندار و گشتی لە هەموو ئەم مەیدانانەدا کارا بێت، بەڵکو بەو جۆرەیە کە باری مێژوویی, سیاسی, ئابووری و فەرهەنگی ئەو نەتەوە چۆنی بۆ دەستبدات بەو پێیە دەتوانێت لەم مەیدانانەدا یان هەندێك لەم مەیدانانەدا, کاریگەری و دەسەلاتی نەتەوەیی خۆی پیادە بکات و دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە دیسان لێکدانەوەی تاك ئاست و تاك پێکهێنەر, دەبێتە میتۆدێکی میتافیزیکی و لێکدابڕاو, هەرچەندە هەندێك لە بیروباوەڕەکان بەو جۆرە هەڵوێستیان نواندووە.

ئەم دوو ئاست و ئاسۆیە بۆ ناسین و شیکردنەوەی نەتەوە و نەتەوایەتی, دەبنە دوو ئاستی بابەتی بۆ نەتەوەکان بۆ زیاتر شارەزابوون لە نەتەوایەتی پێویست دەبێت بچینە سەر ئاستی خۆیی بوون (زاتی).

سێیەمین ئاست و ئاسۆی نەتەوە, ئەوەیە کە دەبێت نەتەوەکان لەواری تایەبەتی و خودیدا توانایەك بنوێنن بۆ ئەوەی خۆیان بسەلمێنن و نەتەوایەتی خۆیان پیادەبکەن،

بۆ زیاتر شیکردنەوەش پەنا دەبەینە بەر بڕوای زانا و فەیلەسووفی سەدەی نۆزدەی فەرەنسی (ئێرنست رینان) کە دەڵێت"((نەتەوە دەنگدانێکی بەردەوام و ڕۆژانەیە)) (٥). یەکێك لەو نەتەوانەی کە بەردەوام دەنگی بەخۆی داوە, ریفراندۆمی بۆخۆی کردووە, خۆی سەلماندووە نەتەوەی کوردە, واتە ئەگەر نەتەوەیەك نەتوانێ خۆی بسەلمێنێ لەوانەیە لە نەتەوایەتی بکەوێ، یان ببێتە نەتەوەیەکی دیکە. ئازەرییەکان لە ئێران, هەرچەندە لە کورد زۆرترن, بەڵام بەرەو ئەوە دەڕۆن کە زیاتر ببنە فارس و ئێرانی, چونکە نەیاتوانیوە یان نەیانویستووە بە ئازەری تورك بمێننەوە. (ئێرنست گیلنەر)ی بەریتانی دەڵێت"(( نەتەوە فەرهەنگ و ئیرادەیە)), واتە نەتەوە و فەرهەنگەکەی بە ئیرادە و کار دەچنە حاڵەتی کردەیی و پیادەکردنەوە. یان هەر خۆی دەڵێت کە : نەتەوایەتی نەتەوە دروستدەکات (٦) . مەبەست لەمەش ئەوەیە کە دەوڵەت یان بزووتنەوەی نەتەوایەتی دەتوانێت نەتەوە دروستبکات. ئەگەر چی ئەم پێناسەیە بۆ نەتەوە تاك ئاراستەیە, بەڵام هێشتا بەشێك لە راستی تێدایە و خۆیی بوون و سەلماندنی نەتەوەکان یەکێکن لە ئاستە گرنگ و چارەنووس سازەکانی نەتەوایەتی. قوتابخانەیەکی دیکە, کە بە پەیڕەوی سۆسیال دیموکراتی نەمسا(ئۆتریش) ناسراوەو لەسەر زمانی ئۆتۆباوەری ڕابەریان : نەتەوە بەرەنگدانەوە و بەجێهێنانی پێداویستییە کۆمەڵایەتی, سیاسی, فەرهەنگی و ئابوورییەکانی ئەو خەڵکانە دەزانن کە ئەو نەتەوەیەی لێ پێکهاتووە (٧). ئەم لێکدانەوە چەپە, شیکردنەوەیەکی رادیکال لەبەرژەوەندی خەڵك ، بە تایبەتی کرێکاران و زەحمەتکێشان لە نەتەوە بەیان دەکات.

تێکەڵاوکردنی هەردوو باری بابەتی(خاڵەکانی ١ و ٢) و خودی (ئاستی سێیەم) **ئاستی چوارەم** پەیدا دەکات, کە ئەویش رەوشی نەتەوەیی بوونە بەهەردوو ئاستەکانی بابەتی و خودی. لێکۆڵیاران و زاناکان دەڵێن باشترین جۆری نەتەوەیی بوون, هۆشیارییە دەربارەی خۆ و ئاگایی ئەو نەتەوەیە کە دەتوانێت چۆن و لەکام رێگا و بەهۆی کام لەپێکهێنەرەکانەوە (کە ئەو کاتە ئەو نەتەوەیە تیایدا بەهێزە) دەتوانێت هۆشیاری و نەتەوەیی بوونی خۆی پیادە و بەرجەستە بکات. ئاگایی دەربارەی خۆ و

نەتەوەیی بوونی ئێران یان (هویت ایرانی)بوو کە شیعەی دوانزە ئیمامی کردە مەیدانێکی گرنگی خۆجیاکردنەوە لە سونەی عوسمانی و عەرەبی و توانیان لەو ڕێگایەوە چوارچێوە و پەرژینێکی پتەو بەدەوری ئێراندا بۆ خۆپاراستن لە هێزە ئیسلامییە دژەکانی دەوروبەری خۆیان پەیدابکەن .. ئاگایی و هۆشیاری ئەمریکا وای کرد کە وڵات و نیشتمانی ئەمریکا لەسەر بناغەی هاوڵاتی یان هاونیشتمانی بنیاتبنێن, نەك لەسەر بناغەی نەژاد و فەرهەنگ _نموونەی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا_ چونکە سیاسەتی نەژادی و زمانی و فەرهەنگی دەروەستی فرەیی جیاوازی نەژادی ئەمریکا نەدەهات بۆیە سەرەنجام لەسەر بناغەی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتی بوون, ڕەوایی و فەرهەنگی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایان وەك نیشتمانێك پێکهێنا.. هەر بەو بۆنەوە, ئەلبانییەکان وێڕای جیاوازبوونیان لە بواری ئاییندا و دابەشبوونیان بەسەر ئایینەکانی ئەرسەدۆکس, کاسۆلیك, ئیسلام و تەسەوف, پەنایان بردە بەر ڕەهەند و ئاستی زمانی وەکو تاکە پێکهێنەری هاوبەش بۆ بنیاتنانەوەی نەتەوایەتی ئەلبانی, چونکە دەبێت ئەوەش لەبەر چاو بگرین کە ئەلبانەکان بەسەر چەند ولات و دەوڵەتێکدا دابەش کرابوون و خاکی هاوبەشیان لێزەوت کرابوو.

ئاگایی و هوشیاری دەربارەی خۆ, وای کرد کە یەهود پاراستنی ناسنامە و نەتەوەیی بوونی خۆیان لە بواری دەسەڵاتی ماڵی و پشتبەستن بە هێزە گەورەکانی دنیا و فشار بۆهێنانیان (ئەمریکا, بەریتانیا, فەرەنسا و سۆڤێت) بکەنە مەیدانی سەرەکی بۆ دەنگدان بە خۆ سەلماندن و هێزپەیداکردنی نەتەوایەتی، سەرەنجام بەهۆی هەردوو پایەی دەسەڵاتی ماڵی و پشتیوانی نێودەوڵەتی توانیان لە کۆنگرەکانی زایۆنیزمدا (لە ساڵی ١٨٩٦ بەدواوە) و لەبەر ڕۆشنایی ناسیونالیزمی ئەورووپی دووبارە نەتەوەیی بوون و ناسنامەی خۆیان پەیدابکەنەوە, سەرەڕای لەدەستچوونی خاکی هاوبەش و نیشتمان, ئابووری هاوباش, فەرهەنگ و تەنانەت زمان و دینی هاوبەشیش , گەڕانەوە بۆ خاکی باپیران و دەستیان کرد بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی و دینی.. ئەوەی وا دەکات کە ڕابەران و هۆشیارانی نەتەوە هەوڵ بدەن و بزانن چۆن و لەکام ڕێگا و بەهۆی

کام پێکهێنەر و ئاست وئاسۆوە دەتوانن هێز و نەتەوەیی بوونی خۆیان پیادە و بەهێز بکەن, زانستکاران و بیریارانی بواری نەتەوایەتی ناویان ناوە هۆشیاری دەربارەی خۆ, کە هۆیەکی زۆر کاریگەرە بۆ بنیاتنانی ناسنامە و نەتەوەیی بوون.

**ئاستی پێنجەم** کە زۆر گرنگ و کاریگەرە بۆ باشترناسین و تێگەیشتنی نەتەوە و ناسنامە, ئاستی دەسەلات یان دەولەتە, ئەگەر چی نەتەوە سەرچاوەیە بۆ پەیداکردنی دەسەلات و دەولەت, هەر بەو رادەیەش دەولەت دیسان و سەرلەنوێ نەتەوە دروستدەکاتەوە (٨) . رەخنەی نوێ و پۆست مۆدێرنیزم لە هاوکێشە بەناوبانگەکەی (ئێرنست گیلەر) کە دەلێت: ((نەتەوە لەلایەن دەولەت یان نەتەوایەتییەوە پێکدەهێنرێت, نەك بەپێچەوانەوە)) , بەو شێوەیەی خوارەوە : باشە دەولەت یان نەتەوایەتی لە کوێ پەیدا دەبێت و سەرچاوەکەی کامەیە, ئایا لە ولاتێکی دیکە و شوێنێکی دیکەوە پەیدای دەکات یان لەناو خودی نەتەوە و بە پشتیوانی رەهەند و ئاست و پێکهێنەرەکانەوە, دەولەت یان دەسەلات پێکدێت. کەواتە سەرچاوەی دەولەت و دەسەلات خودی نەتەوەیە، بەلام دەسەلات و دەولەت ئاست و رەهەندێکی گرنگ و کاریگەر دەبێت لە ئایندەی نەتەوەدا و سەرلەنوێ ئەو نەتەوە دروستدەکاتەوە. بیروباوەڕی مۆدێرنیزم پێی وایە کە نەتەوە یان دەولەتی نەتەوە بکەرێکی کۆنە لەسەردەمێکی مۆدێرندا, چونکە تەواوی پێکهێنەرەکانی ئەو بکەرە هی کۆن و پێش سەردەمی مۆدێرنن و بە پشتیوانی ئەو ئاست و رەهەندانەی پێش مۆدێرنیزم ئەم بکەرە پێدەخاتە سەردەمی مۆدێرنەوە. هەرچۆنێك بێت ئاست و پێکهێنەری دەسەلات (دەولەت) ئاستێکی گرنگ و کاریگەری نەتەوەیە و بەبڕوای من هاوکێشەی گونجاو بۆ ئەم ئاستە بەم جۆرەی لێدێت : (نەتەوە دەولەت "دەسەلات").

ئەم لێکدانەوەیەش یەکێکە لە هاوکێشە گرنگەکانی پۆست مۆدێرنیزم دەربارەی بکەرێتی (Subjectivity) و بەرکارێتی یان بابەتی بوون (Objectivity) و بەم جۆرە (SubObj) , بکەر و بەرکار جێگاکانیان دەگۆڕن و هەردووکیان هەم بکەرن و هەم بەرکارن و لەسەر یەك کاریگەرن (٩).

**ئاست و ئاسۆی شەشەم** بۆ شارەزابوون دەربارەی ناسنامە و نەتەوەکان ئەوەیە کە زۆربەی کۆمەڵەکان لە حاڵەتی نەژادیدا ناناسرێن و کەم کۆمەڵ هەیە (مەگەر کۆمەڵە داخراوەکان و ناوچە دوورە دەست و گۆشەگیرەکان) لەحاڵەتی نەژادیدا مابنەوە. سەردەمێکی زۆر و لەژێر کاریگەری بیرکردنەوەی قوتابخانەی ئەڵمانی تێزی (دەوڵەت – نەتەوە) کرابۆوە بناغەی رەوایی بۆ دەسەڵاتی سیاسی و هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر کەم لە وڵاتانی گرتەوە بەڵام لەبەر دوو هۆ بووبوونە مۆدێلێك بۆ رەواییدان بەدەسەڵاتی دەوڵەتەکان , یەکەم ئەوەبوو کە ئیمپریالیزمی ئەوروپی (فەرەنسی و بەریتانی) دەیویست وڵاتانی ژێردەستی خۆی وەکو (عێراق, ئێران, سوریا, ئەردەن, فەلەستین, میسر, ئەفغانستان, پاکستان... هتد), وەکو دەوڵەتی نەتەوە بناسێنێت, هەرچەندە هیچیان نەگەیشتنە ئاستی نەتەوەیی بوون سەبارەت بەوەی فرەنەژاد بوون، لەهەمان کاتدا هیچ مافێکی مەدەنی و شارستانیش کاری پێنەدەکرا بۆ دروستبوونی دەوڵەتی هاوڵاتی (کە مەبەستی ئێمە لە ئاستی شەشەمدا). دووەم هۆ ئەوە بوو, کە دەسەڵاتداران و ناسیونالیستەکانی جیهانی سێهەم (بە تایبەتی ناسیونالیزمی فارسی, تورکی, عەرەبی, ..هتد) لەژێر کاریگەری تێزی دەوڵەتی نەتەوەیی و نەژادیدا لە هەوڵی ئەوەدابوون تیۆرێك یان چەند تیۆرێك بۆ ناسیونالیزمی خۆیان پەیدابکەن و ئەم تیۆرە بووە پەتایەك و بەشی هەرە زۆری جیهانی سێهەمی گرتەوە. بەڵام ئەم تێز و تیۆرییە زۆر زوو شکستی هێنا، سەرەڕای ئەنجامی کارەساتبار و توندوتیژی لە مەیدان کرایە دەرەوە و لەلایەن تیۆر و چارەسەری ئەمریکی و فەرەنسی بۆ دەوڵەت هاوڵاتی بوون لەسەر بناغەی رەوایی مافەکان و بە پێی (راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتی)پاراستنی ناسنامەجیاوازەکان، دەوڵەتی هاوچەرخ پێکهات و ئاسۆیەکی نوێ بۆ چارەسەری کێشەی ناسنامە و نەتەوایەتی هاتە مەیدان و چارەسەرێکی باشتر, گونجاوتر و مرۆڤانەتر بۆ کێشەی ناسنامە لە ئاسۆدا دەرکەوت. تێزی دەوڵەتی نەتەوە, کە رەوایی دەدا بە ڕەوشی نەتەوەیی و باڵادەستکردنی فەرهەنگ و دەسەڵاتی نەتەوەی سەردەست (چونکە کەمترین دەوڵەتی دنیا جووتە لەگەڵ حاڵەتی نەژادی و فەرهەنگیدا)

و زۆربەی وڵاتەکان فرەنەتەوەن, گەلێك کارەسات و توندوتیژی و جەنگی نایەوە و گەلێك نەتەوەی وەکو کورد, ئەرمەن, ئەمازیگ, تبت و ... هتد بەو هۆیەوە کەوتنە ژێر باری چەوسانەوەی نەتەوایەتی و فەرهەنگییەوە ..

تیۆر و تێزی هاوڵاتی دەتوانێت ڕێگایەکی چاکتر و گونجاوتر بێت بۆ چارەسەری کێشەی ناسنامە و مافەکان و ڕەواییەکی فراوانتریش بۆ دەسەڵات پێکدەهێنێت، بەم جۆرە ڕەوایی ئەم سەردەمە لە بیری پۆست مۆدێرنیزمدا ڕەوایی هاوڵاتی بوون و مافەکانی مرۆڤە و لە ڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤدا مافی فەرهەنگی و نەتەوەیی هەموانیش بە سروشتی و پیرۆز و بەرهەق ناسراوە، ئەگەرچی ئەو فەرهەنگ و نەتەوانە بچوکیش بن, مەرج نییە ڕێزگرتن لە ڕەوشی فەرهەنگی و نەتەوەیی هەر بە دەوڵەتی نەتەوە بێتە دی, پرۆژەی هاوڵاتی و مافەکان دەتوانێت باشتر و گونجاوتر کێشەی ناسنامە و نەتەوەکان چارەسەر بکات. هەرچەندە تێزی دەوڵەتی نەتەوە, تێزێکی ئایدیال (مثالی) و سەیردێتە بەرچاو , بەڵام ئەگەری جێبەجێ بوونی لە زۆربەی وڵاتانی دنیادا نایەتە دی و بەناوی دەوڵەتی نەتەوەشەوە گەلێك چەوسانەوە و کارەسات لە دژی زۆربەی نەتەوەکانی دنیا پیادەکراوە. پۆست مۆدێرنیزم, بەدوای چارەسەری مومکین و شایانی جێبەجێکردنەوەیە و پێی وایە کە پرۆژە و تێزی ئایدیال نایەتەدی و ئەگەری هاتنەدی زۆر کەمە و بەوناوەشەوە زۆر زوڵم و چەوسانەوە پەیدابووە, بەڵام دەکرێت پرۆژەی مومکین و نزیك لەبەرژەوەندی زۆرایەتی بێتە دی. تێزی هاوڵاتی, تیۆرێکی نزیکە لەبەرژەوەندی زۆرایەتی و بەدیهاتن و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و ناسنامەکان. خاڵێکی دیکەی گرنگی پۆست مۆدێرنیزم ئەوەیە کە دەوڵەتی نەتەوە, بەڕاستییەك (حەقیقەت) نازانێت ، بەڵکو هەوڵێکە لە هەوڵەکان. تیۆری مۆدێرن و دەوڵەتی نەتەوە, وەکو ڕاستییەك خۆی پێشان داوە, پۆست مۆدێرنێتە پێی وایە کە ڕاستی شتێکی سروشتی نییە، بەڵکو ڕاستی یان واقع دروستدەکات و زۆربەی جار دەسەپێت. بۆ ڕزگار بوون لەم کێشەیە, چارەسەری گونجاو و فرە بۆ هەر کێشەیەك یان چەند کێشەیەك دەکرێت جۆرێك ڕێگاچارە پەیدابکەین. وێڵ بوون بەدوای چارەسەری

گشتی و ئیدەئاڵ کارێکە هەرگیز ناکرێت و تەنها بانگەوازێکی بەتاڵە و لە رێگای زۆر و سەپاندنەوە نەبێت نابێتە گشتی و پیادەناکرێت .

فەرهەنگ, رەوایی و ناسنامەی سەردەمی پۆست مۆدێرنیزم لە رێگای رەوایی و پیرۆزی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتی بوون وپاراستنی ناسنامە جیاوازەکان پەیدادەبێت، هەر دەوڵەت و دەسەڵاتێك ئەگەر مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتی نەکاتە بناغە و فەرهەنگی رەوایی بوونی, لەم سەردەمەدا گومانی لێدەکرێت و ناتوانێت دیموکراسی بەرێوەبەرێت..

**ئاست و بۆچوونی حەوتەم و کۆتایی** لەسەر پرسی ناسنامە و نەتەوەکان, دەچێتە ئاستی جیهانگیری, لەسەردەمی جیهانگیریدا دوو هەڵوێستی دژ بەیەك دەبینین, هەندێك پێیان وایە جیهانگیری نکۆڵی لە بوونی ناسنامە و نەتەوەکان دەکات و لایەنەکەی دیکەش لە هەڵوێستی نەتەوەیی و نەژادیانەوە لە دژی جیهانگیری دەجەنگن. جان جاك رۆسۆی فەیلەسوف و بیرمەند, لە زۆر کۆنەوە پێی وایە کە مرۆڤ دوو رەهەندی جیهانی و نیشتمانی هەیە و هیچ کامیان دژی ئەوی دیکەیان نییە (١٠). لەم سەردەمەشدا جاك درێدا پێی وایە کە پێویستمان بە جیهانیبوون و نێونەتەوەییەك هەیە کە بەبێ ئایدیۆلۆژیا و بەرژەوەندی بەرتەسك, ناسنامە و نەتەوەکان و بەرژەوەندییەکان کۆبکاتەوە و جیهانگیری بەوشێوەیەی دریدا دەبێتە ئامانجێك و ناسنامە و نەتەوەکانیش دەتوانن لەوێدا زیاتر بەهرەمەندبن(١١).

تا ئێستا توانیمان بە پێی لێکۆڵینەوە نزیکەکان لە میتۆد و بیروباوەڕی پۆست مۆدێرنیزم, مێژوو, گەشەکردن و ئاستەکانی نەتەوایەتی و ناسنامەکان باسبکەین, بۆ ئەوەی بتوانین رۆشنتر باسەکەمان فۆرمۆلە بکەین پێویستمان دەبێت لەچەند خاڵێکدا کورتەی میتۆد و روانگەکان باسبکەین، ئەوجا باشتر تێدەگەین کە بیری پۆست مۆدێرنیزم بە چ شێوەیەك لە دیاردەی ناسنامە و نەتەوەکان تێدەگات"

١) پۆست مۆدێرنیزم بە پێچەوانەی مۆدێرنێتی, پێی وانییە لە زانستی کۆمەڵایەتیدا بتوانین راست تەواو بەدەست بهێنین, بەڵکو هەوڵەکان و بیرەکان و

روانەگەکان دەتوانن لە راستی نزیکمان بکاتەوە . هەر لەم روانگەوە, وا دەڕوانرێت کە ئەو بیر و روانگانەی کە تا ئێستا لەسەر ناسنامە و نەتەوەکان دواون نەیانتوانیوە راستی رەها بەدەستبهێنن, بەو پێیەی کە گەیشتوونەتە هەندێك راستی بەلآم هەندێك هەڵە و کەم و کورپیشیان هەیە.

٢) نزیکبوونەوە لەراستی, پێویستی بە بیر و روانگەی جیاواز هەیە, واتە دەبێت بڕوامان وابێت لە ئەنجامی گفتوگۆ و کاریگەری نێوان روانگە و بەرژەوەندییەکان دەتوانین لە راستینەی ناسنامە و نەتەوەکان نزیك ببینەوە. بیر و روانگەی مارکسیزم, کە ئابووری بە پێکهێنەری گرنگ و کاریگەر دادەنێت بۆ نەتەوە راستە, بەلآم ئەوەی ناراستە ئەوەیە کە مارکسیزم پێی وایە بەبێ ئابووری هاوبەش , نەتەوەکان حاڵەتی نەتەوەییان لەدەستدەدەن. واتە روانگەی نزیك لە راستی ئەوەیە کە ئابووری پایە و پێکهێنەری گرنگی نەتەوەیە (هەوڵدان بۆ نزیك بوونەوە لە راستی), بەلآم هەموو رەوشەکە بەهۆی ئەو پایەوە پێکنایەت و نەتەوەکان لە پێکهێنەرەکانی دیکەدا دەتوانن کاریگەری و رەوشی نەتەوەییان پیادەبکەن. روانگەی نەتەوەیی یان (نەژادی), یان ئەوەی پێی دەڵێن قوتابخانەی ئەڵمانی و ئیتاڵی بۆ نەتەوە پێی وایە حاڵەتی زمانی یان نەژادی دیاریکەری نەتەوەیە, ئەگەر چی ئەم رستەیە هەندێك راستی تێدایە, بەلآم راستی تەواو تیایدا بەدیناکرێت, چونکە هەندێك نەتەوە بەزمانی نەژادی و فەرهەنگی خۆشیان قسان ناکەن، بەلآم نەتەوەیی بوون یان ناسنامەی خۆشیان پاراستووە. قوتابخانەی ئەمریکی بۆ چارەسەری کێشەی ناسنامە و نەتەوەکان لە رێگای رەوشتی (هاولآتی)یەوە, دەتوانێت رێگا و چارەسەرێکی گونجاو بێت, نەك راستی تەواو لە رێگای بەهرەمەندبوونی ناسنامەکان. بەم جۆرە تێدەگەین کە هەموو باوەڕەکان بۆ چارەسەری ناسنامە و نەتەوەیی بوون, دەتوانن بە دەوری خۆیان بەشداریبکەن، بەلآم پەیڤین و کاریگەری نێوان ئەو باوەڕ و قوتابخانانە دەتوانێت زیاتر لە راستی نزیکمان بکاتەوە.

٣) دەبێت لە چەند ئاست و ئاسۆدا تێ بگەین و لە دیاردەکان لێیان بکۆڵینەوە و ئاستەکانی بابەتی , خودی و کاریگەرییان لەسەر یەکتر لەبەرچاو بگرین بەو شێوەیە

دەتوانین باشتر لە راستینەی دیاردەکان تێبگەین و مێژووش یەکێکە لەو رەهەندە گرنگ و کاریگەرەی کە ئەم رەوشەی تیادێتە دی.

٤) سەردەمی هاولاتی بوون و جیهانگیری نکۆڵی ناکات لە ناسنامە و نەتـەوەکان, بەڵکو دەتوانێت رەوش و چوارچێوەیەکی فـراوانتر بێـت لـە نەتەوایـەتی. نەتەوایـەتیش بەدەوری خۆی دەتوانێت پەیوەندی و کاریگەری خۆی لەسەر ئەو دوو دیاردە فـراوانترە (هاولاتی و جیهانگیری) هەبێت, ئێمە دەتوانین بـەم نەخشـە ئـەو سـێ دیاردەیـە باشـتر رۆشن بکەینەوە.

٥) لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هێشتا رێگا و ئاسۆ کراوەیە بۆ چارەسەر و ئـاڵوگۆری کێشەی ناسنامە و نەتەوە و وڵاتەکان و ئایندە دەتوانێت وەڵامـی بداتـەوە کـە ئێمـە تـا ئێستا لەبیر و خەیاڵماندا نییە.

پاش ئەوەی توانیمان, هەندێك زانیاری دەربارەی ناسنامە و نەتەوە و وڵاتـەکان لـە روانگەی پۆست مۆدێرنیزمەوە شـارەزابین چـاکتر وایـە, وردتـر و رۆشـنتر سـەبارەت بـە پۆست مۆدێرنیزم و سەردەمی پۆست مۆدێرن لە لێکۆڵینەوە بەردەوام بین و بتوانین ئەو ئاسۆیە رووناکتر بکەین.

### پۆست مۆدێرنیزم, پۆست مۆدێرن, پۆست مۆدێرنێتی

ئـەم سـێ زاراوەیـە لەسەرچـاوەکاندا بـەکارهاتووە, یەکـەمیان, پۆسـت مـۆدێرنیزم مەبەست لە بـیر و بـاوەڕ و روانگەکەیـەتی و پۆسـت مـۆدێرن ئاوەڵنـاو یـان (سـیفەتە) و پۆست مۆدێرنێتی مەبست لە ڕەوش و هەلومەرجێکە کە لـە دوای مۆدێرنێتییـەوە پەیـدا

بووە. هەوڵدەدەین سیفاتە ئاشکرا و کاریگەرەکانی پۆست مۆدێرنیزم یەك لە دوای یەك بناسین.

**یەکەم:** پێناسەیەکی گشتی بۆ پۆست مۆدێرنیزم لە ئارادانییە, بەڵکو خواست و هیوایەکە بۆ پرسیار, پرسیارێك کە لە نێو هەر وەڵامێکی گونجاودا پرسیارێکی دیکە بەرهەم دێت. ئەمە وتەی روناکبیر و فەیلەسوفی فەرەنسی (جیل دیلۆز)ە (١٢). ئەم رستەیە دوو حاڵەتی تێدا پەیدا دەبێت :

١/ ئەوەیە کە لێکدانەوەیەك یان پێناسەیەکی گشتی بۆ پۆست مۆدێرنیزم نییە, هەروەکو چۆن پێناسەیەکی گشتی بۆ نەتەوایەتی, دیموکراسی, و سۆسیالیزمیش لە ئارادانییە و چەند بیر و باوەڕ و روانگە لەسەر ئەو دیاردانە هەوەڵ و بیریان کردۆتەوە و هەریەکەیان لە روانگە و بەرژەوەندی خۆیان ئەو دیاردانەیان پێناسە کردووە. ئێمە باسی قوتابخانەی ئەڵمانی و فیختەمان کرد بۆ لێکدانەوەی نەتەوەکان, بە تەنها حاڵەتی نەژادی و فەرهەنگی کە لە زماندا بەیانکراوە, ئەگەر بێت و ئێمە نەتەوایەتی بۆ نموونە (هی کورد) لەو پێناس و تیۆرە گشتیەدا بەیان بکەین, دەبینین زۆر غەدرمان لە کورد کردووە, چونکە نەتەوایەتی کورد سەرەڕای پاراستنی زمان و فەرهەنگ تەماشادەکەین خاکی پاراستووە, کوردبوون لە ئاستەکانی بابەتی و خودیدا ماوەتەوە، بگرە زۆر جاریش گەشەی کردووە, لە مێژوودا ماوەتەوە و لە ئاستەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریشدا توانیویەتی نەتەوەیی بوون یان ناسنامەی خۆی بپارێزێت, بۆیە ئێستا تێدەگەین لێکدانەوەی پۆست مۆدێرنیزم لێکدانەوەیەکی تاك تیۆری یان تاك میتۆدی نییە و تێگەیشتنە لە ژیان و فرەبوونی ئاست و ئاسۆکانی بۆیەش تیۆرێك یان پێناسەیەکی گشتی یان تاك پەسەند ناکات, بەڵکو چەند ئاست و چەند بیر و روانگە و چەند ئاراستە پەسەند دەکات.

٢/ خواستێکە بۆ پرسیار ئەمەش یەکێکە لە پرسە گرنگەکانی پۆست مۆدێرنیزم. ئەگەر تەماشای مارکسیزم بکەین, مارکس پێمان دەڵێت: ((مارکسیزم زانستی تەواوە و لەچەند سەرچاوەی مارکس و مارکسیزمدا ئەمە دووبارە کراوەتەوە)). باشە با پرسیار

بکەین و بزانین زانستی تەواو یان Pureپاك و بێگەرد هەیە؟ تا ئێستا چەند جارێك بیرو باوەڕی زانستی بە درۆ خراوەتەوە و زانستی دیکە جێگای ئەو زانستە کۆنە (بەناو راستەیان) گرتووە. ئەگەر زانستی وەکو (ماتماتیك, فیزیك, کیمیا و بایۆلۆجی) شایەنی راست کردنەوە بێت, ئەی بۆچی هەقمان نییە کە زانستی کۆمەلایەتی چاکتر بکەین و بە پێی پرسیارە نوێکانی ژیان و سەردەم و بەرژەوەندی مرۆڤایەتی ئەو بیر و روانگانە بگۆڕین و پرسیارەکان دیدگا و بیرمان بەرەو چاکتر و رۆشنتر بەرین.

سەرەنجام پۆست مۆدێرنیزم و پرسیارەکانی پێمان دەڵێت: بوون کۆی تاکەکانە, و لێکدانەوەی تاك ئەندێشی یان تاك ناوەند, یان لێکدانەوەی دیاریکراو و گشتی کراو و بێپرسیار و بێگومان لە راستیدا بوونی نییە, لە هەموو ئاستەکان, ئاسۆکان, و بیرەکاندا پرسیار دوای پرسیار پەیدا دەبێت و هەقی خۆیەتی کە لەوەلامی پرسیارەکانیش گومان بکەین. یەکێك لە قسە سەرنج راکێشەکانی فریدریك نیچە ئەوەیە کە, جیهانی پیاو جیهانی بەناو (راستییە)لە کاتێکدا جیهانی ئافرەتان, جیهانی گومانە(١٣). بۆچی دەڵێت جیهانی پیاو حەقیقەتە, چونکە جیهانێکی بە دەسەلات و سەپێنراوە و سەرەنجام بەراستی ناسراوە. بەلام ئافرەتان هەقیان هەیە گومان لەو بەناو راستییە بکەن و بڵێن ئەی ئێمە لەم جیهانە سەپێندراوەدا لەکوێداین. سەرەرای گومان و جیاوازی ئافرەتان, بەلام هەمیشە هەوڵ بۆ دەسەلات و خۆسەلماندن لەلایەن ژنانەوە هەیە و لەبەر ئەوەی کە مرۆڤایەتی ئێستا, میتافیزیکی ئێستا و نەتوانینی ئێستا نەیتوانیوە ئافرەتانیش وەکو پیاو بەدەسەلات بکات, بۆیە تەماشا دەکەیت کە گومان لەو وەلام و راستیانەی پیاو, هەر بەردەوامە. هێندەی لە لاوازەکان, ستەم لێکراوەکان, پەراوێزکراوان و ماری جنەڵەکانەوە نزیك بکەوینەوە, هێندە لە بالا دەستەکان و بەرترەکان نزیك نین, چونکە بەردەوام لاوازەکان و ستەم لێکراوەکان لە دنیای گومانا دەژین و ئەو دنیایەی کە ستەمکاران کردوویانە بە هەقیقەت. بۆیە تەماشا دەکەین, کە: راستی یان هەقیقەت یان واقیع هەمیشە سەپێندراوە, ئێمە دەبێ لە دنیای گوماندا بەردەوام پرسیار بکەین و پرسیار بۆ وەلامەو وەلامیش بۆ پرسیاری دیکەیە, هەموو

ئەمانەش لەبەر ئەوەیە کە هەقی خۆمانە گومان لەو راستی و واقیعە سەپێندراوانە بکەین(١٤).

**دووەم:** ئاستێکی تر لە ئاستەکانی پۆست مۆدێرنیزم، بۆچوونی فەلسەفی پێشمەرجی رەخنەگرتنە لە عەقڵ باوەڕی و هیومانیزمی رۆشنگەری مۆدێرنە. یەکێك لە کارە بەرچاو و دیارەکانی مۆدێرن ئەوەیە عەقڵانییەتی کردۆتە دروشمی خۆی و لەم کاروانەشداگەلێك دەسکەوتی گرنگی بەدەستهێناوە، بەلام بەبێ هەڵە ناساندنی عەقڵانییەت یان ئەوەی پێیان وایە کە عەقڵەکەی خۆی پڕپڕە لە عەقڵانییەت و رێبازەکەی خۆیان دەروەستی هەموو شتێك دێت و چارەسەری هەموو کێشەکانی تیاپەیدادەبێت. هەڵوێستی پۆست مۆدێرن بەرامبەر بەم شیکردنەوەیە، بەم جۆرەیە" بەدەستهێنانی عەقڵ و عەقڵانییەت یەکێکە لە دەسکەوتە گرنگ و کاریگەرەکانی مرۆڤایەتی، بەلام خودی ئەم دەسکەوتەش بێ عەیب و بێ هەڵە نییە و ئەمیش وەکو هەر دەسکەوتێکی دیکە شایەنی رەخنەلێگرتنە.

سەبارەت بە پەیوەندی نێوان عەقڵانییەت و هیومانیزم و نەتەوایەتی و جەختی مۆدێرنیزم لەسەر ئەوەی کە نەتەوە و رەوایی نەتەوەیی و بەڕێوەبردنی دەوڵەت، وەکو کارێکی عەقڵانی و بێ کەموکوڕی دەناسێنێت، شایەنی هەڵەیەو بۆ ئەوە دەبێت رەخنە لێبگیرێت. هەڵوێستی پۆست مۆدێرن، وێڕای ئەوەی کە نەتەوە و ناسنامەکان دەخوێنێتەوە و بەرەسمی دەیان ناسێت، بەلام لە هەمان کاتدا رەخنەیخۆیشی ناشارێتەوە و پێیان وایە کە ئەم چوارچێوە و رەواییە نەتەوەییەش بێ هەڵە و کەموکوڕی نییە و هەوڵدان بۆ شاردنەوەی کەموکوڕییەکان، کە یەکێکە لە کارەکانی مۆدێرن و نەتەوایەتی، شایانی پەسەند کردن نییە و پۆست مۆدێرنیزم بەردەوام لەم کارانە رەخنە دەگرێت و پرسیار و گومانی خۆی ئاراستەیان دەکات و لە هەوڵی دۆزینەوەی چارەی نوێ و چوارچێوەی نوێ و گونجاوتردایە و پێیوایە کە ئەم ناسنامە و رەوایی و فەرهەنگە بۆ مرۆڤی ئەم سەردەمە، لاوازن و مرۆڤ دەتوانێت ئاسۆیەکی نوێتر بۆ ناسنامەو فەرهەنگی خۆی پەیدا بکات، ئەگەر چی ئەو رێگا و ناسنامە نوێیەش،

حاڵەتی پێشو ڕەتناکاتەوە, ئەوەندە هەیە کە ئاسنامەی دوایی فراوانتر و گەشەکردوو تره.

هەوڵەکان و ئاسۆکانی پۆست مۆدێرنیزم سەرەڕای پێشڕەوی و گەشە و فراوانی, بەڵام هەر پێی وایە کە هێشتا کەلێنێك بۆ نەزانین و نەتوانین هەیە, کە ئەم کەلێنە نابێتە مایەی گرفت, بەڵکو دەبێتە ئاسۆیەکی نوێ بۆ کرانەوە و گەشەکردن(١٥).

سێیەم: ئاسۆ و ئاستێکی گرنگی پۆست مۆدێرنیزم بریتییە لە", بوونی کۆی تاکەکان", ئەم وتە گرنگەی پارامێندس, فەیلەسووفی یۆنانی پێش سوکرات و ئەفلاتون, رستەیەکی گونجاو و نزیك لە راستییە, بۆ وەسف کردنی بوون و مەعریفەی مرۆڤایەتی و هەڵوێستی پۆست مۆدێرن بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

دەبێ لایەنگری لەوە بکەین کە (ئەفلاتون) توانیویەتی لەدژ و بەرامبەری ئەفسانەکان دەسکەوتی لۆگۆس یان (عەقڵ) بەدەستبهێنێت, بەڵام ئەوەی کە لۆگۆس دەکاتە ناوەند بۆ بوون یان بۆ فەلسەفە پەسەندنەکەین و لۆگۆس یەکێکە لە ئاستەکانی بوون و توانین، زانین و هەروەکو (فالۆس)یش واتە (جیهانی هەستەوەری) دەتوانێت ئاستێك بێت لەو ئاستانە. واتە بەدەستهێنان و ناسینی لۆگۆس دەسکەوتێکی گرنگە, بەڵام لۆگۆس نەکەین بە گژ فالۆسدا, بەڵکو بتوانین ئاسۆ و ئاستێکی فراوانتر و گەشەکردووتر بێت لەو, بەبێ ئەوەی کە دژی بێت و رەتی بکاتەوە, ئێمە بە یارمەتی ئەفسانە, داب و نەریت, فالۆس و لۆگۆس دەتوانین زیاتر لە راستی نزیك ببینەوە, ئەگەر چی لەهەریەك لەوانە کەلێنی نەزانین و نەتوانین هەیە, کە بەهۆی ئەو کەلێنەوە زیاتر لەگەشەو فراوانی و راستی نزیکدەبینەوە.

دوای یۆنان و لۆگۆسی ئەفلاتون, رێبازی رۆشنگەری و بە وتە بەناوبانگەکەی دێکارت "من بیر دەکەمەوە, کەواتە هەم" دەستپێدەکات, بیرکردنەوە, یەکێکە لە دەسکەوتە گرنگ و مەزنەکانی دێکارت و رۆشنگەری و مرۆڤایەتی, بەڵام هەموو (بوون) لە بیرکردنەوەدا پەیدانابێت. بیرکردنەوە دەتوانێت لە بێ بیری (ئەگەر هەبێت!) و داستان و ئەفسانە و دواکەوتوویی رزگارمان بکات, بەڵام ئەم بیرکردنەوە و رۆشنگەری و

گەشەیە کە ئاسۆ و بوونێکی نوێیە, ناتوانێت ببێت بە بێ ئەوەی درێژە و فراوانی بوونەکەی پێش خۆی بێت. بیرکردنەوە ئاست و ئاسۆیەکی نوێیە لە دوای ترادیسیۆن و جەزمگەرایی و تەسککەرایی, بەڵام هێشتا هەموو بوون لەوەدا کۆنابێتەوە, ئەوەی کە نزیکە لە راستییەوە ئەوەیە کە بیرکردنەوە بەشێکە لەبوون, بیرکردنەوە یەکێکە یان ئاستێکە لە ئاستەکانی بوون و ژیان.

بیروباوەڕی گومانخوازی فەیلەسووفی ئەڵمانی بەناوبانگ (ئیمانوئیل کانت) کە کۆڵەکەی سەرەکی, گومانە یان (دوالیزمە) وا دەکات کە گومانخواز و گومانپەرست بێت. گومان و پرسیار, ئاسۆ و ئاستێکی گرنگ و کاریگەری بوون, زانین و توانین, بەڵام نابێت بیانکەینە ناوەند و کۆڵەکەی زانین و بوون, بەڵکو دەبێت وەکو توخمێك یان ئاست و ئاسۆیەك بیانناسین, کە بێگومان گرنگ و کاریگەرن, کورتەی قسە ئەوەیە ناسین و ناساندنی گومان ئاسۆیەکی نوێ دەکاتەوە بۆ زانین و بوون, بەڵام نە تاکە ئاستە و نە سەرکردە و رابەری ئاستەکانی دیکەشەو هەر بەپێی مەنتقی (بوون کۆی تاکەکانە), دەبێت دەور و گرنگی ببینن. بەم جۆرە دەگەینە ئەو رادەیەی کە هەرچەندە دەسکەوتەکە گرنگ بێت, بەڵام نابێت وابڕوانین کە ئەوانی دیکە نکۆڵی دەکەن و سەرکردە و رابەری ئەوانی دیکەن. لێرەدا دەگەینە ئەو ئاسۆ نوێیەی کە هەموو ئاستەکانی ئەفسانە, دین, داب و نەریت, لۆگۆس, فالۆس, بیرکردنەوەی دیکارت و گومانەکەی کانت پێکەوە دەتوانن بوون, زانین و توانین پەیدابکەن و لەکۆی هەمووان بەگەشە و فراوانی نوێ ئاشنادەبین.

بیروباوەڕی پۆزەتیفیزم, لەلای هیگڵ و مارکس بەوجۆریە کە هیگڵ دەڵێت: (عەقڵی خودئاگا یان راناوی خۆهوشیار لە کاروانی مرۆڤایەتیدا خۆی ئەدۆزێتەوە و لە دەوڵەتی نەتەوەیی و جەرمانیدا بە پلەی رەهای خۆی دەگات). لای مارکس, ئاگایی چینی کرێکار یان هۆشیاری کرێکاری پێشڕەو و سەنعەتی کە بەپلەی رێکخراوی و حیزبی خۆی دەگات و لە رێگەی حکوومەتی کرێکاری و سۆسیالیستیوەوە بە کۆمۆنیزمێکی تەواو یەکسان و بێ دەرد و بەلا دەگات. ئەم کاروانە پۆەتیفستانە هەردووکیان, کە

کاردانەوەیەکن لەبەرامبەر گومانخوازی و گومانپەرستی کانت، دەسکەوتێکی گرنگی بەدەستهێنا کە عەقڵی خود ئاگاو تێکۆشەرە، بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەم عەقڵە هۆشیار و خەباتکارە بێ هەڵە و کەموکوڕی نییە، ئاستەکانی دیکە دەتوانن یارمەتیدەر بن بۆ چارەسەری هەڵە و کەموکوڕییەکان، کە بێگومان یەکێك لەو ئاستانە، ئاستی گومانەکەی کانتە، واتە ئەوەی کە خۆیان رەتیان دەکردەوە. ئەگەر تەماشابکەین کاروانەکە بەم شێوەیە دەرئەکەوێت:

لەلای ئەفلاتون لۆگۆس دەکرێت بەگژی فالۆس کە هێمای ئەفسانە، هەست و دابونەریتەکانە. لەلای دێکارت: من بیردەکەمەوە کەواتە هەم، بیرکردنەوە دەکرێتە بەردی بناغەی بوون. لەلای کانت گومان دەکرێت بەگژ بیرکردنەوە و بووندا و گومانپەرستی دەکرێتە رێباز و پیرۆز دەکرێت. لەلای هیگڵ و مارکس پۆزەتیفیزم لەدژی گومانخوازییەکەی کانت دەبێتە رێبازی پەیداکردنی بوون، زانین و توانین و قوتابخانەی فرانکفۆرتیش بەهۆی رێبازی رەخنەیی و نێگەتیفیزم دەستدەکەن بە رەخنەگرتنی پۆزەتیفیزمی هیگڵ و مارکس و دەگەنە ئەو رادەیەی کە گشتی بوون نییە و ئەوەی کە رەسەنە تەنها ئازادی فەردی و ناوەکی مرۆڤە و فەلسەفەی رەخنەیی دەکەنە ناوەند و سەرکردەی ئەوانی دیکە.

دەرکەوتنی قوتابخانەو فەلسەفەکانی بونیادگەرایی، فۆرمالیستی رووسی، نیشانەگەرایی یان نیشانەناسی و دیاردەناسی و دوایی دەرکەوتنی هەموو پۆستەکانی بونیادگەرایی، پیشەسازی، مارکسیزم، و دیاردەناسی و ...هتد. دەرکەوتنی هەریەك لەم فەلسەفە و رێبازانە بۆ خۆی دەسکەوتێکی گرنگی بوون، زانین و توانینە و هەریەکێکیان ئاست و ئاسۆیەکی نوێتر و فراوانتری بۆ گەشە و رزگاری و ئازادی مرۆڤایەتی پەیداکردووە. بەڵام ئەوەی جێگای رەخنەیە و بۆ پەسەندکردن نابێت ئەوەیە، کە هەریەك لەمانە ئەوەی پێش خۆی رەد دەکاتەوە و نووکی رەخنە و تەنانەت دوژمنایەتیشی کردۆتە رێبازەکەی پێش خۆی، کە زۆربەی جار مامۆستایانی پێشوو پەروەردەکاری ئەوانەی دوایی بوون.

هەڵوێستی دروست, کراوە و فراوانی پۆست مۆدێرنیزم بە پێی بنەمای (بوون کۆی تاکەکانە), بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

بوون, زانین و توانینی مرۆڤایەتی لە رێگای ئاست و ئاسۆ و بیرەکانی" ئەفسانە, دابونەریت, هەستەکان, بونیاد, بیرکردنەوە, عەقڵ, زانست, دیاردەکان, نیشانەکان, فۆرمالیزم, گومان, پۆزەتیفیزم, فەلسەفەی رەخنەیی(نێگەتیفیزم) و شتی دیکەش پەیدا دەبێت و هەموو ئەمانەش بەشێوەی ئاسۆیی نەک ستوونی بەشداردەبن لە بنیاتنانی بوون, زانین و ژیاندا و بەڵام هێشتاش کەلێنێك بۆ نەزانین و نەتوانین هەیە کە نابێتە مایەی گرفت و داخستن, بەڵکو دەبێتە هۆیەك بۆ کرانەوە و زانین و توانینی زیاتر و فراوانتر, کەواتە سەرباری هەموو ئەو توخم و ئاست و ئاسۆیانە دەبێت نەزانین و نەتوانین زیادبکەین و بەم شێوەیە زیاتر دەتوانین لەوە نزیك ببینەوە کە (بوون کۆی تاکەکانە)(١٦).

بە بڕوای من روانگەی فکری (بوون کۆی تاکەکانە), سەبارەت بەمەسەلەی ناسنامە و نەتەوەکان بەجۆرێك دەبێت کە رەوشی هاولاتی کاتێك سەرچاوەی رەوایی و فەرهەنگ دەکاتە مافەکانی مرۆڤ و هاولاتی و بەهرەمەندبوون لە مافی ناسنامە جیاوازەکانی ولاتێك لەو روانگەوە دەبێت کە بوونی ولاتێك لە ئەنجامی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ, مافی تاکەکان, مافی هاولاتی بوون و پاراستنی ناسنامەکان دەتوانێت کۆی تاکەکان بەدی بهێنێت. جیهانگیریش ئەگەر بەشێوەی کۆی ناسنامە جیاوازەکان و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ بێتە دی, بێگومان هەمان روانگە پەیدا دەبێت.

**ئاست و ئاسۆی چوارەمی پۆست مۆدێرنیزم**, ئەوەیە کە بزوتنەوە و هەلومەرجی ژیانی گۆڕاوە, چەند شێوە و بێناوەند. هیچ دەقێکی تایبەتی یان کۆمەڵە دەقێك ناتوانن ببن بە قسەکەر و ئالا هەڵگری راستینە و هەموو دەق, هەوڵ و پرۆژە و بیروباوەڕەکان دەتوانن لەراستی نزیك ببنەوە, بەڵام هیچیان تاك نوێنەری راستی پاك و پوخت نین, "ئەگەر چی خودی ئەو باوەڕانە بەو شێوەیە خۆیان ناساندووە" . بزووتنەوە و هەلومەرج و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان راستییەکی سروشتی و بێ هەڵە و کەموکوڕی نین،

بەڵکو هەردیاردەیەك یان ڕاستییەك دروستکراوە و بۆ ماوەیەك دەتوانێت بسەپێت یان ببێتە واقیع.

بیرو لێکدانەوەی تا ئێستا دەربارەی هەردیاردەیەك یان بزووتنەوەیەك لەناویاندا نەتەوایەتی, تەنها ئەوە نییە کە بەیانێك بێت لە دید و بەرژەوەندی نووسەرەکان و نوێنەرەکانیان, بەڵکو دەبێت ئەوەش بزانین کە ئەو بیر و باوەڕانە تا ڕادەیەك توانیویانە و دەتوانن ڕەهەندێك یان ئاراستەیەك بن لە ڕاستی, نەك هەموو ڕاستی. ئێمە بۆیە لێکۆڵینەوە و وتارەکان دەخوێنین, بۆ ئەوەی نزیك بینەوە لە ڕاستی, هەرچەندە ئەو گەیشتنە بە ڕێگایەکی ڕاستەوخۆش نەبێت. بیرو ڕوانگەکانیش بەدەوری خۆیان دەتوانن بزوێنەر و هەژێنەری مێژووبن و هەربە تەنها بەرئەنجامی گۆڕان و دیاردەکان نین. ئەبێ ئەوە بزانین کە هەموو شت یان هیچ شت لەو وتارانەدا پەیدادەبێت یان نابێت, بیرێکی هەڵەیە. هێزە کۆمەڵایەتیەکان, بیرەکان و گەلێك هۆکاری دیکە مێژوو دروست دەکەن. بەڵام وتارەکان وادەکەن کە کارەکان گونجاوبن و پاشان هەرئەوانیش هەوڵ دەدەن کە لەلایەن خەڵکەوە قبوڵ بکرێن.

هەر لەم ڕوانگەیەوە, نەتەوایەتی یان هاوڵاتیبوون تەنها دەتوانێت کارابیەکی کاتی بێت و بەهاکەی نرخێکی ڕێژەیی و مێژووییە. نەتەوایەتی کاتێك کە لە خزمەتی ئازادیدا بێت زۆر باشە و خراپیشە کە کاتێك دەکەوێتە خزمەتی زۆرداری و هەڵاواردنەوە. ئەوانەی کە بەشێوەیەکی ڕەها دەکەونە ژێر کاریگەر و بانگەوازی نەتەوایەتی یان هەردیاردە و دیدگایەکی دیکە, هزر و ئاسۆیان دادەخرێت, چونکە خزمەتی مرۆڤ و بەها مرۆڤایەتییەکان ئامانجن, نەك دیاردە و دیدگاکانی ئەو کاروانە.

پێنجەم: ڕەنگدانەوەی دروست یان ڕاستینە (حقیقی) ئەو چەمکە میتافیزیکە کۆنانەن کە لەلایەن ڕەخنەگرانی پۆست مۆدێرنەوە خراونەتە بەر ڕەخنە. ڕاستبوون و واقعی بوونی هەر شتێك یان دیاردەیەك پەیوەندی بە ڕەوایی بوونەوە نیە, بەڵکو پەیوەندی بە هێز و ئیرادەی هێزدارەوە هەیە. دامەزراندنی ڕاستی یان هەق لە واقعدا پەیوەندی بە پێویستی دامەزراندنیەوەیە لەلایەن هێزەوە هەیە بۆ ئەوەی ئەوانی دیکە

بخەینە نێو دیفاکتۆ (ئەمری واقیع) دەبێت بەهێزبین. سەپاندنی یان راستبوونی نەتەوایەتی، سۆسیالیزم، لیبرالیزم و ئایین هەموویان بەو شێوەیە بوون، نەك بەهۆی ئەوەی کە نوێنەری هەق یان باشترین نوێنەری هەقن، ئەوان بەهۆی هێزەوە خۆیان کردۆتە نوێنەری هەق و زۆر جاریش لە هەوڵی ئەوەدا بوون وەکو باشترین نوێنەری هەق و رەوایی بناسرێن.

زانا و فەیلەسووفی ناوداری فەرەنسی "فۆنتین" دەڵێت: "راستی مامۆستایەکی توندوتیژ و سەرکوتگەری هەیە کە ئەویش دابونەریتەکانە. ئەوەی لەناوماندا وردە وردە و بە ئەسپایی هێزی خۆی بڵاودەکاتەوە، بەڵام هەر بەهۆی ئەم سەرەتا نەرم و نیانەوە، پاش ئەوەی کە چنگی گیرکرد و بە یارمەتی کات، ئنجا رووە توند و تیژەکەی خۆی دەرئەخات و نایەڵێت تەنانەت لەبەرامبەریدا چاویش بڵند بکەین"(١٧). (تۆدۆرۆف)ی زانا و فەیلەسوفی بولگاری، فەرەنسی زمان دەڵێت "هەر بەو شێوەیە گەڕانەوە بۆ راستی (نەتەوایەتی وەك راستییەکی پێشوەخت -ئە. م-) و عەقڵ گرفتێکی زۆرمان بۆ دروستدەکات. ئەی چۆن دەتوانین رێگایەك بۆ دەربازبوون لە راستی داسەپێنراو بدۆزینەوە؟ بێگومان لە رێگەی ئازادی، نەك لە رێگەی لێکدانەوەی راستییەکانی پێش وەخت. ئەوەی وا دەکات مرۆڤ بتوانێت هەموو ناوەڕۆکەکان (ئازادی، نەتەوایەتی، یەکسانی، مرۆڤایەتی، سێکس و ئایین) لە خۆیدا پەیدا بکات، ئازادی هزر و ئەندێشە، نەك تەنها خودی عەقڵ و بیرکردنەوە. هەر ئەمەشە وا دەکات کە سروشتی مرۆڤانە و گشتی بوونی مرۆڤ بتوانێت دەستی بەهەموو لایەك رابگات"(١٨).

**شەشەم:** فرەیی بوونی جیهان، ئاشووبێکە کە دەبێتە مایەی رزگاربوون و ئازادی زیاتر، ئەم وتە گرنگە هی (جیانی فاتیمۆ)یە (١٩). یان (ئێرنست رینان) دەڵێت: دابەشبوون مەرجی ئازادییە(٢٠). بیروباوەڕەکانی عەقڵانییەت، سۆسیالیزم، نەتەوایەتی و ئایینی و هەندێك جاریش لیبراڵەکانی نزیك لەبەرژەوەندی سەرمایەداری، بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە چەمکی یەکێتی و میتافیزیکی یەکبوون، بکەنە راستییەکی سەپێندراو و لەم رێگایەشدا بەشی هەرە زۆری بیر و فەلسەفەی دنیا وایان پێشانداوە

کە بەردەوام ئامانجیان یەکێتی و یەکبوون بووە و بێگومان هیچ کەمتەرخەمی و کەموکورییەکیان بۆ بەڕاست پێشاندانی ئەو میتافیزیکانە نەنواندووە. یەکێك لەو دیاردەو چەمك و فەلسەفانەی کە بەناوی یەکێتیەوە دەدوێن, دیاردە و دیدگای نەتەوایەتییەو دەیەوێت بەهۆی هاوزمانی, هاونەژادی, هاونیشتمانی, هاودەسەڵاتی و هەندێك جاریش هاوئایینییەوە, بەرژەوەندی دەسەڵات و چینی دەسەڵاتدار بکاتە روانگەیەك بۆ یەکێتی و هەر لەو رێگایەشەوە بوارنەدان بەداوا و بەرژەوەندی و ئازادییەکانی دیکەی بەدەر لەم بەناو یەکێتییە.

تەنانەت رەهەندی عەقڵانی لیبرالی و دیموکراسیش دەیەوێت سیستەمی نوێنەرایەتی وەکو تاکە نوێنەری یەکێتی و هاوبەرژەوەندی بناسێنێت و بەیارمەتی رەهەندی ناسنامە (نەتەوایەتی یان هاوڵاتی), خۆی وەکو نوێنەر و بەرجەستەکەری یەکێتی نەتەوە و وڵات دەناسێنێت، بێگومان ئەمەش بەراستی لەقەڵەم دەدات و هەرچیشی بۆ بکرێت لەم پێناوەدا درێغی ناکات. ئەوەی کە وادەکات ئەم درۆ و میتافیزیکەی یەکێتی و یەکبوون و هاوبەرژەوەندی سەرنەگرێت, رەهەند و دەسەڵاتی ئازادییە کە توانیویەتی مافەکانی مرۆڤ, مافی تاك و هاوڵاتی بوون وەکو بناغەیەك بۆ فرەیی و کۆدەنگی و کۆبەرژەوەندی رێگربێت لە پێشێلکردنی مافەکان بە ناوی یەکێتی و هاوبەرژەوەندی چونکە یەکێتی و هاوبەرژەوەندییە تەنها دیدگا و بەرژەوەندی دەسەڵات و نوێنەرەکانیەتی و لەبەر ئەوەی کە هەرگیز بەرژەوەندی تاکەکان وەکو یەك نین, بەڵام دەکرێت رەوش و حاڵەتێکی کۆدەنگی و کۆبەرژەوەندی و کۆبیری بکرێتە چوارچێوەیەك بۆ ناسین و پێدانی ماف و پاراستنی ناسنامەکان.

وێرای جیاوازی و فرەیی مرۆڤایەتی و ناسنامەکان, دەتوانین لە رێگای دیموکراسی و ئازادییەوە, رەوش و بارێکی کۆدەنگی و کۆبەرژەوەندی بەدەستبهێنین، ئەگەر چی ئەو هەلومەرجەش کاتی بێت, چونکە هەرگیز چارەسەری ئەبەدی و نەگۆڕ نییە و کات بەردەوامە و گۆڕان هەموو کات و هەموو رۆژەیە. کات مانا و راستی تازە و نوێ بەرهەم دەهێنێت, مانای نەگۆڕ و تاك مانا وەهمێکی ئاشکرایە, دیسان راستی

کۆمەڵایەتی شتێك نییە کە خۆی هەبێت و کەشف بکرێت, بەڵکو راستی یان کۆبەرژەوەندی (سەردەمی دیموکراسی) شتێکە کە لەکات و سەردەمی جیاوازدا بەردەوام دروستدەکرێت(٢١).

فرەیی بوونی جیهان وامان لێدەکات کە باوەڕ بەو حیکایەتە گەورانە نەهێنین کە دەڵێت: (چارەسەری هەموو دەردێکمان پێیە و هەوڵی شکاندنی کۆڵەکە و ناوەندەکانی دنیا و بیرکردنەوە و بوونی تا ئێستا بدەین و هەڵوەشانەوە و بنیاتناناتی سەرلەنوێ ( De construction) بکەینە رێبازی کار و رەخنەی ئایندەمان بۆ گومان لە جەوهەر, پیرۆز و راستی نەگۆڕ و باوەڕنەبوون بە چەمکە پێشوەختەکان و هەڵوەشاندنەوەیان بۆ دەرکەوتنی مانا و بوونی تازە و فەرامۆشکراو). سەرەنجام یەکێك لە ئاسۆ و ئاستەکانی بیر و رەخنەی ئایندەمان دەبێتە گومان و رەخنە و پرسیار لە وتاری بالا دەست (Transdental) و بەڵگەنەویست و وتارومانای بوون کۆی تاکەکانە و هیچ کام لەم تاکانە ناوەند و بالادەست و بەڵگەنەویست نین. ئاسۆی پۆست مۆدێرن دەربازبوونە لە جیهانی تاك مانا و تاك تیۆر و تاك میتۆد, یان هەروەکو جاك دریدا دەڵێت "لەکاتی نائامادەیی مانا, چۆن دەتوانرێت لەیەك (تیۆری) یان تەنانەت یەك (چەمك)دا چەق ببەستین.".

**ئاست و ئاسۆی حەوتەم:** خەباتی پۆست مۆدێرنە بۆ ئازادی زیاتر و فراوان بوون. ئەم خەباتە بەهەمان شێوە دژی سەرمایەداران, سەرکوتگەرانی نەتەوەیی و دینی, پیاوانی چەوسێنەرانی ئافرەتانە . خەباتی پۆست مۆدێرنیزم لەدوو بەرەدایە, لەلایەك دژی خۆفریودانی مۆدێرن (بە ناوی عەقڵ باوەڕی و خودئاگاییەوە) و لەلایەکی دیکە لە دژی جەزم گەرایی و راوەستاوی پێش مۆدێرن .بۆ تێگەیشتن لە کێشەی (نەتەوایەتی و مرۆڤ) و (نەتەوایەتی و ئازادی), وامان لێدەکات لە گشتەوە دەستپێبکەین, هەرچەندە لەوانەیە بەو گشتی بوونەی مرۆڤ نەگەین, بەڵام ئازادی مرۆڤ و مانای مرۆڤ و تێگەیشتن و بینینی پێویستە بۆ لێکدانەوەی مافەکان و تایبەتمەندییەکانی ناسنامەکان, پاشانیش دەبێت ئەوە بزانین کە مرۆڤایەتیش لەکۆی نەتەوە و ناسنامەکان پەیدادەبێت. سەرەنجام ئازادی و بەرژەوەندی مرۆڤایەتی وامان لێدەکات کە مافەکانی گشت مرۆڤ و

تاکەکان بکەینە سەرچاوە بۆ فەرهەنگ و رەوایی و تەنانەت (ناسنامەش), بەڵام هەر لە روانگــەی ئازادییـــەوە دەبێــت هەلومـــەرج و تایبەتمەنــدی ناســنامە جیاوازەکــانیش لەبەرچاوبگرین.

(ترفتیان تۆدورۆف) لە کتێبە گرنگەکەیدا (ئێمە و ئەوان), کە بەشێکی گرنگی بۆ ئازادی و ئاسۆی رزگاربوون لە بێ مافی و ناسنامە تاك رەهەند و نەگۆڕەکان داناوە, لەسەر زمانی مۆنتسکیۆ و رۆسۆ ستایشی ئازادی بەم جۆرە دەکات" "ئاژەڵەکان بەتەواوی ملکەچی یاساکانی سروشتن, بەڵام مرۆڤ دەتوانێت یاساکان بگۆڕێت و چارەنووسی خۆیشی باشتر بکات و ببێتە بکەرێکی ئازاد. ئەوەی مرۆڤ و ئاژەڵ لەیەك جیادەکاتەوە (عەقڵ) نییە, بەڵکو ئازادییە. مرۆڤ ئامادە نییە کە حەتمیەتی سروشت و کۆمەڵایەتی کە دەیانەوێت کۆنترۆڵی بکەن, پەسەندبکات. لە کاتێکدا ئاژەڵەکان لەژێر بەزەیی سروشتدا درێژە بە ژیانی خۆیان دەدەن".

### بیروباوەڕەکانی (ئالان تۆرین) سەبارەت بە نەتەوایەتی

فەیلەسووف و کۆمەڵناسی ناوداری فەرەنسی ئالان تۆرین, کە هەندێك کەس بە پۆست مارکسیست دەیناسێنن, هەندێك بیروباوەڕی سەبارەت بە نەتەوایەتی هەیە و رەخنەکانی ئەو لە پەیوەندی نێوان مۆدێرن و نەتەوایەتی بە ئاشکرایە، هەرچەندە ئەو لەو کەسانەیە کە پێی وایە سەردەمی مۆدێرن کۆتایی نەهاتووە و ئەویش وەکو یۆرگن هابرماس بڕوای بەوەیە کە دەبێت ریفۆرم لەناو مۆدێرندا دەستپێبکەین. بەهەر حاڵ کورتەی باوەڕەکانی ئەو سەبارەت بە نەتەوایەتی بەم جۆرەیە:

١) فرەیی نێوان نەتەوەکان و مرۆڤایەتی پەسەنددەکات, بەڵام لەهەمان کاتدا دیاری کردنی ناسنامەی مرۆڤ بەهۆی نەتەوایەتی بەشتێکی کەموکورت و هی رابردوو دەزانێت, چونکە مرۆڤی ئەم سەردەمە مرۆڤێکی فرەرەهەند و فرەناسنامەیە. تۆرین پێی وایە کە رەهەندی ناسنامەیی دەوڵەتەکان و دیموکراسی دەبێت لە نەتەوایەتی دەربازی بێت و بەرەو فەرهەنگی هاوولاتی هەنگاو بنێت(٢٣).

٢) تیۆری و پراكتیكی مۆدێرن لەهەمان كاتدا كە دەیانەوێت بەیان و رەوایی بدەن بە كۆمەڵی نەتەوایەتی, دەبنە دەرخەری ئاستەنگی فەرهەنگی و كۆمەلایەتی خودی مۆدێرنێتی. سێكس, نەتەوایەتی, قازانج و پێداویستییەكانی بەكاربردن (الاستهلاك)" ئەو هێزانەن كە دەبنە هۆی پەیدابوون و پەیوەندی نێوان رەهەندەكانی مرۆڤ و رەوایی و فەرهەنگ، پاشان هەرخۆشیان دەبنە هۆی ناكۆكی نێوان كۆمەڵگەی مۆدێرن و پیشەسازی.

٣) نەتەوە ئەو شێوە سیاسییە تازەیە كە لە جێگای كەلەپوورو دابونەریت و ئیامتیازاتی بنەماڵە دەسەلاتدارەكان, بوارێكی نەتەوەیی (یان نیشتمانی) دەسەپێنێت كە بەرئەنجامی یاسای هەڵێنجراوە لە بنەماكانی عەقڵ. هەر بەو شێوەیەش دامەزراوەی بەرهەمهێنان و یاساكانی بازاڕ دەبنە پایەیەكی دیكەی گرنگی مۆدێرنیزم. بەلام ئەوەی كە دەمێنێتەوە بۆ بەكاربردن و بەكارهێنان (الاستهلاك) هەتا دەتوانێت لە چوارچێوەی پێشوەخت دانراوی بەها رەمزییەكانی فەرهەنگ و خاوەنداری, خۆی دەرباز دەكات و دەبێتە كەلێنێك بۆ ئازادبوون لە دەسەلاتی نەتەوە , فەرهەنگ , دامەزراوەی بەرهەمهێنان و تەنانەت زۆر جاریش دەربازبوون لە دەسەلاتی سێكس و فەرزكردنی سێكس(٢٤).

٤) نەتەوە شكلی سیاسی مۆدێرن نییە, بەڵكو بكەری سەرەكی مۆدێرن كردنە بەو مانایەی خۆی بكەرێكی مۆدێرن نییە, كە مۆدێرنە پێك دەهێنێت و لەهەمانكاتدا دەیەوێت دەسەلاتی خۆشی بسەپێنێت بەسەر پێكهێنەرەكانی دیكەی مۆدێرنەدا.تەواوی پێكهێنەرەكانی نەتەوە" (زمان, خاك, فەرهەنگ, دابونەریت, دەسەلات و ئابووری) هی سەردەمی پێش مۆدێرنن و لە ئەنجامی كار و هاوبەش بوونی ئەو رەهەندانەوە, رەوشێك پێكدێت كە بەنەتەوایەتی دەناسرێت. بۆیە هەقی خۆیەتی كە بلێین بەردەوام بوونی سەردەمی پێش مۆدێرن و سەردەمی مۆدێرنە(٢٤). كاتێك كە رەخنە لە ئێرنیست گیلنەر و ئەریك هۆبزباوم دەگرێت, هەر بەو بۆنەوە دەڵێت: (( گیلنەر و هۆبزباوم لەسەر هەق بوون كاتێك كە دەڵێن نەتەوایەتی كارێكە لەسەرەوە دەكرێت و بەهۆی دەسەلات و

دەوڵەتەوە, بەڵام لەوەدا هەڵەن کە نابینن خودی دەسەڵات و دەوڵەتیش لەسەر بناغەی مێژوو و تایبەتمەندییەکانی پێشوو بۆ پێکەوەنانی هێز لە پێناوی دروستکردنی رەوشێکی نوێ کە ناوی نەتەوایەتییە, دروستبوون)).

## لێکچوون و جیاوازی مرۆڤ و مرۆڤایەتی لە دیدگای تۆدۆرۆف

بیرمەند و کۆمەڵناسی فەرەنسی ترفتیان تۆدۆرۆف چەند ئاستێك بۆ چوونیەکی و فرەیی نێوان مرۆڤایەتی و پەیوەندی بە پرسی ناسنامەوە, بەم شێوەیە باسدەکات:

ا/ بوونی نەژادەکان: لەدایکبوونی مرۆڤەکان هەرچەندە لەناو نەژادێکی دیاریکراودایە, بەڵام هەموو کەس بەتەنها بە مرۆڤی لەدایك دەبێت, واتە ساتێ لەدایکبوون کەس کورد یان فارس یان ئنگلیز نییە, مەبەست لە دایکبوونی بایۆلۆجییە.

ب/ پەیوەندی نێوان بایۆلۆجی و فەرهەنگی و ئاکاری: هەرچەندە ناسنامەکان بناغەیەکی نەژادی و بایۆلۆجی هەیە, بەڵام ناتوانرێت ناسنامەکان بە شێوەیەکی نەژادی لێك بدرێتەوە, یان تا ئێستا نەتوانراوە پەیوەندی نێوان بایۆلۆجی و فەرهەنگی بسەلمێنرێت. سەرەنجام ناساندنی ناسنامەکان ئاسۆی فەرهەنگی بۆ دەکرێتەوە, واتە ناسنامە نە بایۆلۆجییە و نە نەژادییە, بەڵکو رەوشێکی فەرهەنگییە.

پ/ کاریگەری کۆمەڵ و فەرهەنگ لەسەر تاك (خود): دیاریکردنی هەڵسوکەوتی تاك لەلایەن چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی دیاریکراوە, کە حاڵەتی نەتەوایەتی دەتوانێت کاریگەربێت لەسەرتاکەکان.

ت/ ریزکردنی تاکانەی بەهاکان: ناسنامە و نەتەوەکان بەهاکانی خۆشیان لەبەهاکانی ئەوانی دیکە بە باشتر دەزانن واتە ریزکردنێکی تایبەتی بۆ بەهاکان دادەنێن کە بێگومان بەهاو ناسنامە و نەریتەکانی خۆیان لەهی ئەوانی دیکە بە باشتر دەزانن, ئەگەر بە باشترینی نەزانن.

ج/ ناسنامە و نەتەوایەتی سیاسەتێکی پشت بەستووە بە بیرو ئایدیۆلۆجیا : خاڵەکانی اتات ئەو خاڵانەن کە نەتەوە و ناسنامەکان پشتی پێدەبەستن بۆ بوونی یان

سەلماندنی راستی و واقیعی بوونی خۆیان. بەلام خالی پێنجەم (ج) دەیەوێت سیاسەتێك پەیڕەوبكرێت كە ژیان واپێشان بدات كە گونجاوبێت لەگەڵ ئەو خالانەدا, واتە بوونی فیكر و مەعریفەیەكی دیاریكراو كە دەبێتە نەتەوایەتی(٢٥).

## سەرئەنجام

یەكەی ناسنامەی كردەیی و یاسایی گرووپێكی مرۆڤایەتی, بەپێی پێوەرەكانی نێودەولەتی, فكری و مرۆڤایەتی "نەتەوە" بەمانای نەژادپەرستی نییە, بەلكو "هاولاتی" بوونی كۆمەلەكانە. ئەگەر لە جیاتی كۆمەلێك یان ولاتێكی دیاریكراو بمانەوێت تەنها لەنەتەوە بدوێین و ئەو پەیوەندییە تەنها لە "نەژاد" و "زمان" دا بەرتەسك بكەینەوە, ملیۆنەها كەس لە دانیشتوانی ئەو ولاتە لەبەرچاو نەگرین, زولمێكی زۆرمان لەو خەلكانە كردووە, لەبەر ئەوەی هاولاتی بوونمان تاڕادەی نەژادێكی دیاریكراو كەمكردۆتەوە. لە كۆدا, دەبێت بە تەواوی كۆمەلە پێكهێنەرەكانی ولاتێك, كۆمەلگایەك یان نیشتیمانێك ئاماژە پێبدەن, ئەو كۆمەلانەی كە هەریەكەیان جێگای خۆیان هەیە و نەخشی خۆیان دەبینن. كۆمەلی مرۆڤایەتی گشت و تەواوكارییەكی مێژوویی ئالۆزە, سەبارەت بەم دینامیزمە كۆمەلایەتی و ئەوەی كە ئێمە لەسەردەمێكی مێژوویدا "ئەوەین" كە "پەیدابووین", ناتوانین لە ناسینی كۆمەلایەتیدا خۆمان بە "بەرجەستەبوون" یان "ناوەڕۆك" بزانین, بەلكو هەموو گرووپ و كۆمەلە پەیدابووەكان كە هەن لەگەڵ ئێمەدا گشتێك پێكدەهێنن, كە لەكاروانی مێژوودا كارونەخشیان كردووە و دەیكەن. بۆئەوەی بتوانین چۆنیەتی بەدیهاتن و بەرجەستەبوونی ناسنامەكان باشتربناسین, پێویستمان دەبێت پێگەكانی ئەو پەیدابوونە, لە روانگەی كۆمەلناسییەوە بزانین و لەهەریەكەیان بكۆلینەوە.

## هاولاتی بوون, نەك نەتەوەپەرستی

قۆناغەكانی گەشەی ناسنامە تا ئێستا بەم جۆرەیە" خێل, میللەت, نەتەوە و هاولاتی. كاتێك كە سەرچاوەی بیروچوارچێوەی وێناكردنی كۆمەلناسی دەبێتە چەمك و

زاراوەی وەکو کۆمەڵ, گروپ, پێکهاتەی کۆمەڵایەتی, جێگاورێگا, نەخش, تویژبەندی کۆمەڵایەتی, فەرهەنگ و نەتەوە لەلای ئەو زانستە گرنگی پەیدادەکەن. زاراوەی دوایی واتە (نەتەوە) لە مانای نەتەوەپەرستی یان میللەتگەرایی زیاتر لایەنی سیاسی و باوەڕی و سۆزداری (یان ئایدیۆلۆژی) هەیە و بەهرەمەند دەبێت لە فرەیی و لێکۆلینەوەی زیاتری دەوێت. سەرەڕای قەوارە و پێکهاتنەکەی, کە بێگومان دەکرێت چەند گرووپی میللی یان "نامیللی" تێدابێت, واتا ئەو گرووپانە سەربەهەمان نەتەوەن یان نا. کەم وڵات هەیە لە دنیادا تاکە نەژاد و نەتەوە و میللەتێك بە تەنها بژین و زۆربەی وڵاتەکان لەو زەمینەیەدا فرەن. یەکسانی و هاوتایی نەتەوەیەك _ئەگەر چەند سەدهەزارێکیش بن _کارێکی رێژەیی و کاتییە, کە زۆربەی کات شایانی باوەڕکردن نییە.

سەرکەوتن یان دەسەڵاتی سیاسی — سەربازی و دیموگرافی کۆمەڵێکی دیاریکراو _بە ناونیشانی نەتەوەیەك_ بەسەر "هاوڵاتیان", "هاونیشتمانان" یا "داگیرکراوان" هەرگیز نەفی بوونی راستینەی کۆمەڵناسی و یاسایی ئەوانی دیکە ناکات و ناشبێت کە وابێت. لێرەوە جیاوازی نێوان (لێکۆڵیار) و نەتەوە یان نەتەوەپەرست دەردەکەوێت, وتن و سەلماندنی (رەسەنایەتی) تاکە یەك گرووپی میللی لە وڵاتێکدا نەفی یاسای سروشتی — کۆمەڵایەتی پەیوەندی و تێکەڵاوی بەناچاری کۆمەڵەکانی مرۆڤ دەکات لەگەشەی مێژوو, هاوگەرایی و پێکەوەژیانی ئەوانە لە پانتایی جوگرافیادا.

ئەگەر سەرنج بدەینە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا, یەکەم شت بۆمان دەرئەکەوێت ئەوەیە کە ئەم وڵاتە لەم زەمینەیدا (زەمینەی ناسنامە) وڵاتێکی کراوەیە, ئەو زاراوانەی بەکاردێت چ لە ئاستی زانستی و تەنانەت سیاسیشدا وێنای ئەو رەوشە کراوەیە دەکەن و (خەڵکی ئەمریکا – American People) و (کۆمەڵگای ئەمریکا – American Society) بەکاردێت نەك میللەت یان نەتەوەی ئەمریکا, ئەوش لەوە پەیدابووە کە لەو ولاتەدا چەند میللەت و ناسنامە و گرووپی تێدایە, یەکتریان قبوول کردووە و وابەستەبوون بە میللەت یان نەتەوە هەتا دێت لەو ولاتەدا کەم دەبێتەوە و ناسنامەی ئەمریکی (هاوڵاتی بوون) جێگای هەموو ناسنامەکانی دیکەی گرتۆتەوە.

بێگومان هەموو ئەمانە بەهۆی کرانەوە, شارستانی بوون و یەکسانی ماف و ئەرکەکانی هاوڵاتییانە, وێڕای ئازادبوونی پاراستنی خودی ئەو ناسنامە جیاوازانەش. ناسنامەی ئەمریکی سەبارەت بەو گەشەکردنانە لە ئاستەکانی کۆمەڵایەتی, فەرهەنگی و بەهاکاندا, زیاتر بەمانای "نیشتمانپەروەری – Patriotism" و "وەفاداری" دێت بۆ دەستوور و تەنانەت نەك بۆ "ئاڵا" و دامەزراوە یاسایی و حکوومەییەکانی کۆمەڵ بەرجەستە دەبێت.

لە راستیدا پێوەری ناساندن و پابەندبوونی کردەیی و یاسایی کۆمەڵێکی دیاریکراو لە زەمینەی نێودەوڵەتیدا, ناسنامەی ئەو خەڵکەیە بۆ وڵاتێکی دیاریکراو, بەڵام بە پێی پێوەرەکانی دیموکراسی, مافەکانی مرۆڤ و مافی ناسنامەکان, نەك وڵاتانی بەزۆر دروستکراو و سەپێنراوی وەك عێراق یان تورکیا یان زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێ کە لە هەردوو زەمینەی ناسنامەیی و دیموکراتیدا, هیچ مافێکیان بە گرووپ و میللەتە جیاوازەکان و تاکەکان نەداوە.

ئەگەر گرنگی بدەین بە حاڵەتی میللەتی و نەژادی و لە نێوان گرووپ و میللەتەکانی وڵاتێکدا (کە کەم وڵات هەیە لە رەوشی فرەیی گرووپەکان بەدەربێت) و لە جیاتی (هاوڵاتی بوون) یان (هاونیشتمانی بوون) بە کاریان بهێنین, ئەو کاتە رێگا دەدەین کە ئاستەنگی ناسنامە و دژایەتی نێوان ناسنامەکان فراوانتر بکەین. لەسەردەمێکدا کە خودی ناسنامەی نەژادی و میللی و (تەنانەت نەتەوایەتیش) لە رەوشێکی دژواردا بەسەردەبەن. گرنگی دانی تایبەتی بە یەکێك لەو ئاستانەی ناسنامە لەبەرامبەر بەرژەوەندی گشتی و هاوڵاتی بوون هەلومەرجەکە دژوارتر دەکات و سەرەنجام زەمینەیەکی رەسمی و سیاسی و (زۆر جاریش سەربازی) بۆ هەڵاواردنی ناسنامەیی فەراهەم دەبێت. زۆرن ئەو وڵاتانەی کە دەمێك ساڵە بەو شێوەیە سیاسەتی ناسنامەیان پیادەکردووە.

**ناسنامەی کۆمەڵ و ناسنامەی تاک:**

سەبارەت بە دیاریکردنی چەمکی ناسنامە لە ئاستی فراواندا و بە پێی پێوەرەکانی سەردەم, ناساندنی ئەم زاراوەیە بە (هاولاتی) و (مافەکانی مرۆڤ) و (مافی تاکەکان) و (هاونیشتمانی)بوون , دەگەینە ئەو ئاستەی کە ناسنامەی گرووپی مرۆڤایەتی لەگەڵ ناسنامەی (تاك) و (خود)دا دەبێتە (فرەیی) لەبەرامبەر (یەکێتی) یان (تاکگەرایی), چونکە لە فرەیی و پەیوەندیدا هەردوو ئاستەکانی یەك بوون (چاکتر وایە پەیوەندی و کۆدەنگی بەکاربێت) و تاکگەرایش پەیدا دەبێت و لەکاتێکدا پێچەوانەی ئەمە راست نییە.

ئازادی و داواکارییەکانی مرۆڤایەتی لە هەردوو ئاستی (گشت) و (بەش) یان (کۆمەڵ) و (خود)دا توانیویەتی ستاندار یان پێوەرێکی جیهانی بۆ پاراستنی مافەکان و ناسنامەکان بەدەست بهێنێ. جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ, کە مافی تاکەکان و مافی پاراستنی ناسنامەکانیشی تێدایە (بەناسنامەی تاك و کۆمەڵ) زەمینە و چوارچێوەیەکی گونجاوە بۆ ئەوەی بتوانین لە واری ناسنامەدا بگەینە ئەو ئاستەی کە ناسنامە هەردوو ئاراستەی کۆمەڵ و تاك لە خۆیدا فەراهەم دەکات. ناسنامەی تاك ئەوەنییە, کە ئەو کەسە کێیە؟, بەڵکو ئەوەیە کە ئەو گرووپەی کە ئەوی تێدایە (لە خێزانەوە تا چینی کۆمەلایەتی, میللەت, نەتەوە, پارت, هاودینان و ....) خود کام ناسنامەی هەیە و چۆن ئەو ناسنامەیەی بۆ دەگوێزرێتەوە. هەڵبەتە کە تاك لە ڕوانگەی دەروونناسی تاك و تایبەتمەندییەکانی, لایەنی کەسایەتی و هەمیشە سەربەخۆییەکی ڕێژەیی خۆی هەیە, ئەویش بەوەی کە چۆن لەگەڵ ناسنامەی گرووپ یان کۆمەڵدا بیر و کرداری خۆی بەرجەستەدەکات. تاك لەوانەیە مل نەدا بە کردار و بەهاکانی کۆمەڵ و هەڵگەڕێتەوە و "لابدات". بەلام بە دڵنیایی دەبێت بڵێین کە ئەم هەلومەرجە یان (لادانە) هەرگیز هەمیشە نێگەتیف و خراپەکار نییە, بەڵکو لە هەندێك جار پۆزەتیف و بنیاتنەریشە, چونکە خود پەیوەندی بە جووڵە و دینامیزمی کۆمەڵەوە هەیە و بەدیهێنانی ئەو دینامیزمە, ئەو خودە سازدەکات.

دەبێت ئەوە بڵێین کە زاراوەی "ئاستەنگی ناسنامە – Identity Crisis" لەلای (ئەریك ئەریکسۆن) (١٩٠٢ – ١٩٩٤) دەروونناسی ئەمریکی، لەو کاتەدا بەردەهێنێ کە مرۆڤ دەگاتە قۆناغی نەوجەوان و لاوێتی، ئاستەنگی ناوبراوی تاك و دەروونی پەیوەندی و کاریگەری لەسەر سەردەمێکی تایبەتی تەمەنی ژیانەوە هەیە، کە بێگومان قۆناغێکی تێپەڕ و بەسەرچوو دەبێت. ئەو ئاستەنگە، گرووپی و کۆمەڵایەتییە و کەم و زۆر، هەمیشە لە نێوان کۆمەڵێك لە نەوجوانان و لاوان و لە کاتی تایبەتیدا پەیدا دەبێت. لەهەمان کاتدا، خودی ئاستەنگی ناسنامە خۆیشی (چۆن دەوڵەتێکی سەردەمی تێپەڕبوون)کاردەکات، واتە نە ئێرانی (پەهلەوی) و نەئێرانی (کۆماری ئیسلامی) دورگەیەکی ئارامی ئەبەدی نییە، چونکە لایەنی کەم شەپۆلەکانی دەوروبەری کەنارەکانی هەمان دورگە بە شێوەیەك لە شێوەکان و چۆن بۆیانبکرێت، کاریگەری لەسەر دورگەکە دەکەن.

بەم جۆرە، لەهەر ئاستێك کە ئاستەنگی ناسنامە دەرئەکەوێت، هەرچی زیاتر و باشتر رەگو ریشەکانی بناسین، چاکتر و کاریگەرتر چارەسەری دەکەین. ئاستەنگی ناسنامەی کۆمەڵایەتی یەك (کێشەی کۆمەڵایەتییە) و دەبێت وەك هەر پرسێکی کۆمەڵایەتی دیکە بیناسین، پشتگوێی نەخەین، هەروەکو مەولانای رۆمی دەڵێت :

**دەردێك نییە، خراپتر لە نەزانی**

**تۆبە هاوڕێی نەزانی عیشقت لەدەست چوو**

### ناسنامەی پەیوەندیدار

ئەگەر لە جیاتی (کۆمەڵی) ئێران و (وڵاتی) ئێران بمانەوێت تەنها باسی (نەتەوەی) ئێران بکەین و تەنها ئەو پەیوەندییە لە (نەژادی ئاری) و (زمانی فارسی) و (مێژووی کۆن) ی ئێراندا بناسین و میللەت و نەتەوەکانی دیکە نەناسین و حسابیان بۆ نەکەین، گرووپە میللییەکانی ئازەری، بلوج، تورکمان، کورد و عەرەب و گرووپە دینییەکان لەبەرچاو نەگرین، بێگومان هەریەك لەمانە کە هەستدەکات ئێرانی بوون قەیران و

ئاستەنگ و چەوسانەوەیە بۆ ئەو، کاردانەوەی دەبێت و هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا دەبێت لەو چوارچێوە چەوسێنەر و ئاستەنگە رزگاری بێت و چوارچێوەو ناسنامەیەکی دیکە پەیدا بکات. بەڵام کاتێك ناسنامەیەکی دیاریکراو دەیەوێت زیاتر خۆی بنیادبنێت و گەشە بکات، بەمەرجێ ئەوانەی دیکە لەبەر چاو بگیرێت و بیان خوێنێتەوە. دوو کاری سەرەکی و گرنگ بۆ خۆی و بۆ ئەوانی دیکە پەیدادەکات، یەکەم" ئەوەیە بەبێ کێشە و دوژمنایەتی ناسنامەی خۆی پەرە پێدەدات و دووەم" هەلی یارمەتیدانی ئەوانی دیکە بۆ ناسنامەکەی خۆیشی پەیدا دەکات.

ئەگەر ئەوە لەبەرچاوبگرین کە هەموو ئەوانەی پێکەوە دەژین دەتوانن کاریگەری و هاوکاری لە زەمینەی ناسنامەدا بۆ یەکتری بنوێنن، چونکە هەروەکو چۆن تاکەکان لە بونیاد و کرداردا لەگەڵ یەك پەیوەندیدارن (هابرماس، دریدا) هەربەوجۆرە ناسنامەکانیش لە بونیاد و چالاکیاندا پەیوەندی و کاریگەرییان هەیە. باشترین رێگای کۆمەڵناسی بۆ ناسنامە، گەشانەوەی ناسنامەی پەیوەندیدارە، نەك نکۆڵیکەر و هێرشبەر و سەرەنجام لەسەردەم و سیستەمی دیموکراسیدا، رەوشی سەرەکی ناسنامە دەبێتە رەوشێکی داکۆکیکەر، نەك هێرشبەر.

شێوەی هەڵوێستی ئێمە لەگەڵ ناسنامەکاندا دەبێت شێوەی کۆمەڵناسی (Sociologic)، نەك ئایدیۆلۆژیك بێت. ئەگەر وا نەبێت دەستدەکەین بە نکۆڵی و لەناوبردنی ناسنامەی کۆمەڵایەتی ئەوانی دیکە، لە کاتێکدا لەوانەیە خودی ئەوانی دیکە یارمەتیدەری ئێمەبن بۆ بونیادنانی ناسنامەکەمان. دەبێت ئەوەش لەبەرچاو بگرین کە ناسنامەکان هەمیشە و لە ئایندەشدا لەگەڵ یەك پەیوەندیدارن.

### تایبەتیبوون و گشتیبوونی ناسنامەکان

ناساندنی ناسنامەی کۆمەڵایەتی کارێکی رێژەییە و وەکو هەموو پێناسەکانی دیکەی زانستی سروشتی و کۆمەڵایەتی شێوەیەکی "رێکەوتن" و "شایستەیی" هەیە، مانای کە هەمیشە لە هەلومەرجی گەڕان و لێکۆڵینەوە و چاککردن و گەشەکردن و

تەنانەت کەمکردن و لێ لابردندا دەجولێتەوە و بەردەوام دەبێت. لە هەمانکاتدا لە هەندێك باری تایبەتیدا (نەك گشتی) رەوشی تایبەتیش بەخۆوە دەگرێت, واتە ناسنامە سەرەڕای ئەو رەوشە بەردەوامەی گەشەکردن, لایەنی زۆر تایبەت بەخۆشی هەیە, کە لەوانەیە ناسنامەکانی دیکە خاوەنی نەبن. ئەم پێناسەیە پەیوەندی هەیە بە کاریگەری (خودی) ئەو رەهەندە مێژوویییەی کە تیایدا ئەلگۆیەکی "نموونەیەکی" دیاریکراوی کۆمەڵناسی کاردەکاتە سەر هەر کۆمەڵێکی مرۆڤایەتی (نموونەی شیعەی ئێرانی) یان (کاکەیی و ئێزیدی کورد), کە خۆیان بە شێوەیەکی تایبەتی بۆ خۆیان و بەشێوەیەکی رێژەیی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دەناسێنن. ئەم هەڵوێستە یان "ناسینە" بۆ ناسنامە دەمانباتە ئاستێکی دیکەی شیکردنەوە, ئەویش ئاستی فەرهەنگە.

### فەرهەنگ, نەك نەژاد

دەربارەی باسی (نەژاد) و (فەرهەنگ) و کەسی زانستکار چەمکی (نەژاد) دوور دەخاتەوە, بەو پێیەی کە ئەم زاراوەیە هەرگیز زانستی نییە. و کاریگەری ترسناك و دژایەتی نێوان ناسنامەکان پەیدادەکات. کاتێك باسی رەسەنایەتی کۆمەڵێك خەڵك دەکەین وەکو گرووپی کۆمەڵایەتی, فەرهەنگ, زمان و مێژوو یان سایکۆلۆژی و بەهاکانیان گرنگی پێدەدەین, بەڵام دەبێت دوور بێت لە رەگەزپەرستی . ئەگەر دەربارەی پەیدابوونی ناسنامەکان, وەکو دیاردەیەکی مێژوویی بدوێین بۆمان دەرئەکەوێت کە پەیدابوون و دەرکەوتنی نەتەوەیەکی دیاریکراو لە دوای پەیدابوونی (شار) نەك (لادێ) دەتوانرێت باسی لێبکرێت, هەرلەبەر ئەوەی کە یەکەم" دیاردەی شار, دیاردەیەکی نوێیە و زۆربەی دانیشتوانی جاران لە لادێکاندا دەژیان و پاشان چوونەتە شارەکانەوە, بۆیە تەماشا دەکەین کە شار لە لادێ زیاتر هەمەڕەنگە و چەند جۆر رەسەن و خێزان و بنەماڵەی تیادەژی, واتە دروستبوونی هەلومەرجێك کە تیایدا رەسەن یان سەرەتا دەورێك نابینێت بۆ پێکهێنانی ئەو چوارچێوە یان ناسنامە کۆمەڵایەتییە. دووەم" لەبەر ئەوەی شار زیاتر لادێ رەوشی جێگیر بە خۆوە دەگرێت و

ئەو شێوە ژیانەی شار, ئەو داب و نەریت و هەلومەرجی رووناکبیری و خوێندەوارییەی شار دەتوانێت بناغەیەکی باشتر و بەردەوامتر و فراوانتر بۆ ناسنامە بەدی بهێنێت, کە کۆی ئەمانە بەناوی فەرهەنگەوە دەناسرێت. هەر لەبەر ئەمانەیە کە زانایانی نەتەوایەتی, یەکێك لە مەیدانەکانی پەیدابوونی ناسنامە بەو شێوە ژیانەی دوای شار کە دەبێتە فەرهەنگ , دەکەنە بناغە و گرنگی بە نەژاد یان سەرەتا و بنەماڵە و خێڵەکان نادەن, چونکە هەموو ئەمانە کاتێك دەتوانن ببنە یان بچنە ئاستێکی فەرهەنگی و ناسنامەیی کە بگەنە قۆناغی شار و نەتەوە. رەوشی شار و نەتەوە دەتوانێت شارنشین و هاوولاتی بە تەواوی دەتوانێت رەسەنتر بوونی نەژادێك, بنەماڵەیەك یان خێلێك پاشەکشە پێبکات و رەوشێکی فەرهەنگی فراوانتر بکاتە رەهەندێکی ناسنامە..

سەرچاوەکان:


١- ی. فیختة, خطابات الی الامة الالمانیة, ترجمة : د. سامی الجندی. دار الطلیعة, بیروت ١٩٧٩.

٢- رابرت هولاب, یورگن هابرماس و نقد در حوزەء عمومی . ترجمة د. حسین بشیریة.نشر نی, تهران ١٣٧٨.

٣- کارل پۆپەر, وانەی ئەم سەدەیە, وەرگێرانی. شۆرش جوانرۆیی. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم, سلێمانی , ٢٠٠١

٤- اریك هوبزباوم, الامم والنزعة القومیة. ترجمة , عدنان حسن. دار المدی ١٩٩٩

٥- تزفتیان تودوروف, نحن و الآخرون , ترجمة د. ربی حمود . دار المدی ١٩٩٨

٦- ارنست گیلنەر, الامم و القومیة , ترجمة: د. مجید الراضی . دارالمدی ١٩٩٩

٧- اریك هوبزباوم, هەمان سەرچاوە.

٨- هەمان سەرچاوە.

٩- جان لچت, پنجاه متفکر بزرگ معاصر (از ساختارگرایی تا پسامدرنیته), ترجمه: محسن حکیمی. تهران, انتشارات خجسته. ١٣٧٧.

١٠- تزفتیان تودوروف, نحن و الآخرون , ترجمة د. ربی حمود . دار المدی ١٩٩٨

١١- محمد ضمیران, جاك دریدا و میتافزیك حضور, انتشارات هرمس, تهران, ١٣٧٩

١٢- سرگشتگی نشانها (نمونەهای از نقد پسامدرن), نشر مرکز, تهران ١٣٧٩

١٣- محمد ضمیران, جاك دریدا و میتافزیك حضور, انتشارات هرمس, تهران, ١٣٧٩

١٤- سرگشتگی نشانها (نمونەهای از نقد پسامدرن), نشر مرکز, تهران ١٣٧٩

١٥- ئەم وتەیە هی جاك دریدایە, کتێبی اطیاف مارکس, گۆڤاری سەردەم, ژمارە ١٤

١٦- تەواوی زانیاریەکانی خاڵی سێ لە (پۆست مۆدێرنیزم) لە کتێبی : محمد ضمیران، جاك دریدا و میتافزیك حضور، وەرگیراوە.

١٧- تۆدۆرۆف، هەمان سەرچاوە.

١٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٩- سرگشتگی نشانها (نمونەهای از نقد پسامدرن)، نشر مرکز، تهران ١٣٧٩

٢٠- تۆدۆرۆف، هەمان سەرچاوە.

٢١- سرگشتگی نشانها (نمونەهای از نقد پسامدرن)، نشر مرکز، تهران ١٣٧٩

٢٢- جان لچت، پنجاه متفکر بزرگ معاصر (از ساختارگرایی تا پسامدرنیته)، ترجمه: محسن حکیمی. تهران، انتشارات خجسته. ١٣٧٧.

٢٣- آلان تورین، ماهی الدیمقراطیة، ترجمة حسن قبیسی، دار الساقی، بیروت، ١٩٩٥.

٢٤- آلان تورین، نقد الحداثة، ترجمة انور مغیث، المجلس الاعلی للثقافة، ١٩٩٧.

٢٥- تزفتیان تودوروف، نحن و الآخرون ، ترجمة د. ربی حمود . دار المدی ١٩٩٨

٢٦- بەشی زۆری زانیاریەکانی بەشی (سەرەنجام) لە وتارێکی د. عەلی ئەلتائی _بەڕێوەبەری بەشی زانستی کۆمەلایەتی زانکۆی شاو _ کارۆلینای باکور، وەرگیراوە. بڕوانە ؛ د. علی الطایی؛ تبلور هویت گروهی در بینش جامعە شناختی. مجله (کتاب ماه، علوم اجتماعی) شماره ٤٣ – ٤٤ سال چهارم ١٣٨٠ .

## لستەر فرانك وۆرد

# زانستە کۆمەڵایەتییەکان و سەرلەنوێ بونیادنانەوەی کۆمەڵگا

**هاری ئالمەر بارنز**

**وەرگێڕانی: ئەڤین ئیبراهیم**

### یەکەم:

### "وۆرد" و سیما گشتییەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی

لە نێوان کۆمەڵناسە ئەمریکییەکاندا، لستەر وۆردL.WARD "١٨٤٣-١٩١٣"بە یەکەمین زانا دادەنرێت کە نموونەیەکی گشتگیرو ڕێکوپێکی بۆ کۆمەڵناسی پێشکەش کردووە، وێڕای ئەوەی یەکێك بووە لە پێشەنگانی ئەو زانایانەی لە بواری کۆمەڵناسیی ڕێکخستندا کاریان دەکرد، دەربارەی کتێبەکەشی:" کۆمەڵناسیی داینامیکی"کە لە ساڵی١٨٨٣ چاپ کرا، ئەوا گەلێك ڕەخنەگر، بە توحفەیەکی ئەدەبیی نایابیان لەقەڵەمداوە، ئەمانەو وتارگەلێکی لە گۆڤارە زانستییە باوەڕپێکراوەکان بڵاوبووەتەوە. کتێبەکەی دەربارەی کۆمەڵناسیی ڕێکخستن لە شەش بەرگی گەورە پێکهاتووە(١).

لە داهاتووشدا جۆری هەڵسەنگاندنی پێگەی "وۆرد" لە مێژووی کۆمەڵناسیدا هەرچۆنێك بێت، ئەوا بە دڵنیاییەوە، جگە لەو هیچ کەسێکی دیکە نییە ئەم زانستەی بە رادەی مەعریفەی زانستیی"وۆرد" وەرگرتبێت. دەکرێ هەندێك پێیان وابێ فەلسەفەی "سپنسەر"یش مەعریفەیەکی زانستی فراوانی تێدایە، بەلاَم بە هەموو پێوەرەکان، مەعریفەی زانستیی "وۆرد" لەوەی لای سپنسەر هەیە، بالاَترە.

"وۆرد"لای دەوڵەت پسپۆڕێکی زانستی بوو لە بواری رووەکناسی"Palenobotany"دا کاری دەکرد، بەلاَم لای ئەو گرنگی ئەم بوارە، بە بەراورد لەگەڵ کۆمەڵناسیدا، بە پلەدوو دەهات(٢). وێڕای ئەمەش، ئەم بوارە بە ڕادەیەك کاریگەری لەسەر "وۆرد" هەبوو، کە بەوپەڕی شارەزاییەوە هەندێك زاراوەی زانستی لە کۆمەڵناسیدا بەکار بهێنێت، تەنانەت هەندێك لە زاراوەکانی گەیشتنە ناو هزری کۆمەڵناسی کلاسیکی....ئێستاش هەوڵدەدەین بەشدارییەکانی ئەو لە بواری کۆمەڵناسیدا نیشاندەین.

"وۆرد" رای خۆی دەربارەی کۆمەڵناسی دەردەبڕێت، دەڵێ:دەسکەوتە مرۆییەکان بابەتی سەرەکیی کۆمەڵناسین. خودی مرۆڤ نەك وەکو ئەوەی کە خۆی هەیە، بەڵکو وەکو ئەوەی کە دەیکات، ئەو بونیاد نیە بەڵکو وەزیفەیە(٣). لە کاتێکدا پێشەنگانی کۆمەڵناسی گرنگیان بە توێژینەوەی بونیادی کۆمەلاَیەتی دەدا، "وۆرد" بیری لە داهێنانی زانستێکی نوێ دەکردەوە. کۆمەڵناسی دابەشی دوو بەش کرد: بەشی تیۆری و بەشی پڕاکتیکی. بەشە تیۆرییەکەی لە هەوڵی دامەزراندنی پرەنسیپە زانستییەکانی زانستەکە دایەو، هەرچی بەشە پڕاکتیکییەکەیە، ئەوا لە پەرەسەندنی ژیانی کۆمەلاَیەتیدا، پشت بەکۆمەڵناسی تیۆری دەبەستێت(٤).

"وۆرد"کۆمەڵناسی رێکخستنی دابەشی دوو بەش کرد: بەشێك گرنگی بە بنچینەی پێکهاتە مرۆییەکان"الاصل التكويني الانساني"دەدات، بەشەکەی دیکەش گرنگی بە مەبەستو ئامانج دەدات، بەشی یەکەم تایبەتمەندە بە پەرەسەندنە خۆڕسکییەکانی بونیادو وەزیفە کۆمەلاَیەتییەکاندا، کەچی بەشی دووەم لەگەڵ پەرەسەندنی وشیاری و هەستە زانینەکانی لە ناو کۆمەڵگادا، مامەڵە دەکات. بەشدارییەکانی وۆرد کە تایبەتن بە بەشی یەکەمی دابەش کردنەکەی، تەنیا بریتییە لە بەکارهێنانی هەندێك چەمكو زاراوەی

زانستی، وەکو:گەشەی وەهمی یان درۆزنانە، یاسای ئابووری، وەزیفە، بنەچەی بایۆلۆژیی عەقڵ، ستاتیکاو داینامیکای کۆمەڵایەتی، هەروەها پۆلێنکردنی هێزە کۆمەڵایەتییەکان.

بنەڕەتی پەرەسەندن و سروشتی کۆمەڵگا واقیعی نین. لەمەیان، مەبەستی "وۆرد"ئەوەیە کە ئەم جۆرە پەرەسەندنە لە هەندێك رووەك و دەوەندا بەدیدەکرێت، کاتێك کە قەد یان لقێکی رووەکە، لە قۆناغێکی گەشەسەندنی دیاریکراودا، چڵێکی نوێ دەردەکات، ئەمیش دوای قۆناغێکی دیاریکراوی گەشەسەندن، دەبێتە قەدێکی نوێ و.....هتد."سمنەر" پرەنسیپی (سێنتسی داهێنەر- Creative synthesis )کە لە دەروونزانی ئەڵمانی"ولیلهەم فۆندت"ی W. Wundt وەرگرتووە، شیدەکاتەوە(٥) بەوەی هەموو سێنتسێکی نوێ هەمان ئەو توخمانەی تێدا نییە کە لە بنەڕەتدا پێکیان هێناوە. چونکە هەموو سێنتسێك لە سروشتدا لە سێنتسی کیمیایی دەچێت، کە خۆی لە خۆیدا توخمی نوێ دەێنێتە کایەوە. ئەم بەشدارییانە بە گرنگترین کارەکانی "سمنەر" دادەنرێن لە کۆمەڵناسیدا. هەروەها دەربارەی تێگەیشتنی ئەو بۆ هاوکاریکردن، کە ئەم وشەیە لە رووەکناسی و دیالیکتیکی هیگڵ وەرگیراوە، بەوە پێناسەی دەکا کە کارێکی ئۆرگانی هاوبەش و رێکخراوە، هەموو هێزە دژیەکەکانی ناو سروشتی تێدایە(٦). ئەمیش یەکێکە لەو چەمکە بنەڕەتییانەی تیۆرییەکەی لە بارەی پەرەسەندنی خۆڕسکی کۆمەڵگاوە دیاریدەکات. دەربارەی یاسای ئابووریش، بەو پێیەی کە یاسای سەرەکیی میکانیکای کۆمەڵایەتییە، بەو رەوتە وەسفی دەکات، کە هێزە سروشتییەکان هەیانە بۆ ئەوەی بە یەك نەزم و بە کەمترین بەرگری یاخود سەرنج راکێشان، کار بکەن(٧) بەمەیش دەبینین، کە لەم لایەنەدا رایەکانی "سمنەر"وسپێنسەر" دەبارەی پرەنسیپی بزاوتن و تیۆرییەکەی، تا رادەیەکی بەرچاو چوون یەکن.

سیفەتەکانی جەسارەت و باوەڕبەخۆبوون وایان لە "وۆرد" کرد، وەسفی ژیان و بنەما بایۆلۆژییەکانی عەقڵ بکات. ئەو پێی وابووە کە لە بنەچەدا ژیان لە پرۆسەیەکی بایۆلۆژی —Zoism—پەیدا بووە، ئەمیش سێنتیسێکی قەشەنگەو باڵاترین شێوەی خەسڵەتە ناسراوە کیمیاییەکانی هەیە(٨). هەروەها جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە عەقڵیش بەرهەمی هەمان پرۆسەی بایۆلۆژییە کە، بەوە جیا دەکرێتەوە کە توانایەکی لە رادەبەدەری هەیە بۆ جیاکردنەوەی ئازار و بەختیاری کە ژینگە سەرچاوەیانە(٩).

هەست و ئارەزوو، هێزە داینامێکییەکانی عەقڵن. وەلێ ژیری، بەو پێیەی بەرهەمی عەقڵە،توانستی ئاراستەکردنە(١٠).

وۆرد جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کەجیاکاری نێوان ستاتیکاو داینامیکای کۆمەلایەتی‌و، سروشتی هەریەکێکیان بەجیا، گرنگترین بەشدارییە تیۆرییەکانیەتی. ستاتیکای کۆمەلایەتی بایەخ دەدات بە چەمکی یەکسانی‌و چەسپاندنی سیستەمی کۆمەلایەتی، واتە بونیادی پێکهاتە کۆمەلایەتییەکان(١١). پەرەپێدانی سیستەمی کۆمەلایەتیش بە هەوڵ و کۆشش لە پێناوی چەسپاندنی بونیاد دادەنێت، نەك لە پێناوی بوون. چونکە باشترین و ئایدیایی ترین بونیاد ئەوەیە کە توانای مانەوە و بەردەوامبوونی تێدا هەیە. هەروەها لە رێی گەشەسەندن و پەرەسەندنی بونیادی کۆمەلایەتییەوە، هاوکاریکردن بەرجەستە دەبێت، کە ئەمەیش بە گرنگترین پرەنسیپی ئەو کۆڵەگانەیە کە یارمەتی مانەوەی بونیادەکە دەدەن. چونکە هاوکاریکردن ئەو هێزەیە کە پارێزگاری لە بونیادەکە دەکات و دامەزراوەکانی دیاری دەکات. بەهۆی ئەم پرەنسیپەوە فاکتەرە دژەکانی ناو سروشت بەم نەسەقە، یەکدەگرن: پێکدادان" التصادم"،ململانێ، شەڕانگێزی، بەرهەڵستکاری، دژیەکی، رکابەری، کارلێکردن، هاوکاریکردن، رێکخستن.

بەو پێیەی کە هاوکاریکردن یەکێکە لە پرۆسەکانی پەرەسەندنی سیستەمی کۆمەلایەتی، دوای ئەو قۆناغە بەرجەستە دەبێت کە "وۆرد" ناوی ناوە جیابوونەوەی کۆمەلایەتی، ئەم پرۆسەیەش تا رادەیەکی زۆر لەوە دەچێت کە لە زانستە کیمیاییەکاندا پێیدەوترێت، پرۆسەی پیتاندن. پرۆسەی هاوکاریکردن بە هۆی پەیوەندی و تێکەلاوبوون و لێکچوون لە نێوان گرووپە کۆمەلایەتییە جیاجیاکاندا دەچەسپێت."وۆرد" پێی وایە کە هەموو ئەو قۆناغانەی پێشتر باسمانکردن دەبێتە هۆی دامەزراندنی دەوڵەتی هارمۆنی. هەروەها لێرەدا "وۆرد" لەگەڵ تیۆرییەکەی"راتزنهۆفەر—Ratzenhofer—و جمبلۆفیچ—Gumplowicz— کۆکە کە پەیوەندیدارە بە خەباتی گەلان و کۆمەڵە کۆمەلایەتییەکانەوە، بەو پێیەی کە خەبات فاکتەری سەرەکییە بۆ دامەزراندنی دەوڵەت. هەرچی داینامیکای کۆمەلایەتییە ئەوا

بایەخ دەدات بە پێشکەوتنی کۆمەلآیەتی ، یان ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە بونیادی کۆمەلآیەتی کۆمەلگادا روو دەدەن(١٢). دایناميکای کۆمەلآیەتی سێ پرەنسیپی سەرەکی بە خۆوە دەگرێت: جیاوازی لە کۆشش، داهێنان, هەروەها حەز یان ئارەزوو. جیاوازی لە کۆشش لە ناو کەلتووره جیاوازەکانی یەك کۆمەلگادا دەردەکەوێ کە بەرهەمی لێکچوون و تێکەلآوبوونە. چونکە پێشکەوتن بەهۆی تێکەلآوبوونی توخمەکانی دیکەوە دێتە کایەوە. داهێنان بۆ دەوڵەمەندبوونی سروشت دەگەڕێتەوە. ئارەزووش ئەو کۆششە کۆمەلآیەتییەیە کە لە هەموو دەسکەوتەکانەوە لەدایك دەبێت و ئەم دەسکەوتانەش دەبنە تێرکردنی ئارەزوو، ژیان دۆستی، گونجان لەگەڵ ژینگەدا.

"وۆرد" هێزە کۆمەلآیەتییەکان لە چوارچێوەی پاراستنی پەرەسەندنی چلۆنایەتیدا پۆلین دەکات(١٣). بە هۆی گەڕانی بە دوای هێزە کاریگەرەکانی پەرەسەندندا گەیشتە تیۆرییە بەناوبانگەکەی دەربارەی سەروەری ئافرەتGynecocracy، کە تیایدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە مێینە بنچینەی دروستبوونی مرۆڤە لە گەردووونداو، بایەخێکی یەکجار زۆری هەبوو بەر لەوەی فشارگەلی کۆمەلآیەتی بەسەردا بسەپێنرێت، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە پیاو پەیوەندی خۆی بە منداڵەوە زانی(١٤).

لەو کاتەی کە "وۆرد" هێزە کۆمەلآیەتییەکانی ناساندووە، چەند گریمانەو پێشنیارێکی سەرەکی داناوە، تێیاندا جەخت لەسەر گرنگی کۆنترۆلکردنی ئەم وزەیە دەکات لە پێناوی پەرەسەندندا. ئەو پێی وایە دوو رێگا بۆ کۆنترۆڵ هەیە: نەستە کۆنترۆڵکردن لە لایەن سروشتەوە، کە لە هەناوی بنەچەی دروستبوونداو، هەستە ئاراستەکردن یان پەی پێبردنی عەقڵی(١٥). ئەمەی دووەمیان لە نەستە کۆنترۆڵی سروشت، سەرکەوتووترە. چونکە هەندێجار سروشت زیادەڕۆیی دەکات لەوەدا کە بڕێکی یەکجار زۆر کەرەستەی سەرەتایی دەبەخشێت بە مرۆڤو، لێی دەگەڕێ لە رێی هەڵبژاردنی سروشتییەوە پەرەیان پێبدات، ئینجا عەقڵ بەرەو کارهەڵسورێنەری و گونجاندنی ئامرازەکان لە پێناوی ئامانجەکاندا دەکارێ.

کۆنترۆڵکردنی هێزە سروشتییەکان کە دەبێتە هۆی پەرەسەندنی دەوڵەت، گرنگترین هەنگاوە کە مرۆڤ یان گشت کۆمەلگا ناویەتی(١٦). بەهەر حاڵ دەوڵەت ئەو

ئامرازە گرنگەیە کە ئیرادەگەرییانە پرۆسە کۆمەلایەتییەکان کۆنترۆڵ دەکات، چونکە کۆمەڵگا ئەم پرۆسەی پێناکرێت تا نەگاتە ئاستێکی مەعریفی گونجاو دەربارەی ئەو ژینگەیەی تێدایە-سروشت-و چۆنێتی بەڕێوەبردن و کۆنترۆڵکردنی پرۆسە کۆمەلأیەتییەکان. بەو پێیە بڕیاردان لەسەر سیستمێکی فێرکاری کە مەعریفە بلأو بکاتەوە، بەمەرجێکی گرنگ دادەنرێت بۆ پەرەسەندن لە شێوە ئایدیاییەکەیدا(١٧).

دەکرێ بە کورتی بڵێین، بەشدارییەکانی "وۆرد" لە کۆمەڵناسیدا، لەوێوەیە کە ئەو لە زانینی پەیوەندی نێوان گەردوون و پەرەسەندنی کۆمەلأیەتی زانیوەو، تیۆرییەکیشی هەبووە دەربارەی بەرزبوونەوەی وشیارە هەست بەسەر نەستەوەو، رۆڵی لە کۆنترۆڵکردنی پرۆسە کۆمەلأیەتییەکاندا. دەرککردنی ئەو بە سروشتی گەردوون و عەقڵ یارمەتییان داوە کە لەم بوارەدا لە کۆمەڵناسەکانی دیکە سەرکەوتووتربێت(١٨). پرۆفیسۆر جیدنجزGiddingz کورتەیەکی روون بۆ ئەم لایەنەی رایەکانی "وۆرد" پێشکەشدەکات:

"...لە هەموو کارەکانی "وۆرد"دا کۆمەڵگای مرۆیی تەوەری سەرەکییە کە هەموو توێژینەوەو گفتوگۆکانی پێی لەسەر دادەگرن. ئەو کۆمەڵگایە کە ئێمە بەشێکین لێی و تێدا دەژین و پەی بە هەموو بونیادو کۆڵەگەکانی دەبەین، بەرهەمی نەستە هێزەکان نییە، بەڵکو بە پێی یاسای گەردوونەوە هاتووەتە کایەوە، ئەمە بۆ عەقڵی مرۆڤیش راستە کە پڕە لە مەعریفەو دەتوانێ ژینگەی کۆمەلأیەتی بگونجێنێت، بە هۆی بەهرە هزرییەکانیشیەوە، ئەم زەینە توانستەی گۆڕی بۆ ئامرازی وەدیهێنانی ئیرادەو ئارەزووەکانی مرۆڤ. هەروەها بە حیکمەتی عەقڵ‌و بە پەنابردن بۆ مەعریفەی زانستی کە خۆی لە خۆیدا بەرهەمی خودی توانستەکانیەتی، مرۆڤ توانی توانستە عەقڵییەکانی خۆی بەکار بێنێت. نابێت فێرکردن تەنیا لە کەوی و ماڵیکردنی عەقڵدا قەتیس بکرێت، بەڵکو دەبێت هەمیشە مەعریفەی زانستی بە عەقڵ ببەخشرێت، عەقڵیش ئەو مەعرفەیەی بۆ دەسکەوتی مادی و مەعنەوی لە بەرژەوەندی مرۆڤایەتیدا، وەردەگێڕێ. ئەم هزرە مەزنە کە "وۆرد" پێی گەیشت، هزرێکی پرشنگدار بوو، پێویستی بە شیکاری

و راڤەکردن نییە، هەر عەقڵێکی مرۆیی لە لاپەڕەکانی قووڵبووبێتەوە، سوودی لێوەرگرتووە، هزرێکە هیچ نووسەرێکی کۆن یان نوێ نەیوێراوە هزری وا بدات، هەمیشە جێگیرو بەهێز دەمێنێتەوەو، بەشدارییەکە لە کۆمەڵناسیدا، هاوتای نییە(١٩).

دووەم:

بەشدارییە نەوعییەکانی لە تیۆریی سیاسیو کۆمەڵایەتیدا

١- پەیوەندی کۆمەڵناسی بە زانستە سیاسییەکانی دیکەوە:

ئەو چەمکەی"وۆرد" دەربارەی پەیوەندی نێوان کۆمەڵناسیو زانستە سیاسییەکان دروستی کردووە، لە میانەی پەیوەندی گشتی نێوان کۆمەڵناسیو هەندێ لە زانستە کۆمەڵایەتییە تایبەتەکانی دیکەوە، روونە. زانستە کۆمەڵایەتییە تایبەتەکان زەمینە و داتای پێویست وەکو بنەمایەکی پتەو بۆ تیۆرییەکانی کۆمەڵناسی دابیندەکەن. زانستە سیاسییەکان، یەکێکە لەو زانستانەی لە چارەسەرکردنی گرفتە سیاسییەکاندا، سوودیان بۆ کۆمەڵناسی هەبووە. ئەم دەقە تێڕوانینی "وۆرد" دەربارەی پەیوەندی نێوان کۆمەڵناسی و زانستە کۆمەڵایەتییە تایبەتەکان، روونبدەکاتەوە:

....لەوانەیە بەس نەبێت کە بڵێین، ئەم زانستانە-زانستە کۆمەڵایەتییە تایبەتەکان- تێکەڵەی کۆی زانستەکانی دیکەن، بۆیە ئەو بەرهەمی بنچینەکەیە، یان بنچینەی زانستەکانە. زانستە کۆمەڵایەتییە تایبەتەکان، کۆی ئەو یەکانەن کە بە شێوەیەکی ئۆرگانی پێکەوەلکاون و، ئەوەیان پێکهێناوە کە پێدەوترێت کۆمەڵناسی، بەلام ئەم زانستانە بەهۆی ئەم پێکەوە لکانە، خۆییتیو سەربەخۆییان لەدەستدەدن، وەکو ئەوەی لە ناو توخمە کیمیاییەکاندا روو دەدات، بەلام، دەرهاوێشتەکانیان لە هەموو بارودۆخێکدا چوونیەك نین، وەکو توخمە کیمیاییەکانن. ئەمە راستیی زانستە لێکدراوەکانە(العلوم المرکبە)، بەلام کۆمەڵناسی لە پێشەوەی ئەم زنجیرە زانستانەیەو،

بە هۆی مامەڵەکردنی بابەتیانەی لەگەڵ ڕووداوەکاندا، لە هەموویان بەپیت واقیعبین ترە، هەروەها زیادەڕۆیی ناکەین ئەگەر بڵێین کۆمەڵناسی زانستی زانستەکانە.

**ب- پێناسە گشتییەکان و چەمکەکان**

ئەگەر دەربڕینەکەمان راست بێت، جیاکردنەوەی "وۆرد" لە نێوان ئەم زاراوانە: کۆمەڵگا، دەوڵەت، حکوومەت، نەتەوە، جیاکاردنەویەکی نادیارو نادروستە، ئاشکرایە کۆششێکی ئەوتۆی نەکردووە بۆ دیاریکردنی چەمکە زانستە سیاسییەکان، هیچ چەمکێکیشی لەوانەی سەرەوە بە شێوەیەکی چەسپاو لەریتمێکی کامڵدا بەکارنەهێناوە، یاخود پێناسەیەکی قبووڵکراو مەنتیقی، بۆ نەکردوون.

وۆرد زاراوەی کۆمەڵگا وەکو زاراوەیەکی گشتی بۆ ژیانی هاوبەش و وەسف کردنی نموونە پێشکەوتووەکانی یەکگرتنە کۆمەڵایەتییەکان بەکاردێنێ. پێیوایە کە دیارکردنی جیاوازی لە نێوان دەوڵەت و حکوومەت و نەتەوە، شتێکی سەرەکی نییە. ئەمەش لەوە روون دەبێتەوە کە دەڵێ: "ئەگەر هاتو هەر کەسێك نارەزایی خۆی دەربارەی بەکاربردنی وشەی(حکوومەت)دەربڕی، ناوەکە گرنگ نییە، چونکە هۆیەك نییە رێبگرێت لە گۆڕینی وشەی نەتەوە یان دەوڵەت بە وشەیەکی دیکە، بایەخپێدان و نەدانی بۆ بەکارهێنانی ئەو چەمکانەی کە وەسفی رێکخستنی سیاسیی کۆمەڵگای پێدەکات، قبووڵکراو بێت یاخود نا، ئەمە لەوەوە هاتووە کە ئەو کەسە ئەوەی پێ گرنگ نییە(٢٠).

"وۆرد" بەبەردەوامی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە دەوڵەت و حکوومەت، بە شێوەیەکی رەها، گرنگترین سیستەمی کۆمەڵایەتین. هەروەها جەخت لە سەر بەهای چوونیەکی ئۆرگانی دەکات کە دەوڵەت بە دابینکەری ئەندامی کۆمەڵایەتی(کۆمەڵگا) دادەنێت. دەقی داهاتوو هەرچەندە رۆحی هیگڵ بە خۆوە دەگرێت، بەڵام بە گرنگترن دەق دادەنرێت کە تێگەیشتنی "وۆرد" لە چەمکی دەوڵەت دەگەیەنێت:

"...مەبەست و ئامانج لە دەوڵەت دەستەبەرکردنی خۆشگوزەرانی و سەرفرازییە بۆ کۆمەڵگاو، رووبەرووبوونەوەی کاردانەوە نێگەتیڤەکانی تاکە. هەروەها لە رێگەی جێبەجێکردنی ئەم کارانەدا، بەمەرجێك کە لەگەڵ مەبەست و ئامانجەکانی کۆمەڵگادا

ناکۆك نەبێت، ئازادی کاری مرۆیی فەراهەم دەکات. دەوڵەت پەیوەستە بەوەی لە هەموو کارو چالاکییەکانی رەچاوی لایەنی ئەخلاقی بکات. هەروەها ئەرکی وەدەستهێنانی دەستکەوتە کۆمەڵایەتیو پیشەسازی و هونەری و، فێرکردن و ئەوچالاکییە زانستییانەی کە دەوڵەت چاودێرییان دەکات، دەکەوێتە ئەستۆی. ئا لێرەوە دەکرێ بڵێین کە هیچ دامەزراوەیەکی دیکە نییە بگاتە ئاستی دەوڵەت، بەمەش دەوڵەت گرنگترین دامەزراوەی کۆمەڵایەتیو مرۆییە"(٢١).

"وۆرد" لە بابەتی سەروەریدا Sovereignty . خۆی رووبەرووی گفتوگۆیەکی سەرەکی نەکردەوە ئازادیشی بەو هێزە پێناسە کردووە کە لە ژێر دەسەڵاتی ئارەزوودا کار دەکات(٢٢)، چونکە خۆشەویستیی ئازادی لای رەگەزی مرۆیی هەمیشە غەریزی و جیهانی بووەو هەر واش دەمێنێت. هەروەها لە لایەنی تیۆرییەوە حکوومەت بە دوژمنی سەرسەختی ئازادی دادەنرێت، کەچی لە راستیداو لە میانی لێکۆڵینەوەی فایلەکانی، بە رەچاوکردنی ئەوەی هەر پاڵپەستۆیەك بۆ مرۆڤ بکرێت وای لێدەکات، بەبێ سێ و دوو سوورتر بێت لە وەدەستهێنانی ئازادی، دەردەکەوێ، دەوڵەت هاریکاری مرۆڤی کردووە کە بە ئاسانی دەستبەرداری ئازادییەکەی نەبێت. بەڵام چ جۆرە ئازادییەك؟ ئەو ئازادییەی پشت بە عەقڵ دەبەستێت نەك بە نەزانی و هەڵچوون. لەداهاتووشدا، ئازادی لەسەر بنچینەی حووکمی عەقڵو پەیوەندی مرۆڤ بەو کۆمەڵگایەی لێی دەژی، دەوەستێت و ئەوەی لەبەرچاو مرۆڤ دەبێت کە نابێ ئازادی بە هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگا بشکێتەوە.

"وۆرد" شیکردنەوەی بۆ پارتە سیاسییەکان بە تیۆریی میکانیکای کۆمەڵایەتی بەستەوە. پرەنسیپی سەرەکیی شیکردنەوەکەی کە پەیوەستە بە ململانێی نێوان پارتە جیاجیاکاندا(هاریکاری کۆمەڵایەتییە). لەراستیدا، دژایەتی پارتێتی، جۆرێك لە هاریکاری لە نێوان هێزە خۆنەیستەکاندا دێنێتە کایەوەو، گەرەنتیی هاوپەیمانێتی ئەم هێزانە بەرەو ئامانجێك دەبات، لەوانەیە ئامانجەکەش دیارکراو یان مەبەستداریش نەبێت.

کارلێکردنی توند لە نێوان هەردوو هێزی ململانێ و خەبات دەبێتە هۆی گۆڕینی هێز بۆ وزە، وزەش بۆ دەسەلات، ئەمیش بە نۆرەی خۆی رۆلی لە بونیاتنانی پێکهاتە کۆمەلأیەتی‌و سیاسییەکان دەبێت. پاشان دوای تەواوبوونی بونیادەکانیان، هەمان ئەو فاکتەرانە دەیانگۆڕن، ئەمیش ئەو پرۆسەیەیە کە دەبێتە مایەی داهێنانی جۆرێك لە پێشکەوتن. سیستەمە سیاسییەکان بەرهەمی هاریکاریی سیاسین، هەر ئەوانیش، واتا سیستەمە سیاسییەکان، پشت بە هەیئەتە تەشریعییەکان دەبەستێت، کە یەکەکانی سەر بە پارتە سیاسییەکانیش دەگرێتەوە(٢٣).

بەهەمان شێوە، ململانێی نێوان کۆمەلە و رەگەزەکان، دەبێتە مایەی دروستبوونی دەولەت، هەروەها ململانێی نێوان پارتە سیاسییەکانی ناو یەك دەولەت دەبێتە مایەی گۆڕینی ئەو دەولەتە و تەنانەت هەندێك جار پێشکەوتنی کۆمەلأیەتی وەدەست دێنی. پارتەسیاسییەکان زۆر جار گرنگی بە لایەنە پێکهاتەکان دەدەن لەسەر حیسابی لایەنەکانی دیکە، بۆ نموونە لایەنی هونەریی‌و، وەکو پرسی سیاسی مامەلەیان لەگەلدا دەکات. پارتیە ئازادەکان و پارتیە پێشکەوتووخوزان لەو پارتانەن کە بەتوندی پشتگیری چالاکیی حکوومەت دەکەن، گەرچی لەهەموو پارتەکانی دیکە زیاتر پالپشتی ئازادی تاکە کەس دەکەن. "وۆرد" لەسەر زاری "سپنسەر"ەوە دەلێ:چەرخی کۆیلایەتی سەرلەنوێ گەڕایەوە"، ئەمیش بە هۆی ئەوەوە کەسەرچاوەگرتن لە پرەنسیپی ئازادی کارکردن و زالبوونی پارتی سەرمایەداری بەسەر سیستمی سیاسییەوە، چینی دەولەمەندان کۆنترۆلی چارەنووسی کۆمەلگای کردووە. ئەم بارەش وای لە پارتە پێشکەوتووخوازەکان کرد، لە پێناو دروستکردنی هێزێکی ئامادە لە دژی کۆیلایەتی‌و ئیستیغلال، بانگەشەی یەکخستنی کۆششەکان بکەن.

**ج-بنچینەی دەولەت و کۆمەلگا و قۆناغەکانی پەرەسەندنی سیاسی:**

"سمۆل" بە لێهاتووییەوە تێبینی ئەوەی کرد کە "وۆرد"هزری کۆمەلأیەتی خۆی گۆڕیوە، کەچی ئەم گۆڕینە زۆر درەنگ هات، واتە لە ماوەی نێوان چاپکردنی کتێبی" داینامیکای کۆمەلناسی"و مردنی، بەلأم ئەم گۆڕینە، تیۆرییەکەی لە بارەی بنچینەی

دەوڵەت ناگرێتەوە. ئەم تیۆرییەش لە دووتوێی هەمان کتێبدا بە شیوەیەکی نادیار و بە پێچ و پەنا هاتووە، تیۆرییەکە کۆکردنەوەیەکە لە نێوان رایەکانی "هۆبز"-Hobbes- دەربارەی باری خۆرسکی پێش قۆناغی کۆمەلایەتی و تێگەیشتنی "رۆسۆ"-Rousseau- دەربارەی بنەمای دامەزراندنی دەوڵەت لە رێگەی تاکە بەهێزەکانەوە(٢٤).

"وۆرد" وای بۆ چووە کە پەرەسەندنی کۆمەلایەتی بە چوار قۆناغدا تێدەپەرێت: قۆناغی یەکەم، قۆناغی سەروەری رەها-Autocratic stage-ئەو قۆناغەیە کە تیایدا تاک بە دوورەپەرێزی سیاسیو کۆمەلایەتی ژیاوە، کە پێدەوترێت قۆناغی ناکۆمەلایەتی. قۆناغی دووەم لە قۆناغەکانی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی، قۆناغی ئاژاوە(ئانارشی-Anarchic stage)، لەم قۆناغەدا بە هۆی زاوزێی سروشتییانەوە، قەبارەی کۆمەڵە کۆمەلایەتییەکان گەورەبووە. ئەم کۆمەلانە، بە ئازادی کارکردنیشەوە، لە ئازادییەکی رەهادا دەژیان، چونکە هیچ جۆرە رێکخستنێکیسیاسییان نەدەزانی. هەرچی قۆناغی سێیەمە، ئەوا قۆناغی نەتەوە یاخود هۆزە، لەم قۆناغەدا و بۆ یەکەمین جار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، حکومەت بە شێوە سادەکەی پەیدا بووە. هەروەها لە میانەی جەنگەکانی نێوان کۆمەڵەکاندا، کۆمەڵگا سیاسیە گەورەکان دامەزران، ئەمیش بووە هۆی پەیدابوونی قۆناغی چوارەم و کۆتایی لە قۆناغەکانی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی کە" وۆرد" ناونیشانی قۆناغی نێونەتەوەیی یان جیهانی (کۆزمۆپۆلیتان-Cosmopolitan)ی لێدەنێت، ئا لەم قۆناغەدا تاک لە کینە نێوخۆییو نەتەوەییەکان رزگار دەبێت و کاملبوونی کۆمەلایەتی -Social Intigration- وەدەست دێنێت کە دەوڵەتی جیهانی لێدەکەوێتەوە.

لە کتێبەکەیدا"دانامیکای کۆمەڵناسی"وۆرد" بنچینەی دەوڵەتی نیشانداوە، لەو تیۆرییەوە دەستی پێکردووە کە پەیوەستە بە سروشتی ناکۆمەلایەتی مرۆڤی سەرەتایی. هەروەها گۆشەنیگا تەقلیدییەکەی فەیلەسووف"ئەریستۆ—Aristotileی رەت کردووەتەوە کە دەڵێ مرۆڤ خۆرسکانە کۆمەلایەتییە. کاتێك کە ئارەزووەکانی مرۆڤی سەرەتایی زۆرو هەمەجۆر بوونەو ئامرازەکانی تێرکردنیان فرە سنووردار بوون،

وایلێکردووە لە بۆشاییەکدا بژیو کێشەو ململانێ بنێتەوە،کۆمەڵگاش سیستەمێکی تایبەتی نەبووە، تا ئەو کاتەی سیستەمی سیاسی پەرەی سەندو ئەرکی کۆنترۆڵکردن‌و پاراستنی بە خۆوە گرت. پاشان بە بوونی کۆمەڵگا حکوومەتیش پەیدا بوو، بەڵام مرۆڤ، گەرچی لە دۆخێکی ئانارشی سیاسیدا دەژیا، لە پێشی ئەوان -کۆمەڵگاو حکوومەت- هەر هەبووە. حکوومەت لە رێگای هەندێك دەستپێشخەری تاکە کەسانەوە دامەزراوە، ئەو کەسانە بە جۆرێك زیرەك و خودانی عەقڵی سەنگین بوون، مەبستیان بووە هێزو دەسەڵاتی کۆمەلایەتی‌و سیاسی وەدەست بێنن، گوایە بۆ ئەو مەبەستە هاتوون کە لاوازەکان بپارێزن و ستەمیان لەسەر لابەرن. کەچی ئامانجی شاراوەی ئەوان فرەوانکردنی دەسەڵاتی سیاسی خۆیان بووە(٢٥). بەهۆی زۆرزانی‌و چەوساندنەوە کە رەگیان لە ناو دەسەڵاتی سیاسیدا داکوتاوە، مرۆڤ نەیتوانی لەو لێکەوتەو قورساییانە خۆی رزگار بکات کە حکوومەت بەسەریدا دەسەپێنێت. بەڵام ئەو بەدکارییانەی هاوشانی پەرسەندنی حکوومەت بوونە، دەرهاوێشتەی جێبەجێکردنی پرەنسیپەکانی کۆنترۆڵی سیاسی نەبوون، بەڵکو بەرهەمی ئەو پرنسیپە بووە کە حکوومەتی عەقلانی رەتدەکاتەوە، ئەمیش پرەنسیپێکە خۆدی مرۆڤ بەرجەستەی کردووە.

لە ماوەی نێوان بە چاپگەیاندنی هەردوو کتێبەکەی (داینامیکای کۆمەڵناسی)و(کۆمەڵناسی تەجریدی)، "وۆرد"ئاشنای تیۆرییەکانی"فیرجسۆن"-Furgson-"سپنسەر"-Spencer- "پاگووت"-Paggehot-"گمبلۆفیچ"-"Gumplowicz-راتزنهۆفەر"-Ratzenhofer-بووە ، هەروەها پاڵپشتی ئەو بیرۆکەیەی کردووە کە پێی وایە هەر لە بنچینەدا دەوڵەت بەهۆی پرۆسەی ململانێی نێوان کۆمەڵە کۆمەلایەتییەکانەوەو تێکەلاوبوون و لێکچوونەوە، هاتۆتە کایەوە. لەم بارەیەوە دەڵێ: ئەم بیرۆکەیە رێگەخۆشکەر بوو بۆ پەیدابوونی تیۆرییەکی زانستی تەواو دەربارەی بنچینەو پێکهاتەی راستەقینەی دەوڵەت، بەمەش ئەم تیۆرییە هەموو بیروڕایە کۆنەکانی لەناو بردو بێ‌مانای کردن، هەر کارێکیش پشت بەم تیۆرییە نەبەستێت، کارێکی رووکەشی بێ بەهایە(٢٦).

د-شێوەکانی حکوومەت:

"وۆرد" لە چوارچێوەی پۆلینی گشتیی شێوەکانی حکوومەت، سێ چەمکی پێشنیار کردووە: ئۆتۆکراسیAutocracy، ئەریستۆکراسی AristocracyدیمۆکراسیDimocracy. پۆلینە گشتییەکەی دیمۆکراسی سێ جۆری بە خۆوە گرتووە:حکوومەتی فیزیۆکراسیPhysiocracy، حکوومەتی دەوڵەمەندەکان Plutocracy، حکوومەتی گەلsociocracy. فیزیۆکراسی ئەو جۆرە حکوومەتەیە کە بەهۆی (ئادام سمیسA.Smith)وفیزۆکراسەکان و ئەوانەی بانگەشەی تاکگەراییان دەکرد وەکو"سپنسەر"و"ولیلهم همبۆڵت"ەوە لە ئەوروپادا پەیدابوو و گەشەی سەند، ئەم حکوومەتە بڕیاری پرەنسیپی ئازادی کاری دا، بەڵام لەسەر بنەمای فەلسەفەیەکی سیاسیی هەڵە دامەزرا بوو.

هەرچی حکوومەتی چینی دەوڵەمەندەکانە، ئەوا درێژەپێدراو و دەسکاریکراوی حکوومەتی فیزیۆکراسییە لە سەدەی نۆزدەمدا، ئەوەبوو گەندەڵی سەرمایەداریی تەشەنەی کردبوو ، ئەم توێژە بە مەبەستی پارێزگاریکردن لە باری ستەمکاریی چینی خۆیان، فەلسەفەی تاکگەرایی سیاسییان بەکارهێنا. ئەم فەلسەفەیە، تاکەکانی کۆمەڵگای هاندا، داوا لە حکوومەت بکەن، چالاکییەکانی چڕ نەکاتەوە تاوەکو ئەم توێژە بەردەوام دەست بەسەر چالاکییە ئابوورییەکاندا بگرێ بۆ بەرژەوەندی خۆی و سامانەکانی کۆمەڵگا بۆ خۆی قۆرخ بکات. سەد ساڵەو تا هەنووکەش ئا بەمجۆرە تاک لە رێ لایداوەو بۆتە یەکێکیش لە خەسڵەتەکانی سیستەم و تیۆری سیاسی. حکوومەتی گەلیش قۆناغە مەنتیقییەکەی پەرەسەندنی سیاسییە، لە راستیدا، ئەمەیان دیمۆکراسیی راستەقینەیە. تیایدا کۆمەڵگا لە پێناو بەرژەوەندی گشتیدا حوکمڕانی دەکات و هەموو جۆرە بەرژەوەندییەکی تاکە کەسیو کۆمەڵەو پارتە سیاسییەکان، لە نێو دەبات، چونکە کۆمەڵگا لەسەریەتی ژیرو هەستیارانە رەفتار بکات، چارەنووس و بەرژەوندی خۆی دیارییبکات. ئا ئەمە ئەو قۆناغەیە کە بەسەروبەندی رۆشنگەرایی(التنویر) دەناسرێت(٢٧). کۆمەڵگا لە سایەی ئەم جۆرە حوکمڕانییەدا

دەتوانێت بەخۆیدا بچێتەوە و هەموو ئە شتانەی بەژیانییەوە پەیوەستن، بەبێ ترس و جیاکاری و سازشکاری، راست بکاتەوەو هەوڵی لابردنی لەمپەرەکانی سەر رێگای بدات، بۆ پەرەپێدانی تواناکانیو پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندییەکانی، هەموو هەوڵێك وەگەڕ بخات(٢٨).

**هـ-ئەرکەکانی دەوڵەت:**

"وۆرد"لە تیۆرییەکانیدا باسی ئەرك و چالاکییەکانی دەوڵەتی کردووە و رایەکانی"سپنسەر" دەربارەی ئازادیی کارکردنی تاك بەتوندی رەت دەکاتەوە(٢٩). لەراستیدا ، گۆشەنیگاکانی "وۆرد" لەم بارەوە، گرنگترین لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی تیۆرییەکانی بوون و تارادەیەکی بەرچاو باوەڕهێنەر (مقنع) بوون. "وۆرد" لە بیرمەند و نووسەرەکانی دیکە بەوە جیا دەکرێتەوە کە زۆر بە توندی رەخنەی لەو لادانانە گرتووە کە لە ناو سیستەمە سیاسییە هاوچەرخەکاندا بەرجەستەن، ئەو هەمیشە جیاوازی لە نێوان دامەزراوەی حکوومەت و کارە دزێوەکانی دەکرد، هەمان ئەو کارانەی کە"وۆرد" بە بێ سنوور دەیبێزراندن، لەگەڵ ئەمەشدا، ئەو نائومێد نەبوو لەوەی کە حکوومەت ئامرازێکی کاریگەرە بۆ چاکسازی کۆمەڵایەتی بەمەرجێك، لەسەر بنچینەی زانستی دامەزرابێتو توخمە گەندەڵەکان و بیرە گێلەکانی وەلاوە نابێت.

"وۆرد" چوار ئەرکی بنەڕەتی داناوە: فشار، پاراستن، دابینکردنی کەرەستەکانی خۆشگوزەرانی و چاکترکردنی باری کۆمەڵگا(٣٠). لە هیچ کاتێدا ئەرکی یەکەم رەوا (الشرعية)نەبووە، هەرچی ئەوەی دووەمە ، ئەوا ئەرکێکی گرینگە ، گەر هەندێك وازیان لە ئازاردانی هەندێکی دیکە نەهێنا. بە گوێرەی ئەرکی سێیەم ئەوا حکوومەت نابێ هەرگیز دەستبەرداری ببێ. ئەرکی چوارەمیش کە لە هەموو ئەوانی دیکە گرینگترە، ئەوە ، بە دەگمەن نەبێت، تا ئێستا جێبەجێ نەکراوە.

مەرج نییە هەموو جارێ فشاری حکوومەت بۆ هاولاتییان بە ئامانجی بەرژەوەندی ئەوان بێت، بەڵکو پتر لە بەرژەوەندی چینی فەرمانڕەواو بالادەست دەبێت، بۆ ئەوەی بتوانێت بەبەردەوامی هاولاتییان بۆ بەرژەوەندی خۆی بچەوسێنێتەوە. کەوابێ کۆمەڵگا

تا کەی دەستەوەستان دەوەستێت، کە نەتوانێت سنوورێك بۆ ئەم کارەی حکوومەت دابنێ؟ ئەم کارە پێویستی بە زیاتر ئاگاییو پەی پێبردنی کۆمەلآیەتی هەیە."وۆرد" پێیوایە کە ئەرکی پاراستن، ئەرکی پۆلیسە، چۆن ئەو دەتوانێت رێگە لە توند و تیژی و فرتو فێلٚ بگرێت. کۆمەلٚگاش ناتوانێت لەم شتانە رزگاری ببێت تەنیا بە زیاتر کردنی ئاگاییو ئیدراکی کۆمەلآیەتی و پەرەسەندنی بزووتنەوەی رۆشنگەریی. جا ئەرکی چاکترکردنی ژیانی تاکەکانی کۆمەلٚگا، ئەوە ئەرکێکە حکوومەت ناتوانێت نەیکا.

کاتێك کە مرۆڤ لە توانایدا نەبێت، لە هەموو شوێن و کاتێکدا هەبێت، هەموو بەش و وردەکارییەکانی مەعریفە بزانێت و دەسەلآتی دەسەبەرکردنی تەواوی پێداویستییەکانی هەموو تاکەکانی کۆمەلٚگای نەبێت، هەروەها دەکرێ شارەزایی و هێزو لیهاتوویی تایبەتی نەبێت کە بتوانێت لەگەلٚ پێداویستییەکانی کەسانی دیکەدا مامەلٚە بکات، کەوابێ خۆی و سەرجەمی تاکەکانی دیکەی کۆمەلٚگا پێویستییان بە ئامرازێکی رێکخراو هەیە، بتوانێت بۆ فەراهەمکردنی پێویستییەکانیان و هەلٚسوراندنی هەموو شتە پەیوەستدارەکانی دیکەی ژیانی کۆمەلآیەتی، نوێنەرایەتیان بکات(٣١). هەرچەندە حکوومەت کارەکانی فشارو پاراستن و فەراهەمکردنی هۆیەکانی حەسانەوە، جێبەجێ دەکات، بەلآم، هێشتا نەیتوانیوە راستەوخۆ پێشکەوتن وەدەستبێنێ، لەگەلٚ ئەمەشدا، بوونی حکوومەت مەرجێکی سەرەکییە بۆ وەدیهێنانی هەموو جۆرەکانی پێشکەوتن. حکوومەت دەتوانێت رەوشی کۆمەلآیەتی کۆمەلٚگا چاکتر بکات گەر هاتوو یاسادانەرەکانی شارەزاییان لە زانستە کۆمەلآیەتییەکان هەبوو. بۆیە هیچ حکوومەتێك نییە کە لە سەر بنەمای زانستی دامەزرابێت، یان توانای پێشخستنی ئەدای وەزیفی خۆی بکات تەنیا ئەو کاتە نەبێ کە یاسادانەرەکانی(المشرعون) ئاشنای مەعریفەی زانستیی سروشتی شتەکان و شارەزای ئامرازەکانی کۆنترۆلٚکردنی هێزە کۆمەلآیەتییەکان بن. بە هەمان رێگە کە سروشتناس دەتوانێ لە رێی مەعریفەی زانستی و چۆنێتی کۆنترۆلٚکردنی یاساکانەوە بۆ خزمەتکردنی تەکنۆلۆژیا، بەکاریان بهێنێ(٣٢). "وۆرد" وەکو ئامرازێکی کاریگەر بۆ وەدیهێنانی پێشکەوتن لە کۆمەلٚگادا وەسفی

حکوومەت دەکات، لە داکۆکیکردنیدا لە حکوومەت، بە پلەی یەکەم پشت ئەستوورە بە جیاکردنەوەی حکوومەتی وشیار و دروست، لەو کارە لادەرانەی کە لە رابوردوودا کردوونی یان لە ئایندەدا ئەنجامیان دەدا، هەروەها بنچینەی بوونی حکوومەت دەگەڕێنێتەوە بۆ دیاردەکانی چەوسانەوە کە لە کۆمەڵگادا باون و فەرمانڕەوایان چەسپاندوویانن. حکوومەتی عەقڵانی، ئەوحکوومەتەیە کە کار لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی و خزمەتکردنی ئەو زۆرینە خەڵکەی کۆمەڵگادا دەکات کە نازانن کەسانی دیکە بچەوسێننەوەو کۆنترۆڵی بەرژەوەندییەکانیان بکەن بەو پێیە دەبێ حکوومەت بە چاوی توێژەر چۆن دەڕوانێتە بابەتی لێکۆڵینەوەکەی، بەو چاوە تەماشای هاولاتییانی خۆی بکات و دەبێ هاولاتییانیش وکو گەورەیەك کە بەرژەوەندیەکانیان دەپارێزێت لە حکوومەت بڕوانن. هەروەها دەبێ حکوومەت بەبەردەوامی دام و دەزگا ئیدارییەکانی خۆی پاکژ بکاتەوە، ئەوانیش(دامو دەزگا ئیدارییەکان) دەبێ ئەوەیان لە بەرچاو بێت، کە بوونیان لە پێناو خزمەتکردنی خەڵکی دیکەدایە، بۆیە دەبێ بزانن قورسایی رێز گرتن لەئەرکەکانیان دەکەوێتە ئەستۆیان. حکوومەتی نموونەیی ئەو حکوومەتەیە کە بە پێی توانای خۆی، هەوڵدەدات مەودای نێوان خۆی و هاولاتییانی کەم بکاتەوەو، دەبێ ئەوە لەبەچاو بگرێت کە ئەو تەنیا ئامرازی خزمەتکردنی گەلەو، گەل خۆی سەرچاوەی دەسەلاتە. بۆیە، بۆ ئەوەی خۆی لە پلەیەکی بالای کامڵبوون راگرێت، دەبێ ئەو هەلە بۆ هاولاتیان بڕەخسێنی کە سروشتی شتەکان بزانن و جێگای متمانەیان بێتو تواناکانی بەڕێوەبردنێکی نموونەییان تێدا برەوپێبدا.

لە وتارێکدا بە ناونیشانی(هزرە هەڵەکانی حکوومەت)، "وۆرد" ئەنجامە نەرێنییەکانی نەتوانینی جیاوازی لە نێوان پرەنسیپە دروستەکان و جێبەجێکردنی کردەییان لە لایەن حکوومەتەوەی، پیشاندا. رووخانی متمانەی خەڵکی بە حکوومەت لە دەوری حووکمی ئیستبدادیدا، کاریگەریی گەورەی خۆی هەبوو، بەلام، دیموکراسیبوونی حکوومەتی ئێستا، ئەو گومانەو هەڵوێستە هەڵەکانی لە دژی ئاراستە و کۆنترۆڵی سیاسی، لابرد. ئەوە بوو ئەم هەڵوێستانە ببون بە هۆی بەشدارینەکردنی زۆر کەس لە

ژیانی گشتی، هەروەها بیرۆکەی ئامانجی راستەقینەی حکوومەتی تێکداو زۆری لە پارتە سیاسییەکان لە دژی حکوومەت بە بانگەشەی بێ سەروبەری، هاندا ، ئەمەیش بە هۆی کاری نابەجێی سەرکردە سیاسییەکانەوە، حکوومەتی خستە حاڵەتێکی وا کەس ئیرەیی پێ نەباو، دواتر حکوومەت نەیتوانی ئەرکی پاراستن جێبەجێ بکات.

دەبێ ئەم هزرە هەڵانە دەربارەی حکوومەت لابرێن، هەروەها دەبێ گەل لە راستیی چەمکی حکوومەت بگاو، هەنگاوی پێویست بۆ لابردنی ئەو زوڵمە بنێو( ئەگەر هەبوو) بەکاری بهێنی بۆ بەرژەوەندی ئەوان(٣٣). لەسەر ئەم بۆچوونانە کە زۆربەی کۆمەڵناسەکان پاڵپشتیان دەکردن، رەخنەی توند لە وۆرد گیرا، سپنسەرو، سمنەرو، جاك نۆفیکۆف، بەم بۆچوونانە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدابوون کە زیان بە حکوومەتەکان بگەیەنن، هەنووکە بەکارهێنانی کۆمەڵگاو سامانەکانی بە باشترین شێواز وادەخوازێ کە حکوومەت دەخاڵەت بکات، هاوکات تاکەکانی کۆمەڵگاش بە جیاوازی ئاستەکانیانەوە پێویستییان بە پاراستنە لە لایەن حکوومەتەوە.

پرەنسیپە سەرەکییەکانی کۆمەڵناسی لای "وۆرد" ئەو تیۆرییانەی تێدایە کە پەیوەستن بە چارەسەرکردنی گرفتە کۆمەڵایەتییەکانەوە لە رێگەی چالاکیی کاری خزمەتگوزاری حکوومەتەوە. بە واتایەکی دیکە، "وۆرد" حکوومەت بەو ئامرازە سەرەکییە دادەنێ کە ئەرکی چارەسەرکردنی ئەم گرفتانەی لە ئەستۆدابێت. هەروەها پێی وایە حکوومەت بەرپرسیارە لە پرۆسە کۆمەڵایەتیسەکان هەر عەقڵی ئەویشە کە دەبێ رووبەرووی پێویستیەکانی کۆمەڵگا ببێتەوە و تا رادەیەکی زۆر بەکاری عەقڵی بەرامبەر ئەندامی کۆمەڵایەتی دەیشوبهێنێ، نەبوونی پەی پێبردنی ئاگایی (الادراك الواعی) لای دەزگاکانی حکوومەت و ، لاوازی چالاکییەکانی، وامان لێدەکات کە باوەڕ بێنین، حکوومەت، رۆژێك لە رۆژان نەیتوانیوە بەڵگەی راستگۆیی و پێگەیشتویی پەیپێبردنی خۆی، بێنێتەوە. کە ئاستی گشتیی هوشیاری کۆمەڵایەتی(الوعی الاجتماعی)پەرەدەستێنێ، ئەوا بە شێوەیەکی رێژەییش لە بەرزبوونەوەی ئاستی مەعریفیی بەرپرسەکانی ئیدارەی حکوومەتدا، رەنگ دەداتەوە (٣٤).

لە کتێبی( فاکتەرە دەروونییەکانی مەدەنیەت)(٣٥) دا"وۆرد" جەخت لەسەر بوونی هەندێك مەرجی بنچینەیی دەکات بۆ ئەوەی حکوومەت بتوانێت ڕووبەڕووی پێویستییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگا ببێتەوە، دەکاتەوە، لەوان، کۆمەڵناسەکان یاسا دابێنێن، یان هیچ نەبێت، یاسادانەرەکان(المشرعون) هاوکارییان بکەن و حکوومەت خۆی لەو یاسایانەی ئێستا رزگار بکات کە پڕیانە لە ناکۆکیو، کۆتاییش بێنی بە شێوازەکانی جێبەجێکردنیان. " وۆرد" پێی وایە ئەمە تەنیا لە ڕێگەی دامەزراندنی سیستمی(لیژنە)ەوە دەبێتو، ڕەوایەتی (شرعیە) بەشداریکردنی دانانی یاساکانیان پێبدرێت و لەم کارەدا، دەبێ حکوومەت هاوکارییان بکاتو هەموو داتاو سەرژمێرییەکان کە بۆ دانانو داڕشتنی یاسا پێویستن، دابین بکات (٣٦).

لە زۆربەی بیروبۆچوونەکانی "وۆرد" کە لە دووتوێی تیۆریو چەمکە سیاسییەکانیدا هاتوون، کاریگەریی کۆمەڵناس (ئۆگست کۆمت)ی پێوە دیارە. "وۆرد" بۆ سەرچاوەی داتاو زانیاری، بە تەواوەتی پشتی بە کۆمەڵناسی بەستووە، بەو پێیەی کە سەرچاوەی سەرەکین بۆ دامەزراندنو پەرەپێدانی حکوومەت، لەسەر بنەما زانستییەکان. ئەو پێی وایە، دەبێ دانەرانی یاسا کۆمەڵناس بن و بۆ شارەزابوون پێویستە رابهێنرێن، هەر وەکو چۆن، لە دەورانی سیستەمی وەزعیدا، کەنیسە، پێش ئەوەی ئەرك بسپێرێ بە پیاوانی ئایینی و قەشەکان، رایدەهێنان و ئامادەی دەکردن. بڵاوبوونەوەی مەعریفەو شارەزایی لە بواری کۆمەڵناسیدا بەر لە دەسپێکی هەر چالاکییەکی بەرهەمهێنەری تایبەت بە تاکەکانی کۆمەڵگاو، پاڵپشت بۆ پرۆسەی چاکسازی کۆمەڵایەتی، کارێکی زۆر گرینگە. بۆیە دەبێ ئەو کەسانەی یاسا دادەنێن شارەزاییەکی تەواویان دەربارەی بنەماو ئاراستەکردن و شێوازەکانی کۆنترۆڵکردنی هێزە کۆمەڵایەتییەکان، هەبێت. لەم سەروبەندەداو بە زمانێکی سادەو بێ پێچ و پەنا، "وۆرد" پاڵپشتێکی بەهێزی حکوومەت و بەرنامەکانی پلانی کۆمەڵایەتی بووە کە کۆمەڵناسان بە تێرو تەسەلی وزانستانە لێیکۆڵیونەتەوە. بەڵام ، بۆ بەدبەختی "وۆرد" دەڵێ خودی مەعریفەی زانستی هێشتا نەگەیشتۆتە قۆناغی پەرەسەندن و کامڵبوون.

چونکە ئەم مەعریفەیە تا ساڵی ١٩٠٣ز لە ئاستی پەرەسەندنی زانستە فیزیاو کیمیاییەکانی سەدەی پانزەیەم دەرنەچووە، هەڵبەت ئەم ئاستەش پشت بەستووە بە پەرەسەندنی سیستمی فێرکردن.

کە"وۆرد" گفتوگۆ لە بارەی بابەتی فێرکرن و ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانی کردووە، جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە ئەگەر هاتو لە سروشتی هێزە کۆمەڵایەتییەکان و رێگەگەلی کۆنترۆڵکردنی تێگەیشتین، ئەوا دەکرێ دروستانە، ئاراستە بکرێن. بایەخی فێرکردن لەوەدایە بوارێکی فروان و روانینێکی راستەقینەی ژیان و پەیوەندی بە سروشت و کۆمەڵگاوە، بە خاوەنەکەی دەبەخشێت. پێویستە دەوڵەت بڕیاری سیستەمی خوێندنی پاراو بەم جۆرە زانیارییانە بداتو چاودێری بەڕێوەبردنی بکا. لەم بڕگەیەدا "وۆرد" کورتەیەك دەربارەی گرفتە کۆمەڵایەتییەکان و رۆڵی فێرکردن دەخاتە روو:

" ئایا ئێمە ناچارین لێگەڕێین سیستەمی فێرکردن هەروەکو چۆن سیستمە کۆمەڵایەتییە بۆماوەکەمان، بەبێ هیچ پلانێك، خۆرسکانە روو دەدات، ئاوا روو بدات؟یان ناچارین لێگەڕێین ملکەچی بارودۆخی سروشتی بێت، یان وەکو بابەتێکی گرینگ و سەرچاوەیەکی مرۆیی چەشنی سەرچاوە سروشتییەکانی دیکە کە مرۆڤ ژیرانە مامەڵەی لەتەکدا دەکاتو بۆ بەرژەوەندی خۆی وەکاریان دێنێ، مامەڵەی لەگەڵدا بکەین و بیکەین بە هێزێکی دەسکردی مرۆڤ کە لە هەموو بەرهەم و سەرچاوە سروشتییەکانی دیکە، سەرکەوتوو تر بێت...؟" (٣٧).

کاتێك کە چاو بەم سیستەمە جیهانییەی فێرکردن دەخشێنینەوەو سەر لە نوێ هەڵیدەسەنگێنین و لە چاوچێوە راستەکەی خۆی دایدەنێین، ئەوکات حکوومەت دەتوانێت کاروبارەکانی زانستییانە بەڕیوە بەرێت و دەکەوێتە بارێکەوە، بە یاساو رێسای مەنتیقی قبووڵکراو، راستەوخۆ پێشکەوتن دەستەبەر بکا. ئەمەیش بە شێوەیەکی ئەرێنی لەسەر داهێنانی کۆمەڵایەتی رەنگ دەداتەوە، هانی تاکەکانی

کۆمەڵگا دەدات کە دروستکارو کردەوە بکەنو، لە بەرژەوەندی گشتیدا بن، بەو جۆرەش دەتوانن خۆبگونجێنن و، هەموو ئەو یاسا هەڵانەی ئێستا چاك بکەنەوە.

"وۆرد" پێیوایە کە یاسای دروست ئەوانەن کە حەزو ئارەزوو ئاواتیان تێدایە بەو پێیەی ئەمانە هێزە بزوێنەرەکانی کۆمەڵگان.ئەمانە کۆمەڵگە بەرەو خێر یان بەرەو شەڕو خراپەکاری دەبەن. دەبێ ئەم یاسایانە فشاری توندی لەسەر ئەو هێزە کۆمەڵایەتییانە نەبێت، بەڵکو بەرەو رێگەی دروستیان ببات. بە تێڕوانینێکی دەروونزانیی داینامیکی دەتوانین بڵێین حکوومەت، بە جۆرێك لە عەقلانیەت، دەتوانێ ئەم هێزانە قاڵ بکات و جڵەویان بگرێ.

پێویستە فەرمانڕەوای چاوەڕوانکراو، هەر وەکو چۆن، زانایانی زانستە پراکتیکەکان کار دەکەن بۆ سوود وەرگرتن لە وزەی ماتریالیانەی سروشت و کۆنترۆلکردنی، ئەویش ئەم هێزانە بەکار بهێنێ و ئاراستەیان بکات. لەم برگەیەدا "وۆرد" پوختەی خەسڵەتە بنچینەییەکانی ئەو سیستەمە سیاسییە پێشکەشدەکات کە لەسەر یاسای دروست دامەزراوە، هەروەهاکورتەیەکی فەلسەفە کۆمەڵایەتییەکەشی روون دەکاتەوە:"یاسا دانەر پێویستی بەوە دەبێت هەندێك بنەما دابنێت کە بتوانێت ئەو هێزانەی لە کۆمەڵگادا هەوڵی دووبەرەکییو ئاژاوەنانەوە دەدەن، لەناو بەرێت، هەروەها دەبێ پاڵپشتی ئەو هێزانە بکات کە بەبێ ئەوەی ئامانج و بەرژەوەندی تایبەتییان هەبێت، کار بۆ چاکسازی کۆمەڵگا دەکەن. هەروەها دەبێ یاساکان لەگەڵ ئەرکەکانی حکوومەتدا، رێکبکەون، بۆ ئەوەی حکوومەت بتوانێ بەرەنگاری هێزە نەیارەکان ببێتەوەو بوار و کەش و هەوایەکی وا بدۆزێتەوە کە لە رێیەوە چۆنێتی کارکردنی خۆی بەو جۆرە چاك بکات کە خواستەکانی هاوڵاتییان لە دەستەبەرکردنی خزمەتگوزاری، پەرەسەندوو ئاسان جێبەجێ بکات. بەمەش کۆمەڵگا بۆ یەکەمین جار بە تەواوەتی پەی بە بەرژەوەندی و ئامانجەکانی خۆی دەبات بەو مەرجە کە ئەم ئامانجو بەرژەوەندییانە لەسەر حسابی ئازادی یان زیانی ماددی و مەعنەوی نەبن. خۆ ئەگەر هاتو لەسەرەتادا زیان هەبوو،ئەوە نابێ لە لانی کەم تێپەڕێت، کە دەکرێ وەکو جۆرێك قوربانیی لە پێناوی

وەدیهێنانی ئەو ئامانج و بەرژەوەندییانە، تەماشا بکرێت. هەروەها کاتێك کە حکوومەت لە کارایی ئەم هێزە کۆمەڵایەتییانە دڵنیا بوو، ئەوە نابێ بەوەندە بوەستێت کە بیانپارێزێت، بەڵکو بەمەبەستی چڕکردنەوەی پلەی کاریگەریو چالاکیان، دەبێ پاڵپشتیان بکات. هەروەها دەبێ حکومەت دڵنیا بێت کە هەموو تاکەکانی کۆمەڵ تارادەیەکی باش ئاشناو شارەزای کاروباری دەوڵەتن، پێویستە پێشکەوتن ئامانجێکی گشتی بێت، تێیدا هەموو هێزە کۆمەڵایەتیە ئەکتیڤەکان، حکومەت، دەوڵەت، وەکوو یەك، یەکتر تەواو بکەن. " وۆرد" جەخت دەکاتەوە کە لە ئایندەی دووردا لەگەڵ پێشکەوتنی مەعریفەو زانستو هزری مرۆییو هەڵکشانی ئاستی پەی پێبردنو هوشیاری لای تاکەکان، دەوڵەتو حکومەت نامێنێ. لێرەدا سەرنج دەدەین کە "وۆرد" بەخۆی ناکۆکە چونکە ئەو پێشتر جەختی لەسەر ئەوە بوو کە دەبێ حکومەت هەبێو، تاکەکانی کۆمەڵگەش پێویستیان پێیەتی بۆ ئەوەی ئەو کارانە بکات کە ئەمان ناتوانن بیکەن(٣٨).

## سێیەم:

## پوختەی هزری کۆمەڵایەتیی"وۆرد":

**بۆ کورتکردنەوەی بەشدارییەکانی "وۆرد" دەکرێ بڵێین:**

١-"وۆرد" هەوڵیدا چەمکەکانی زانستە سروشتییەکان و ئەوانەی زانستە کۆمەڵایەتییەکان پێکەوە ببەستێتەوە.

٢-وەکو یەکەمین کۆمەڵناس دوای سەروبەندی ماوەی داروینیزم، جەختی لەسەر جیاوازیی نێوان پەرەسەندنی بایۆلۆژی و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی، کردەوە، کە دەکرێ دووەمینیان لە رووی کۆمەڵایەتیو هزرییەوە، کۆنترۆڵ بکرێت.

٣-بە روونی جیاوازی لە نێوان پەرەسەندنی ئۆرگانیو پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کردووە.

٤-پاڵپشتی دامەزراندنی دەوڵەت و دەستێوەردانی حکوومەتی کردووە لە دانانی بەرنامەکانی پلان و رۆڵ و گرنگیی فێرکردنی دووپات کردۆتەوە.

٥- باوك، پاڵپشتێكی بەهێز بووە بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە كۆمەڵایەتییەكان، بە بزووتنەوە یان رەوتێكی داناوە، كە هاوكاری پەرەسەندنی كۆمەڵگاو وەدیهێنانی پێشكەوتنی كۆمەڵایەتی دەكات.

٦-یەكەمین كەس بوو هەستی كۆمەڵایەتی بەرامبەر بە فێركردن ورووژاند، وەكو زەروورەتێكی پێوست بۆ هەموو تاكەكانی كۆمەڵگاو نەوەكانی داهاتوو.

٧- گرنگیی یاسا كۆمەڵایەتییەكان و ئامادەكردنی داتای پێویستی دووپات كردووەتەوە كە بنەمان بۆ چاكتركردنی رەوشی كۆمەڵایەتی، تەنانەت بۆ گەیشتنیش بە شار یان دەوڵەتی یۆتۆپی لە رێگەی پەرەسەندنی سروشتییانەی هەنگاو بەهەنگاو٣٩.

NOTES

1- Dynamic Sociology(2 vols. New York,1883)The Psychic Factors of Civilzation(Boston,1903),The Outlines of Sociology(NewYork,1898),puresociology(New York,1903),Applied Sociology(Boston,1904).His pure sociology appeared in a reduced and clarified from in J.Q.Dealey and L.F.Ward,Textbookof Sociology(New Yoork, 1905). Wards minor works and notes of his major contributions are brought together in his"mental autobiography",Glimpeses of the Cosmo(8vols., New York, 1913).
Of these works, Dynamic Sociology is the best extended exposition of his whole social philosophy, a brieferand clearer presenentation of whicg is to be found in the second part of his Outlines of Sociology. Pure sociology is the authoritative exposition of his sociological system, which again, is more clerly presented in Dealey and Wards Textbook of Sociology. His social psychology> is best brought together in PSYCHIC Factors of Civilization, while his Applied Sociology is the classic exposition of his conception of social Telesis.
His Pure Sociology is reviewed by H.H.Bawden in American Journal of Sosiology, IX, (1903-4), 408-15, is criticized in detail by A.W.Small,American Journal of Sociology, IX,(1903-4), 404-7,567-75,703-7, and is critically analyzed by J.M.Gillete in American Journal of Sociology, XX(1914-15), 31-67.
Estimations of Wards significane for sociology by eminent sociologists appear in American Aristotle (New York,1939). There is a well-selected anthology of Eards sociological writings in Clement Wood, the Substance of the sociology of Lester.F.Ward: A Personal Sketch (New York, 1930).
2- His academic career was limited to lectures at several university summer-school sessions and six years (1906-12) as professor of sociology at Brown Univercity. For

the formative experiences in Wards life see B.J.Stern, Young Wards Diary (New York, 1935).
3- Pure Sociology, P. 15.
4- Ibid.,pp. 3, 431.
5- Ibid., p. 79.
6- Ibid., p. 171.
7- Ibid., 161.
8- Ibid., pp. 115-19.
9- Ibid., pp. 119-35.
10- Ibid., pp. 97,99 ff., 124 ff., 142, 467 ff.
11- Ibid., pp.175ff.
12- Ibid., pp. 221ff.
13- Ibid., p., 261.
14- Ibid., pp. 296 ff., 336-41, 345.
15- Ibid., pp. 463 ff.
16- Ibid., p. 551.
17- Ibid., pp. 573-75, Dynamic Sociology, vol.II, chap. Xix, Applied Sociology, passim. With this outline of Wards sociology compare his own summary in Preface of his Dynamic sociology.
18- Cf. a. w. Small, American Journal of Sociology,XXI (1915-16), 752, F. H. Giddings, Loc. Cit. It is hardly necessary to point out that this is essentially a contradiction of Spencers thesis it constitutes the chif difference between the social philosophy of the tow men who were to sociology what Niebuhr and Ranke were to history and Tuurgot and Adam Smith to economics.
19a- pure sociology, p. 91.
20- Psychic Factors od Civilization, p. 297. Cf. Pure Sociology, p. 188, where, in opposition to the conventional view, he argues that the institution of government by society required and produced the state.
21- Pure sociology, p. 555.
22- Dynamic Sociology,II, 233.
23- ward, "the sociology of Political Parties",American Journal of Sociology, XIV(Journal, 1908), 440-41.
24- As expressed in Rousseaus Famous Second Discourse. For Wards own frank admission of the archaic and erroneous of his earliest theory of the state see his "Sociology and the State", Amerecan Journal of sociology, XVI(March,1910), 679-80.
25- Dynamic Sociology, II, 224. This tendency of the few to dominate in political control has been scientifically analized by F. H. Giddings, who designates it as the principle of "protocracy"(see his Responsible State{Boston, 1918}, pp. 19 ff.)
26- Ward, American Journal of Sociology, VII (1901-2), 762, cf. also ibid., XV(1909-10), 679-80, Pure Sociology, pp. 204 ff. as Ward agrees entirely with Gumplowicz and Ratzenhofer upon the subject of the origin of the state, it will not be necessary repeat his version of there doctrine. In addition to the reference to Pure Sociology, wards interpretation of the Gumplowicz-Ratzenhofer theory of the origion of the state is best summarized in American Journalof Sociolog, X(1904-5),

643-53. and Publications of the American Economic Association (3d ser., 1904), V, No. 2, 187 ff. The criticisms which can be directed agnanist this grup-sruggle origio of the stae are best formulated by J. Novicow in his La Crtique de Darwinisme social (Pari, 1910), and E.C. Hayes , An Introduction to the study of sociology (Philadelohia, 1915) pp. 538 ff.

27- The Psycgic Factors of Civilization, p. 311, introductory note.

28- Ibid., p, 327.

29. See, in Particular, his "professor Sumners Social Classes", in Gglimpses of the Cosmos, II, 301-5, and "The Plitical Ethics of Herbert Spencer ", ibid., V, 38-66.

30- Dynamic Sociology, II, 212,217, 231.

31- Ibid., pp. 241-42.

32- Ibid., pp. 245-50., Pure Sociology, pp. 568-69, Outlines of Sociology, pp.187-89, Psychic Factors of Civilization, pp. 309-12. Ward, then, essentially adopoted the doctrine of plato and Comte that prefect government could come only when society and government were controlled and directed by sociologists.

33- Dynamic Sociology, II, 243.

34- Outlines of Sociology, pp. 187-89, 268-76, Pure sociology, p. 565, and Psychic Factors of Civilization, p. 297.

35- pp. 309-12.

36- Cf. Wards article on "The Way of Scintific Law-making"(1877), reprinted in Glimpses of Cosmos, II, 168-71. This is one of the earliest and clearest statements of the value of statistics in scientific legislation and antedated by five years Jeovons classic expotion of this subject in his The State in Relation to Labour (London, 1909), pp. 121 ff., 132ff.

37- Dynamic Sociology, II, 632-33, cf. also applied Sociology, passim. Wards best brief statement of the sociological significance of education is to be found in his address , "Education and Progress", in Glimpses of the cosmos , VI, 333-40. See also E.P.Kimball, Sociology and Education(New York, 1932).

38. dynamic Sociology,II, 249-50.

39- For further authoritative material on Wards sigfieance in social scince see J.Q.Dealey,"Lester Frank Ward", in H.W. Odum(ed.), American Masters of Social Scince(New York, 1927), chap.iii.

# اخوان الصفا

## ڕاگوزەرێکی توێژینەوە بە مێژووی سەرهەڵدان و جۆری ڕیچکخستنیان و فەلسەفەو پەیامەکەیاندا

هاشم عمر

نێواخنێک:-

ئەمانە کۆمەڵ و گروپێك بوون لە فەیلەسووفەکانی سەدەی چوارەمی کۆچی و لەو زەمەنەدا سەریان هەڵداو ژیانیان بردووەتەسەر، کۆمەڵێکی شاراوەبوون و خۆیان لەژێر پەردەیەکی نهێنیدا شاردبوویەوە، سەرەتا لە شاری بەسرەو پاشان پەرەیان سەند و بڵاوبوونەوە. ئەگەر بگەڕێینەوە سەر مێژووی بەسرە دەبینین لە کۆنەوە شوێنی سەرهەڵدان و دروست بوونی چەندەها قوتابخانەی فیکری و عەقیدەیی و تەسەوف و زمانەوانی و زانستی کەلام بووەو چەندەها زاناو ئاینزان و بیریاری تیادا هەڵکەوتووە- پشتیان بەکاری نهێنی بەستووەو کەسایەتییەکانیان شاراوە بووە چ لە هاوسەردەم و ئەوانەیشی کە لە پاش ئەوانەوە هاتوون.

ئەم لێڵی و نائاشکراییە بووە هۆی گومان و گومانبردن بە مەبەست و ئەرکەکانیان و شڵەژاوی لە راستێتی و دروستی بارودۆخیان و بڵاوبوونەوەیان، ئینتیمایان بووە بۆ کۆمەڵەی فەیلەسووفەکانی پێش خۆیان.(١)

(دی بور) کە زانایەکی رۆژئاواییە لە بارەیانەوە دەڵێت "کۆمەڵێکی نهێنی بوون لە هەموو چینە جیاواز و جوداکان پێك هاتبوون، زۆر لە بنەماکانی فەلسەفەی سروشتیان وەرگرتووەو کاریگەربوون بە قوتابخانەی فیساگۆرسی نویێ، پەنایان بردووە بۆ هیرمۆنتیکیەتی دەقەکانی قورئان بە راڤەیەکی مەجازی نەك حەقیقی)(٢)

## -مێژووی سەرهەڵدانی (إخوان الصفا):-

(إخوان الصفا) مێژووی سەرهەڵدان و وەدەرکەوتنیان لەسەردەمی خەلافەتی عەباسییەکاندا بووە، لە سەردەمێکدا کە عەباسییەکان بە هەموو شێوەیەك کۆمەکی و هاوکاری زانایان و فەیلەسووف و ئاینزان و بیریار و ئەدیبەکانی دەکرد و یارمەتی ماڵی و مەعنەوی بۆ دابین دەکردن، بەشێوەیەکی گشتی- ئەو سەردەمە ناو دەبرا بە سەردەمی زێرینی ئیسلام لەبوارەکانی ئەدەب و زانست و فەلسەفەو فیکر و هونەر و وەرگێڕان و هەموو بوارەکانی تری پێشکەوتنی کۆمەڵگەو شارستانیەت و ژیاری ئیسلامی هەربۆیەش لە هەموو روویەکی ئەم جیهانە زاناو فەیلەسوف و شاعیر و کەسانی تر روویان دەکردە خەلافەتی ئیسلامی.

## ناسینی سەردەمی کۆمەڵەی (اخوان الصفا):-

ئەگەر لە لێکۆڵینەوەی کەسایەتی و فیکرەکاندا، و دەرخستنی ئەو دیاردەو روو رواڵەتە دیار و بڵاوانەی لە سەردەمی ئەو کەسەدا یان ئەو فیکرەدا هەبووە کە لێکۆڵینەوەکە دەیگرێتەوە بۆ گەشتن و مەبەستی ببینینەوەی ئەو زنجیرە و هەڵقە کاریگەر و کارلێکراوانە لەسەر فیکر و کەسێتی وە بۆ ئەوەی ئەو پاشکۆ و باگراوەندانە

بناسینەوە کە پاڵنەربوون لەسەرهەڵدان و دروست کردنی ئەو کەسێتییە یان ئەو فیکرە گەر ئەمانە کارێکی باش و تەندروست بێت و زەمینە خۆشکەر دەبێت.

ئەوا باشترەو بەڵکو زۆر پێویستە لەم بابەتەدا کە بابەتێکی ئاڵۆز و تێکەڵە هەندێك لایەن و دیاردە و رواڵەت کە لەو سەردەمەدا هەبووە باسی لێوە بکەین، چونکە ئەو دیاردانە کاریگەربوون لەسەر راو بۆچوون و پەیام و فەلسەفەکەیان. (٣)

لێرەدا بەشێوەیەکی گشتی و کورت دەچینە نێو ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری لەو سەردەمەوا کە ئەم رەوشانە کاریگەرییان هەبووە لەسەر فیکری ئەم کۆمەڵەیە.

## ژیانی سیاسی لەو سەردەمەدا:-

لەو سەردەمەدا چەندەها بزوتنەوەی سیاسی و ئاینی و مەزهەبی سەریهەڵدا، هەرچەندە عەباسییەکان توانیان ئەو بزووتنەوەو بزاڤانە بەشێوەیەکی کاتی لەناوبەرن، بەڵام هەر کاریگەریی ئەو بزووتنەوانە خەلافەتی عەباسیان شڵەژاندبوو.

ئەوەبوو کوشتنی خەلیفە (متەوەکیل) لە ساڵی (٢٤٧ك) لەسەردەستی هەندێك لە سەرکردە تورکەکانی سوپا لەو کاتەدا بانگێك بوو بۆ دەسپێکی رەوش و بزاڤێکی نوێ لە دەسەڵاتی سەرکردە سەربازییە تورکەکان بەسەر سیاسەتی دەوڵەتی عەباسیدا.

ئەگەر سەیرێکی رەوشی سیاسی و رەوتی مێژوویی سیاسی بکەین لەو سەردەمەدا دەبینین گۆڕانکاری و لادان و وەرچەرخانێکی زۆر و بێ مانا هاتووە بەسەر خەلیفەکاندا و خەلیفەی وا هەبووە یەك رۆژ دەسەڵاتی گرتووتە دەست و پاشان کوشتوویانە ئەم رەوشە بەردەوام بوو تا سەردەمی بوەیهییەکان و لە ساڵی (٣٣٣ك)دا بوەیهییەکان چوونە ناو بەغداد و ئەو ماوەیەی کە ئەمانە زاڵ بوون بەسەر خەلافەت و دەسەڵاتدا دەکرێت دابنرێت بە خولێکی تر لە خەلافەتی عەباسی خولێك کە رووخانی سوڵتانی حەقیقی بوو لە سەردەستی خەلیفەکان بەوپێیەی خەلیفە بووە سەرکردەیەکی ئایینی رووت کە نە فەرمانی هەبوو نە قەدەغەکردن تەنیا ناو بوو و بەس و داماڵرابوو لە هەموو مەفهومێکی سیاسی ئەمە حاڵەتی خەلافەتی عەباسی بوو. لە رەوشی سیاسیدا. (٤)

-ژیانی کۆمەڵایەتی:

ژیان و گوزەران و دەرامەتی خەڵك بە گشتی و باری کۆمەڵایەتی لەو سەردەمەدا لە ڕەوشە سیاسییەکە باشتر نەبوو لەگەڵ دەرکەوتنی مەسەلەی جیاوازی ڕەگەزی و مەزهەبی و ئایینی و کولتوری...هتد. بۆیە لێرەدا قسە لەسەر ئەو دیاردە و سیمایانە دەکەین کە لەو کاتەدا بڵاوبوونەوەو ئاشکرا بەسەر کۆمەڵگەی ئیسلامیدا زاڵ بوون.

کێشەو گرفتەکان لە دوو تەوەرەدا بە زەقی وەدەردەکەوتن:

١-ململانێ و دوبەرەکی مەزهەبی.

٢-ڕەگەز پەرستی نەتەوەیی و دابەزینی خورەوشت.

١-لەگەڵ فراوانبوونی دەوڵەتی ئیسلامی و بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام لە وڵاتانی غەیرە عەرەبیدا و هاتنە ناوی چەندەها نەتەوەو گەلی جیاواز بۆ نێو ئەم ئاینە بووە هۆی ئەوەی چەندەها گروپ و تاقم و کۆمەڵەی جیاواز دابمەزرێت کە هەمووشیان بانگەشەی ئاینی ئیسلام و سەرچاوەی قورئان و سونەیان گرتبووە دەست و هەریەك لەو گەل و نەتەوەو تاقم و گروپانە جگە لە جیاوازی لە ئەقڵیەت و دەروون و ژینگە و تێگەشتنی دەقەکان، تایبەتمەندی و کولتوور و فەرهەنگی خۆیان هەبوو ئەم تایبەتمەندییانە بۆ خۆی کاریگەری هەبوو لەسەر ڕێباز و هێرمۆنتیکەیەتی دەقەکان و پیادەکردنی بۆ ناو کۆمەڵگەو جێبەجێ کردنی و هەریەك لەمانە کۆمەڵێك بەرژەوەندی و مەرامی تایبەتی خۆیان هەبوو بۆ ئەوەی بیهێننەدی.

ئەم موسڵمانە تازانە لەگەڵ ئەو باکگراوەندە فیکری و ئایینییەی خۆیاندا کۆمەڵێك بابەت و مەسەلەی هەستیار و کێشەی عەقیدەیی- قەزاو قەدەر، فریشتە- ناوەکانی خوداو سیفانەکانی و بابەتیان وروژاند بۆ لێکۆڵینەوەو گفتوگۆ لە سەرکردنە، جگە لەمەش تێکەڵکردنی ئەو ڕۆشنبیری و فەرهەنگە کۆنەیان لەگەڵ ئیسلامدا و کردنی بەبەشێك لە داب و نەریتی ئایینی.

لە ئەنجامی جیاوازی ڕاو بۆچوونەکان و جودایی لە تێڕوانین و باکگراوەندی ڕۆشنبیری و هۆشیارییان و لەگەڵ پێکدادان و یەك نەگرتنەوەی بەرژەوەندییەکانیان...

ململانێ دەستی پێ کرد، کە لە ئەنجامی ململانێدا چەوسانەوەی فیکری و مەزهەبی سەری هەڵداو ئەم ململانێ مەزهەبییە تەنیا لەناو توێژی زانایان و بیریارەکاندا نەبوو بەڵکو پەلی کێشایە ناو تێکڕای خەڵکەکە چڕتر بۆوە.(٥)

و لەو ماوەیەدا چەندەها بزووتنەوەی مەزهەبی نهێنی و ئاشکرا سەریهەڵدا و سروشت و مۆرکی سیاسییان هەڵگرتبوو یاخود لە بنەڕەتدا سیاسی بوون بەڵام خۆی لە مۆرك و سروشتێکی مەزهەبیدا دەردەخست. کە بەهۆیەوە کۆمەڵگەی ئیسلامی تووشی لیك ترازان و دووبەرەکی هات.

٢-رەگەزپەرستی و چەوسانەوەی نەتەوەیی دیاردە و روخسارێکی دیار و روونی ئەو سەردەمە بوو، لێرەدا پێویست دەکات کەمێك بگەڕێینەوە پێش سەردەمی عەباسی واتە سەردەمی خەلافەتی ئەمەوی، ئەمەوییەکان دەسەڵات و خەلافەتیان زیاتر سروشت و مۆرك و پێکهاتەی نەتەوەیی عەرەبی پێوە دیار بوو و زۆربەی دەسەڵاتە باڵاکان لە بۆ کوڕانی ئەمەوی بوو، هەتاکو هەندێك باوەڕیان وابوو کە خوێنی ئەمانە زۆر جیاوازە لە هی خەڵکی ترو هەستیان بە گەورەیی و بڵندی دەکرد. (٦)

بەڵام ئەم رەوشە بۆ عەرەبەکان بەردەوام نەبوو بەڵکو گۆڕانی بەسەرداهات و میللەت و نەتەوەی تر بەشداری دەسەڵاتیان کرد و خەلافەتیش گواسترایەوە و درایە دەست خەڵکی غەیرە عەرەبیش. یەکێك لەو گۆڕانکارییە کاریگەرەکانە بەسەر خەلافەتەوە، سەرکەوتنی (خەلیفە مەئموون)بوو بەسەر خەلیفە (ئەمین)ی برایدا. ئەم سەرکەوتنە دانرا بەسەرکەوتنێکی گەورە بۆ فارسەکان و توانیان بچنەنێو ناوەندی دەسەڵات و پێگەی خۆیان توند بکەن و دەوڵەتیش پشتی پێ دەبەستن لە کاروبارەکاندا. لێرەوە رەگەزێکی تر چووە نێو خەلافەتەوەو لەگەڵ عەرەبدا کاریان دەکرد، بوونە دوو نەتەوەی جیاواز عەرەب و فارس.

و لە سەدەی سێیەم بەدواوە لەگەڵ گۆڕانکاری و وەرچەرخانە یەك لە دوای یەکەکاندا و ئاڵۆزی باری سیاسی و ناجێگیری خەلافەت بووە هۆی هاتنە ناوەوەی

رەگەز و نەتەوەیەکی تر و خۆی خزاندە ناو مەڵبەندی خەلافەتەوەو ئەمانیش چوونە ناو ئەو ململانێ گەرمەوە.

ئەوانیش نەتەوەی تورك بوون کە خۆیان بە پارێزگاری خەلافەت و ئەهلی سوونە دادەنا دژی شیعەکان. (٧)

جێی باسە لەو سەردەمەدا ململانێ و دوو بەرەکی و پێکدادانی نەتەوەگەری لەسەر دەسەڵات بە روونی و ئاشکرایی لەنێوان عەرەب و فارس و تورکەکاندا دیاربوو.

## ژیانی ئابووری

لەم سەردەمەدا چالاکی بازرگانی و پیشەسازی و کشتوکاڵ جوڵەو چالاکییەکی بەرچاوی بەخۆوە بینی، بازرگانی نێوان موسڵمانەکان و خەڵکانی تر بەرەوپێشتر دەچوو, وە بەرهەمە کشتوکاڵییەکان لە پێویستی خەڵك زیاتر بوون بەرەو دەرەوە دەیانناردن و سامان و بەرهەمی سروشتی بەرەو زیاتر دەچوو. چەندەها خەڵکی خاوەن بەهرەی پیشەیی و بەرهەمی پیشەسازی نوێ وە دەرکەوت و بەکار دەهێنرا لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا.

دەتوانین بڵێین ژیان و رەوشی رۆژانەی خەڵك و پێداویستی و شتەکان زۆر جیاوازتر بووە لە سەردەمی پێش خۆیان.

بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە لەو سەردەمەدا لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتن و گەشەسەندنەدا لە هەموو بوارەکاندا سامانی سروشتی و شت و مەك و سامانی دەوڵەت و پارەو پوولەکان بەشێوەیەکی نادادپەروەری و نایەکسانی جێ بەجێ دەکراو بە شێوازێکی ستەم و زۆر و نادروست دابەش دەکرا، چینێك لەوپەڕی خۆشی و خۆشگوزەرانی ژیانیان دەبردەسەر و – ئەمانە تەنیا چینە ئەرستوکرات و حاکمەکە بوون و بە پەنجەی دەست دەژمێردران– لە بەرامبەریشدا چینێکی ستەملێکراو ژێر دەستەو نەدار و هەژار و کەم دەست بوون، هەرچەندە چینێکی تر هەبوون ژیانێکی مام ناوەندییان هەبوو، بەڵام پەیوەندییان هەبوو بە چینی دەسەڵاتەوە و نزیك بوون لەوان

ئەو کاتەی دەسەڵاتداران بەشێوەیەك دەژیان کە تەنیا بیریان لە کۆکردنەوەی زێڕ و زیوو پارەو کۆشك و تەلاری گەورەو فراوان و خواردنی هەمەجۆر و گران بەها دەکردەو, و دەستیان گرتبوو بەسەر ماڵ و موڵکی خەڵك و سامانی دەوڵەتدا کە تەنیا مانگانەی وەزیرێك حەوت هەزار دینار بوو بەڵام خێزانێکی هەژار و دەست کورت تەنیا سەدو بیست دیناری هەبوو بۆ یەك ساڵ و کاتێك کە هەژارەکان ئەو خراپەکارییەیان بینی هەڵوێستیان وەرگرت و هەوڵیان دا لە رێگەی چەند شۆڕش و ململانێ بۆ سڕینەوەی ستەم و زۆرداری و نادادپەروەری. (٨)

خراپی بارودۆخ و گوزەران و ژیانی خەڵك لە هەموو بوارەکاندا چ لە بازرگانی و کشتوکاڵ و پیشەسازیدا بووە هۆی داتەپین و روخانی ژێرخانی ئابووری، ئەم کارە بووە هۆی بڵاوبوونەوەی برسێتی و نەخۆشی و پەنا لە ناو خەڵکدا و دەوڵەتیش گرنگی نەدەدا بەو هەموو شتەو تەنیا گرفتیان پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان بوو.

دەکرێ خراپی ئەم رەوشەش بگەڕێنینەوە بۆ ئەو بارودۆخە خراپەی کە لەو سەردەمەدا لە بواری سیاسیدا سەریهەڵدابوو، جگە لەو ململانێ و پێکدادانەی نێوان سەرکردەی سوپا و خەلیفەکان لەلایەك مەزهەب و گروپ و نەتەوەکان لەلایەکی ترەوە.

## ژیانی رۆشنبیری..

لەگەڵ ئەوەی کە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری خەڵك لەو سەردەمەدا خراپ بوو، بەڵام لەلایەنی ئەقڵی و زانستی و بڵاوبوونەوەی رۆشنبیرییەوە سەردەمێکی پێشکەوتوو زێڕین بوو کە تیایدا هەموو رۆشنبیرییەکان تێکەڵ بوون و فەرهەنگ و کولتوور و رۆشنبیرییەکی نوێیان پێك هێنا و زانست و فێربوون و فەلسەفە گەشتبووە ئەوپەڕی.

دەتوانین بڵێین سەردەمێکی زێڕین بوو بۆ زانست و زانیاری و فەلسەفەی ئیسلامی بۆیەش زۆربەی زانایان ناویان بردووە بە سەدەی زێڕینی ئیسلام.

سەدەیەکی گرنگ بوو بۆ دەرکەوتنی تەسەوفی ئیسلامی و تەسەوفی گەیشتە ئەوپەڕی و چەندەها زاناو پیاوی تەسەوف و دەرکەوتن لەوانە حەلاج و ئەبو تالبی مەکی..هتد. (٩)

هەندێك هۆکار و خەسڵەتی تایبەتی ئەو سەردەمە بووە هۆی بەرەوپێشچوونی رۆشنبیری لە کۆمەڵگەداو کاریگەر بوو لەسەر تێڕوانین و بۆچوونەکانی خەڵك و دەرکەوتنی چەندەها دەستەو تاقم و کۆمەڵەی جیاواز ئەویش:-

١-کرانەوەی خەلافەتی ئیسلامی بەڕووی جیهانی دەرەوەدا و فراوان بوون و تێکەڵبوونی کۆمەڵگەی ئیسلامی لەگەڵ کۆمەڵگەکانی تر و سوود وەرگرتن لە کولتوور و فەرهەنگی ئەوان.

٢-جوڵەو بزووتنەوەیەکی فراوانی وەرگێڕان لە هەموو بوار و زانستەکاندا دەستی پێ کرد و چەندەها کتێبی زانستی و پزیشکی و ماتماتیکی و فەلسەفی- یۆنانی و گریکی- وەرگێڕدرایە سەر زمانی عەرەبی و رەواجێکی زۆری پێ دەدرا لەلایەن خەلیفەکانەوە لە پاداشتی کارەکەیاندا دیاری تایبەتی خەلیفە دەدرایە ئەو زاناو وەرگێڕانە لەو سەردەمەدا.

٣-تێکەڵاوی و هاتنە ناوەوەی فیکر و بیروبۆچوونی ئایینی یەهودی و مەسیحی و ئاینەکانی تر بۆ ناو ئاینی ئیسلام و تێکدانی چەمکە گشتی و بنەڕەتییەکانی ئیسلام و سەرهەڵدانی چەندەها گروپ و کۆمەڵەی جوداو جیاواز لەیەکتر لە بنەماو بیروباوەڕ و مەزهەبدا و هەریەکەیان خۆی بەتایفەی سەرکەوتوو ئەهلی بەهەشت دادەنا.

٤-لەم سەدەیەدا فەلسەفەی ئیسلامی تایبەتمەندی خۆی هەبووە و خاوەن پێگەو پێکهاتەیەکی سەربەخۆ بوو، بۆیە، توێژینەوەو خوێندنەوەو خوێندنی فەلسەفە لە قوتابخانەکاندا بو بووە پێویستی ئەو سەردەمە بۆ ئەوەی موسڵمانەکان پارێزگاری لە بیروباوەڕ و بنەماکانی ئاینەکەیان بکەن بەرامبەر بەو لێشاوە فەلسەفی و بیرە نامۆیانەی کە هاتبوونە ناو ئاینی ئیسلامەوەو کۆمەڵگەی ئیسلامیان وروژاندبوو، بۆیە دەبوو

گفتوگۆ و راگۆڕینەوەو بەرپەرچدانەوەی فەلسەفی و فیکری هەبوایە بەرامبەر بە ئەو فەلسەفە و فیکرانە.

لەو سەردەمەدا چەندەها زانا دەرکەوتن کە زیاتر گرنگیان بە فەلسەفە دەدا لەوانە (فارابی) کە بە باوکی فەلسەفەی ئیسلامی دادەنرێت– و کۆمەڵەی (اخوان الصفا) و..هتد. (١٠)

ئەم پێشکەوتنە لەبواری رۆشنبیریدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ململانێ و گفتوگۆ توندەی نێوان زانایان و فەقیهو شاعیر و ئەدیب و فەیلەسوف و موتەکەلیمەکان لە هەموو ولاتانی ئیسلامیدا، و ئەو ئازادی و سەربەستییە لە قسەکردن و گفتوگۆدا– هەرچەندە ستەم و چەوساندنەوەی فیکری هەبووە، بەڵام پاڵپشت و یارمەتیدەریش لەگەڵ ـ و گۆڕینەوەی راو بۆچوونەکان و سەرهەڵدانی ئەو هەموو رەوت و بیرە تازانە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا هەبووە.

ئەمەش بەشێوەیەکی کورت، گرنگترین خەسڵەت و رواڵەتی دیار و ئاشکرای ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری سەدەی چوارەمی کۆچی بوو، سەردەمی کۆمەڵەی (إخوان الصفا) و ئەم رەوشە کاریگەری دیارە بە سەر پەیام و کەسەکانیانەوە.

لە پاش ئەو کورتە باسە لەسەر بارودۆخ و مێژووی ئەو سەردەمەی کە ئەم کۆمەڵەیە تیایدا سەریهەڵدا و بوونە سومبولی زانست و مەعریفە و فەلسەفە لەو وەختەدا و توانیان مێژوویەکی پڕ لە جوانی و زانستی بۆ خۆیان تۆمار بکەن.

هەر بۆیە لە بۆ زیاتر ناسین و شارەزابوون لەم کۆمەڵەیە و ئەندامان و پەیامەکانیان پێویست دەکات دوو بابەتی گرنگ بخەینەڕوو و باسی لێوە بکەین:–

یەکەم:– ئەندامان و کەسانی (إخوان الصفا)کێن؟

دووەم:– ناسینی دانەرانی پەیامەکانی (إخوان الصفا).

## تەوەرەی یەکەم:

### ناسینی ئەندامانی (إخوان الصفا)

قسەکردن لەسەر ئەم تەوەرە زۆر ئاڵۆز و گرنگە، چەندان پسپۆڕ لەم بوارەدا هەوڵیانداوە بۆ ناسینی ئەم کۆمەڵە و ئەندامەکانیان و کارو چالاکیان, هەریەکە گەشتووەتە راو بۆچوونێکی لەوی تر جیاوازتر و جوداتر.

لە بابەت ئەم خاڵەوە خۆمان لە بەرامبەر دەرگایەکی داخراو شوراو سنوورێکی نهێنیدا دەبینینەوە لەبەر ئەوەی کاری کۆمەڵەو چالاکی کەسەکانی نهێنییەو سروشت و ئیشی کۆمەڵە نهێنییەکانیش بە بەردەوام خۆشاردنەوەو کەتمان و نەدرکاندن بووە، و بە تایبەتی ئەگەر ئێمە قسە لەسەر کۆمەڵێك بکەین کە لەنێوان ئێمەو ئەوانەدا چەندەها سەدەی نێوانە.

ئەوەندەی پێی گەشتوین لە بارەی تاکەکانی ئەم کۆمەڵەوە لە رێگەی نامەکانیانەوەیە، ئەوانیش کۆمەڵە کەسانێکن بە جیاوازی جۆری چین و توێژەکانیانەوە بەبێ دیاریکردنی ناوی کەسەکانیان لەم بارەیەوە لە پەیامی جل و هەشتەمینیاندا هاتووە (لە باشترین و چاکترین کەسەکان براو هاوەڵمان هەیە، بڵاوبوونەوەتەوە لە وڵاتاندا، لەوانە دەستەو تایفەیەك لە منداڵانی پاشاو ئەمیر و وەزیر و کرێکاری کۆکردنەوەی (خراج) و نووسەرەکان، و هەرلەوانە تایفەیەك و کۆمەڵێك لەمنداڵانی پیاوە بەرز و سەرۆکی هەرێم و جوتیارەکان و بازرگان و دانیشتوانە بنەڕەتییەکەی و هەروەها منداڵانی زاناو ئەدیب و فەقیهو ئاینزان و خاوەن پیشە و پیاوانی باوەڕپێکراوی تیادا جێگە بووەتەوەو لەخۆی گرتووە..).(١١)

لەگەڵ ئەوەی ئەندامەکانیان ناسراو نین هەروەها ژمارەی ئەندامانی ئەم رێکخراوەیەش دیار نییە بەڵام مێژوونووسی هیندی (خودابخنش) گەشتووەتە ئەو رایەی کە ئەندامانی رێکخراوەکەی بە (٤٠) ئەندام دەستنیشان کردووە و دەڵێت: (لێك چونێکی سەیر هەیە لەنێوان ئەوان و ئەکادیمیەی فەرەنسیدا لە ژمارەی ئەندامیاندا)،

بەڵام زیاتر روونی نەکردۆتەوە ئایا ئەو ژمارەیە هەموو ئەندامانی کۆمەڵەکەیە یان دامەزرێنەری یان دەستەی باڵان؟.

هەرچەندە ئەو سەرچاوەش دیاری ناکات کە پشتی پێ بەستووە لەم رایەیدا. (١٢)

تەنیا سەرچاوەیەك کە دامەزرێنەرانی ئەم قوتابخانەیەی لێوە بناسرێتەوە ئەویش قسەیەکی (ئەبوحەیان)و لە هەردوو کتێبەکەیدا (الإجتماع و المؤانسة) و (المقابسات) کە (القفطي) لێوەی گواستۆتەوە:-

کاتێك وەزیر (صمصام الدولة)- کەسێك بوو گرنگی دەدا بە فەلسەفە و کۆڕ و دانیشتنی فەیلەسووفەکان- پرسیار لە (ئەبوحەیان) دەکات لە بارەی (زەیدی کوڕی رەفاعە) کە هەندێك قسەو گفتاری هەیەو لێی دەبیستم و رێبازێکی هەیە کە پێشتر نەم بیستووە.. لە وەڵامیدا (ئەبو حەیان) دەڵێت:- کە (زەیدی کوڕی رەفاعە) ماوەیەك لە بەرسرادا ماوەتەوە. لەو ماوەیەدا چاوی کەوتووە بە کۆمەڵێك کە هەموو بەشەکانی زانست و جۆرەکانی پیشەسازیان کۆکردووەتەوە لەوانە:-

(أبو سليمان البستي ناسراو بە (القدسي) و ابو الحسن علی الزنجاني و أبو أحمد المهرجاني و العوفي و کەسانێکی تریش) بوون.

ئەم کۆمەڵەیە کۆبوونەتەوە لەسەر پێکەوەژیان و پاکژی راستگۆیی و پاکێتی و ئامۆژگاری..

و لەناو خۆیاندا رێبازێکیان دامەزراند کە پێیان وابوو رێگایان بۆ بەدەست هێنانی رەزامەندی خودا نزیك کردۆتەوە. لە بنەڕەتی رێبازەکەشیاندا هاتووە کە شەریعەتی ئیسلام پیس و تێکەڵ بووە بە نەزانی و گومڕاییەکان و هیچ رێگەیەك نییە بۆ پاکردنەوەو جوان راگرتنی تەنیا فەلسەفە نەبێت، چونکە فەلسەفە هەڵگری حیکمەت و جوانییەو پڕیەتی لە دانایی بیر و باوەڕ و گەشتن بە راستییەکان، هەر بۆیە پەنجا نا.ە (پەیام) یان نووسی لە هەموو بەشەکانی فەلسەفە/زانستی و کردەیی/وە ناویاننا (رسائل إخوان الصفا) ئەمانە ئەو کەسانەن کە مێژوو ناویانی تۆمار کردووەو پاراستوویەتی لەناو کۆمەڵەی (إخوان الصفا)دا وە (ماکدۆناڵد) وای دەبینێ کە لەناو ئەم

کۆمەڵەیەدا کەسێتی دیار و ئاشکراو ناسراو بەشێوەیەکی فراوان و خاوەن کێش و پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بەرز وەدەرنەکەوتووەو کەم بوون.(١٣)

## تەوەرەی دووەم

### ناسینی دانەرانی پەیامەکان

پەیامەکانی (إخوان الصفا) بووەتە مایەی مشتومڕێکی زۆر و خاڵی گفتوگۆ و سەرچاوەی جیاوازی لەنێوان هەریەك لە زانایانی ئیسلام و رۆژئاوا وەك یەك، هەروەك چۆن مەسەلەی شوناسی دانەرەکان (یان لەوانەیە دانەرێکیش بێت) و شوێن و کاتی نووسینی کارەکانیان و بلاوکردنەوەی بە شاراوەیی ماوەتەوە جێی باس و دوانگە و پەیڤێکی زۆرە لەنێو زانایاندا لە کۆن و ئێستادا و وەلامێکی مێژوویی و دیاریکراویش بە تەواوەتی نییە(١٤).

گەر توێژەرە نوێکانی ئەمڕۆ وای ببینن خۆیان لە گێژاوێکدا دەبیننەوە لە بەرامبەر ئەم کارەدا کە هەوڵدەدەن دانەرێ پەیامەکان بناسن ئەوا هەر لەم بارەیەوە (القفطي) تێڕامان و سەرسوڕمانی خۆی دەربڕی بەرامبەر بە دانەری پەیامەکان پێش خوێندنەوەی کتێبی (الأمتاع والمؤانسه)ی (ئەبو حەیان).

(القفطي) دەڵێ:- "کاتێ نووسەر و دانەری پەیامەکان ناوەکانیان شاردەوە جیاوازی کەوتە ناو خەڵکەوە لەبارەی ئەوەی کێ ئەم پەیامانەی نووسیوە هەر تاقم و دەستەیەك قسەیەکیان دەکرد لە رێگەی هەڵسەنگاندن و خەملاندنەوە هەندێك دەیان وت ئەم پەیامانە قسەی هەندێك لە ئیمامەکانی نەوەی ئیمام عەلین، و جیاوازیشیان هەبوو لەسەر ناوی ئەو ئیمامەی کە دایناوە، هەندێکی تر پێیان وابوو لە دانانی زانایانی موتەکەلمینی موعتەزیلەن لە سەردەمی یەکەمدا، هەتاکو ئێستاش دەکۆڵمەوەو دەپرسم لە دانەرانی پەیامەکان تاوەکو وەستام لەسەر قسەی (ئەبو حەیان)ی تەوحیدی- لە پێشتر باسمان کرد..." (١٥).

ئەم جیاوازییە لە راو بۆچوونەکاندا لەم بارەوە کە (قفطي)باسی دەکات لە ئێستادا بەشێوەیەکی زیاتر دەبینرێت، ئەوەتا ئیسماعیلییەکان هەموو توانایەکیان خستۆتەگەڕ بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە ئەم پەیامانە لەدانانی ئیمامەکانیانە ئەمەش بۆ ئەوەی ببێتە کولتور و فەرهەنگی ئیسماعیلییەکان هەربۆیەش عارف تامر- نووسەرێکی ئیسماعیلی هاوچەرخە- کۆمەڵێك لە دەقە ئیسماعیلییەکانی کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە پەیامەکان یەکێك لە ئیمامەکانی ئیسماعیلی دایناوە.

ئەمەش لە کتێبەکەیدا بەناوونیشانی (حقیقە إخوان الصفا)، هەروەها لەپاش ئەمیش چەند نووسەرێکی تری ئیسماعیلی هاتوون و هەوڵیانداوە بۆ سەلماندنی ئەم مەسەلەیە.

ئەمانە هەستاون بە بەراورد کردن لەنێوان هەندێك لەو راوبۆچوون و دەقە لێك جوودانەی نێوان (ئیسماعیلییەکان) و (إخوان الصفا)دا. (١٦)

شایانی باسە چەندەها سەرچاوەی ئیسلامی هەیە ناوی کۆمەڵێك لە زانایانی بەسرەی تیادا باسکراوە کە ئەوانە پەیامەکانیان داناوە: وەکو پێشتر باسمان کرد کە (القفطي) لە کتێبەکەیدا (اخبار الحکماء) لە (ئەبو حەیان)ەوە دەیگێڕێتەوە کە دانەرانی پەیامەکان ئەمانەن (أبو سلیمان محمد بن معشر، أبوالحسن علی بن هارون...).

و زانایەکی تری ئیسلامی بەناوی (شارەزووری) لە کتێبەکەیدا کە ناوی (نزهة الأرواح) لیستێك لەناوی هێناوە بەجۆرێك جیاوازترە لەوانی تر و پێك هاتووە لە (أبی الحسن علی بن هارون الصابی و أبی احمد النهرجوری و عوفی البصری و زید بن الرفاعی و ابی سلیمان محمد بن مسعود).

ئەبو حەیانی تەوحیدی پێی وایە کە وەزیر (أبو عبدالله السعدان)- کە لەساڵی ٣٧٥ك کوژرا-کۆمەڵێك زانای بەکارهێناوەو کاریان دەکرد لەوانە (أبن زرعە-٣٩٨ك، و سکویە الرازی-٤٢١ك) و أبی الوفاو البوزجانی و أبی القاسم الاهوازی و أبی سعید بهرام و ابن شاهویە و ابن بکر ابن حجاج الشاعر و شوخ الشیعی و ابن عبید الکاتب)، قسەو وتەکانی ئەمانە کۆکرایەوەو نووسرایەوە تا پەیامەکانیان لێ پێك هات.

هەروەها تەوحیدی لە یەکێك لە نووسەرەکانەوە- زید بن الرفاعی- دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: "هیچ پەیوەندییەکی دیاریکراو کۆی ناکاتەوە لەگەڵ هیچ ڕێبازێکدا، ئەویش دەزانێت کە ڕێبازەکەی پێك بهێنێت لە هەموو (لایەکان)-ڕێبازەکانی تر-و هەرچ کەسێك بتوانێت فەلسەفەی یۆنانی و شەریعەتی ئیسلام کۆبکاتەوە ئەوکات گەشتووە بە تێڕوانینی (إخوان) پلەی کە ماڵی ئیمان -ئەوپەڕی ئیمان.. و بەم شێوەیە توانیان پەنجا پەیام (نامە) بنووسن لە هەموو بەشەکانی فەلسەفەدا". (١٧)

ئەبو حەیان ئەگەر ئینتیمای هەبێت بۆ ئەم کۆمەڵەیە وەکو (احمد أمین) دەڵێت یان ئینتیمای نەبێت، بەڵام قسەو نووسینەکانی نرخ و بەهایەکی مێژوویی و بابەتی و ڕەهەندی تایبەتی هەیە لەبەر ئەوەی ئەو پەیوەندی هەبووە بە کۆمەڵە فەلسەفی و بزووتنەوە نهێنییەکانەوە بەڵگەش بۆ ئەمە کتێبەکانیەتی بەتایبەتی (القابسات) و (الامتاع والمؤانسة)ەوە ئەو بێزاری و تووڕەییەی لەسەر بارودۆخی ئەو سەردەمەو ئەو پەیوەندییە خۆش و چاکەی لەگەڵ (زێد بن الرفاعی) و نووسینەوەی کتێب و پەیامەکان بۆی.

هەروەها کۆمەڵێك زانای ناسراو ناودار لەوانە (البیهقی-٥٦٥ك) و (الخوارزمی-٦١٧ك) (القفطي ٦٤٦ك) و (شارەزوری-٦٨٤ك) و (ابن العبری-٦٨٥ك) و (إبن تیمیة-٧٢٤) ئەمانە هەموویان جەختیان لەسەر قسەکانی تەوحیدی کردووەتەوەو باوەڕیان وابووە کە پەیامەکان لەپاش سەدەی سێیەم و لەلایەن کۆمەڵێك زاناو داناوە نووسراوەتەوە.

- لەبارەی ژمارەی ئەندامانی (إخوان الصفا) و دانەرانەوە:

قسەیەکی زۆر هەیە ئەوەتا تەوحیدی تەنها ناوی پێنجیان ئاشکرا دەکات هەرچەندە لە قسەکانیداوە دەردەکەوێت کە زیاتر بوون و ناسیونی.

بەڵام ماکدۆناڵد بۆ ئەوە دەچێ کە دامەزرێنەرانی ئەم قوتابخانەیە و دانەرانی پەیامەکان (١٠)دە ئەندام بووبن، بەڵام دیاریکردنی بەم ژمارەیە هیچ بەڵگەیەکی نییە.

بەڵام ئەگەر لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبەینەوەو بیخوێنینەوە دەبینین ئەم پێنج کەسە چالاکی و کار و کردەیان زیاتر بووەو نوسینیان بڵاوبووەتەوە و مێژوونووس زیاتر باسی لەمانە کردووە لەناو ناوو کەسەکانی تردا. (١٨)

– **شوناس و ئینتیمای کۆمەڵەی (إخوان الصفا)**

جیاوازی راوبۆچوون و تێڕوانینەکان تەنها لەسەر دانەری پەیامەکان نەبوو هەموو ئەو سوورەشی تێپەڕاندو بەڵکو مەسەلەی ئینتیمابوون و لایەنگیری مەزهەبیشیانی لەناو کۆمەڵی ئیسلامیدا دەگرتەوەو بووە قسەوباس و مشتومڕی زانایان.

ئایا ئەمانە سەر بە چ مەزهەب و گروهێکی سیاسی و قوتابخانەیەکی عەقیدەیین؟

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر لێکۆڵینەوەو سەرچاوەکان لەکۆن و نوێدا مشتومڕو قسەوباسێکی زۆر هەیە لەسەر ئینتیمای ئەندامەکان و بیروبۆچوونیان.

– (القفطي) قسە لەسەر ئەم مەسەلە دەکات دەڵێت ئەمانە لەلایەنگران و دواکەوتوانی قوتابخانەی موعتەزیلەن کە خاوەن پەیڕەو بیروڕایەکی ئەقلانین.

–بەڵام ئیسماعیلییەکان بە هاوڕێزێکی زۆر بۆ پەیامەکان هەندێکیان ناوی دەبەن بە (قورئان لەپاش قورئان)، ئەمانە بەشێوەیەکی فراوان پەیامەکان بەکار دەهێنن و کاری پێ دەکەن بۆیە جێی سەرسوڕمان نییە کاتێك دەبینین زۆربەی زانایانی هاوچەرخ–لە موسڵمان و ناموسڵمانەکان– پێیان وایە کە ئیسماعیلییەکان دانەری پەیامەکان بن.

عارف تامر کە نووسەرێکی هاوچەرخە و ئیسماعیلییە–بۆ نموونە– ریوایەتێك و گێڕانەوەیەکی درێژ و باوەڕپێکراو لەبارەی سروشتی پەیامەکانەوە دەهێنێت و ناوەڕۆکەکەی ناو دەبات بە (الفلسفة الإسماعیلیة).

–(عادل العوا) نووسەرێکی ترە پاڵپشت بە مەنهەج و میتۆدێکی تاڕادەیەك جیاوازە.

کەدامەزراوە لەسەر خوێندنەوەیەکی شیکاری بۆ پەیامەکان و لەجیاتی لکاندن و گرێدانی (إخوان الصفا) بە کۆمەڵێکی دیاریکراو دەبینین ناوزەدیان دەکات بەناوێکی نا رۆشن و نائاشکرا کە ئەویش "دوای موعتەزیلەکان یان ئەو دیو موعتەزیلەکان)، یاخود

ئەو هاوڕایە لەم بۆچوونەدا لەگەڵ هەندێ لە قوتابییەکانی (إخوان الصفا) ڕۆژئاواییە تازە پەیدابووەکان، هەرچەندە ڕاکەشی نائاشکرایی پێوە دیارە.

-دێینە سەر زانا ڕۆژئاواییەکان ئەوانەی کە گرنگی و بایەخ دەدەن بە فەلسەفەی ئیسلامی زۆربەی زۆری زانایانی ڕۆژئاوایی پێیان وایە کە (إخوان الصفا) و پەیامەکانیان پەیوەندی هەیە بە بزووتنەوەی ئیسماعیلییەوە لەوانە:

کازانۆڤا کە زانایەکی ئەوروپییە بەرگری لەم هەڵوێستە دەکات لە ساڵانی ١٩١٥ز، تاکو بەدوایدا هەریەك لە (گمولدتسیهر و ماکدۆناڵدولین بول و ماسینیون و إیفانوف) هاتن هەمان هەڵوێستیان دەربڕی، و ئەمانە دیارترین و ناسراوترین توێژەرەکانن لەم مەیدانەدا هەتاوەکو (إیفانوف) باوەڕی نەبووە بە بوونی کۆمەڵێك زانا لە بەسرەوە بە هیچ شێوەیەك، بەڵام ژمارەیەکی کەم لە زانایانی ڕۆژئاوایی- بۆ نموونە شستێرن و سارتون- ڕای نووسەرە ئیسلامییە کۆنەکانیان وەرگرتووە لە بارەی دانەرانی پەیامەکانەوەو کارەکانیان گەڕاندووەتەوە بۆ کۆمەڵێك زانا کە لەوانەیە لە بەسرەدابووبن..

لەگەڵ ئەم ڕایانەشدا زانایەکی تر بەناوی (کوربان)ەوە پێناسەیەکی تری هەیە بۆ (إخوان الصفا) و کە ئەمانە کۆمەڵێکن یاخود ڕێکخراوێکن لە پیاوانی زانست کە لە هەمان کاتیشدا دەنگی بزووتنەوەی ئیسماعیلی بوون. (١٩)

مەسەلەی دانەری پەیامەکان بووەتە بابەتێکی فرەلایەن و کێشەو قسەو باسی توێژەرەکان بۆیە بڕیاردان لەسەر دانەرانی کارێکی سەخت و ژوارەو بەشێوەیەکی تەواوەتی یەکلایی ناکرێتەوە ئەویش بەهۆی ئەو نهێنی و شاراوەییە کە لەم کۆمەڵەیەدایە.

باشتر وایە پێش هیچ بڕیارێك لەم مەسەلەیەدا بگەڕێینەوە سەر پەیامەکان خۆیان و کات و شوێن و مەبەستەکان کە یارمەتیدەرن بۆ ناسینی دانەرەکانی.

## کات و شوێنی إخوان الصفا و پەیامەکان

لە بۆ زانینی کاتی ئەم کۆمەڵەیە پێویستە بگەڕێینەوە ئەو سەردەمەی کە ئەم کۆمەڵەیە تیایدا دامەزراو چالاکییەکانی دەست پێ کرد و پەیامەکانیان تیادا نووسی. ئەوەی گرنگە بیزانین ئەوەیە کە پەیامەکان لەگەڵ ئەوەی کە فەرهەنگێکی رۆشنبیرییە، رێباز و پەیڕەو و سیستەمی ناوخۆییە بۆ رێکخراوەکە. و ناکرێت رێکخراوێك کە چالاکی سیاسی و رۆشنبیری و زانستی هەبێت، بەڵام پرۆگرامێکی ناوخۆیی و فیکری و سیستەمی کاری نەبێت.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دانان و نووسینی پەیامەکان ئەگەر لەگەڵ دروست بوونی رێکخراوەکەدا نەبووبێت ئەوا زۆریش لێی دوانەکەوتووە.

توێژەر و لێکۆڵەرەوەکان لە دیاریکردنی زەمەنی پەیامەکاندا و نوسینیان جیاوازییان هەیە:-

١-ئیسماعیلییەکان دانانی پەیامەکان دەگەڕێننەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی دووەم یان سەرەتاکانی سەدەی سێیەمی کۆچی، لەم کاتەشدا ئەو ئیمامانە ژیاون کە ئیسماعیلییەکان پەیامەکانیان دەخەنە پاڵ.

٢-(محەمەد فەرید) و (شیدر) پێیان وایە کە کۆمەڵەی (إخوان الصفا) لە فەیلەسوفە موسڵمانەکانی سەدەی سێیەمی کۆچین، و (فرید) دەرکەوتنی ئەم کۆمەڵەیە دەگەڕێنێتەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی دووەم و سەرەتاکانی سەدەی سێیەم، و لەو سەردەمەوە دەستیان کرد بە نووسینەوەی پەیامەکان، بەڵام لەوانەیە پەیامەکان بەم شێوەو شێوازەی ئەمڕۆ نەبووبێت و ئەم ناوەشی هەڵنەگرتبێت تا ئەم دواییە.

٣-کازانۆفا دەڵێ پەیامەکان لەماوەی نێوان ساڵانی ٤١٨-٤٢٧ك وا دانراوە، و لەم بۆچوونەیدا پشتی بەستووە بە شیکردنەوەی هەندێك دیاردەی گەردوونی کە لە پەیامەکاندا هاتووەو ئاماژەی پێ کراوە.

٤-زۆربەی ئەو توێژەرانەی کە لەسەر ئەم کۆمەڵەیە نووسیویانە دەرکەوتنیان دەگەڕێننەوە بۆ سەدەمی چوارەمی کۆچی و هەر لەوانە دیاریی کردووە بەنیوەی دووەمی سەدەی چوارەم.

بەلاٌمن (عمر الدسوقی) بۆ ئەوە دەچێت کە چالاکییەکانی (إخوان الصفا، دەکەوێتە نێوان سالاٌنی ٣٣٤ک- ئەو ساڵەی کە بوەیهییەکان چوونە ناو عێراقەوە- و ساڵی ٣٧٣ک. (٢٠)

ئەم بۆچوونانەی سەرەوە کە باسکران پشتیان نەبەستووە بەسەرچاوەیەکی راست و دروست کە جەخت لەسەر ئەو سالاٌنە بکاتەوە بەڵکو پشتیان بە هەندێ رای لاواز بەستووە ناگاتە پلەی یەقین و راستی. بۆیە پێویستە لەبۆ دیاریکردنی سەردەمەکەیان و چالاکی و نووسینی پەیامەکان و وەدوور لە راو بۆچوونی هەڵەو لاواز دەبێ بگەڕێنەوە سەر خودی پەیامەکان و ئەو دەقانەی کە لەنێویدا ئاماژەیان بۆ ئەو رووداوە مێژوویانە کردووە کە لەو سەردەمەدا بوون و رایەکی راست و دروسترمان دەدەنێ بۆ ناسینی مێژووی کۆمەڵەکەو پەیامەکان لەوانە:-

١-لە دەقەکاندا چەندە بابەتی مێژوویی ئەو سەردەمە باسکراوە لەوانە باسی پیاوێکی زانا دەکات کە راڤەی ژمارەکانی زانیوەو ناسراو بووە بە (أحمد الکیال) لە ساڵی (٣١٣ک) کۆچی دوایی کردووە.

و لە پەیامێکی دیکەدا باس لە (الانسان و الحیوان) دەکات کە رەخنەی (بەبەغایەکە) بۆ مرۆڤ تیایدا باس لە چاودەرهێنران و کوشتن دەکات، و یەکەم خەلیفەش کە چاوی دەرهێنرابێت خەلیفە (القاهر) بووە لە ساڵی٣٢٢ کۆچیدا.

وە هەروەها لە پەیامێکی تردا باس لە کوشتن و برین و لەعنەت کردنی یەکتر دەکات لەنێوان ئەهلی شەریعەتەکانداو باس لە (رافضي)یەکان و (جبری و قدری) و (ئەشاعیرەکانیش) دەکات ئاشکرایە کە ئیمامی ئەشعەری لە ساڵی ٣٢٤ک یان ٣٣٠کۆچی کردووە. (٢١)

٢-ئیبن تەیمیە نوسینی پەیامەکانمان بۆ دیاری دەکات کە لە "پاش سەدەی سێیەمەوە بووە کاتەکەی نزیك بووە لە دروست کردنی قاهیرەوە". و ئاشکرایە کە (جوهر الصقلی) دەستی کرد بە دروست کردنی شاری قاهیرە سالّی ٣٥٨ك، بەڵکو (ئیبن تەیمیە) هەوڵدەدات بۆ دیاریکردنی مێژووی نووسینی پەیامەکان بەشێوەیەکی وردتر کە پشت بەخودی پەیامەکان دەبەستێت و دەڵێت:

"هەر لە پەیامەکان خۆیاندا روونکراوەتەوەو نووسراوە کە لە پاش ئەوەی نەصرانییەکان دەستیان گرتووە بەسەر کەنارەکانی شامدا) و رۆمەکان دەستیان گرتووە بەسەر شامدا لە سالّی ٣٥١ك.

و پێدەچێت (ئیبن تەیمیە) پشتی بەو دەقە بەستبێ کە لە پەیامەکانی (إخوان الصفا)دا هاتووە باس لە ریزبەندی ئیمانداران دەکات "...ریزی پێنجەم ئەوانەن کە لایەنگرانیەتی لە موجاهیدەکان و تێکۆشەرەکانی دژی دوژمنەکانی کە پارێزگاری لە کەلێنی وڵاتانی پەیڕەوی شەریعەت بۆ ئەوەی دوژمنەکان سەرنەکەون بەسەریاندا و کاروباری ئاینەکەیان لێ خراپ بکەن.. هەروەکو چۆن رۆمەکان کردیان بەناوچەو شوێنی موسڵمانەکان). (٢٢)

بەو پێیە پەیامەکان- بەگوێرەی رای ئیبن تەبمیە- لەماوەی نێوان سالاّنی ٣٥٣ك-٣٥٧ك دانراو نووسراونەتەوە وە (د.فؤاد معصوم)دەڵێت:

ئەم راوبۆچوونەی (ئیبن تەیمیە)مان پێ قبووڵەو دەقی پەیامەکانیش ئاماژەیان بۆ راستی وردروستی ئەم رایە کردووەو باسیان لەو کاتە کردووە کە لە دەقەکانی پێشوودا بۆ مان دەردەکەوێت.

هەروەها (القفطي) ئەو زەمەنەی دیاریکردووە کە گفتوگۆ لەنێوان (ابن سعدان) و (ئەبو حەیان) رویدا، کە لە سالّی (٣٧٣ك) بووەو (زەید کوڕی رەفاعی) زیندوو بووەو تەوحیدی چاوی پێ کەوتووە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کۆمەڵەی (إخوان الصفا) لە سەدەی چوارەمدا بوون.

دواجار دەکرێت بڵێین کە ئەم رێکخراوە لەوانەیە دامەزرابێت لە نیوەی دووەمی سەدەی چوارەمی کۆچی، پاشان دەستکرا بە دانان و نووسینی بابەتەکانی کتێبەکە بەشێوەی پەیامەکان ئەمەش چەند ساڵێکی خایاندووە(٢٣).

-شوێنی کۆمەڵەی (إخوان الصفا):

لە پەیامەکاندا بەشێوەیەکی ئاشکرا و روون نابینین کە بارەگاو شوێنی ئەم کۆمەڵەیە و شوێنی دامەزراندنی ئەم رێکخراوە دیاری کرابێت، ئەوەی کە لە بەردەستدا بە قسەکەی (تەوحیدی) یە کە پێشتر باسکرا کە دەڵێت ئەمانە لە بەسرەدا بوون و دروست بوون لە قسەکەیدا هاتووە لە (زید بن رفاعی) یەوە کە: (لە بەسرەدا ماوەیەکی زۆر ماوەتەوە لەو ماوەیەدا چاوی بە کۆمەڵێك کەوتووە..)

بوونی ئەم کۆمەڵەیە و دامەزراندنی لە بەسرە دا جێی سەرسوڕمان و نامۆیی نییە، چونکە بەسرە بەهۆی شوێنە جوگرافییەکەیەوە، کە شوێنی پێگەشتن و چاوپێکەوتنی پیاوانی رۆژهەڵات بووە لە عەرەب و فارس و زەردەشتی و هیندی...هتد. لە رۆژانی دروست بوونییەوە لە سەردەمی (عومەری کوڕی خەتاب)ەوە بووەتە شوێنێکی گەورەی پێگەیشتن بۆ هەموو بەشە رۆشنبیرییە جیاوازەکان، هەر لەوێدا (حەسەنی بەسری) و (واصلی کوڕی عەطا)ی سەرۆکی موعتەزیلەکان و (نظام) و (الجاحظ) و (أشعري) و چەندەها کەسایەتی و زاناو پسپۆر لە هەموو بوارەکاندا دەرکەوتن و شوێن و پەنجەیان دیارە لە مێژوودا.

و لەپاش ئەوەی کە دڵنیابوون لەوەی کە شاری بەغداد بۆ بانگەشە بڵاوبوونەوەی رێبازەکەیان ئامادەیە کردیانە بنکەی سەرەکی خۆیان و چالاکییەکانیان تیادا دەست پێ کرد. (٢٤)

-سیستەمی رێکخستنی کۆمەڵەی (إخوان الصفا):

لەرێگەی خوێندنەوەی رێکخستنی ئەم کۆمەڵەوە دەبینین کە تەمەنی تاکەکان رۆڵێکی گرنگ و تایبەتی هەیە لە ریزبەندی و هاتنەخوارەوەی هەرەمی لە ناو رێکخستنەوەیاندا، چونکە تەمەنی مرۆڤ لە چەند قۆناغێك پێکدێت، هەر قۆناغە و

پێداویستی و تایبەتمەندی و قابیلیەتی خۆی هەیە. هەروەها توانای ئەقلی و هۆشیاری تاکەکان رۆڵی خۆی دەگێرێت، لەبەر ئەوەشە بۆ هەر قۆناغێك ئەو شتانەیان دیاری کردووە کە دەگونجێ لەگەڵ سروشتیدا. ئەم کۆمەڵەیە خۆیان دابەش کردبوو بەسەر چوار پلەدا کە هەر پلەیەك تایبەتی خۆی هەیەو تایبەتە بە کۆمەڵێك کەسەوە کە ئەگەر سەرکەوتوو بوو لەیەکەمدا بەرزدەبێتەوە بۆ پلەی دووەم هەتا پلەی چوارەم.

ئەو چوار پلەیەش ئەمانەن:-

**پلەی یەکەم:**

ئەم پلەیەش تایبەتە بەو ئەندامە سەرەتاییانەی کە تەمەنیان لەنێوان پانزە ساڵانە بۆ سی ساڵ، ناو دەبرێن بە (الإخوان الإبرار الرحماء) ئەمانە بە پاکێتی جەوهەری دەرونیان و ئامادەیی زهنی و زیرەکیان تایبەتمەندن و خاوەنی ئەو دەروونە پاکژەن. ئەمانە بەچینی خاوەن پیشەکان دادەنرێن و بنەڕەتی رێکخستن پێك دێنن.

**پلەی دووەم:**

ئەم پلەیەش تایبەتە بەو ئەندامانەی کە لەنێوان تەمەنی سی چل ساڵیدان، ناودەبرێن بە (الإخوان الإخبار الفضلاء)، ئەم پلەیەش پلەی سەرکردە خاوەن سیاسییەکانن کە لەم قۆناغەدا فەلسەفە وەردەگرن و دەیخوێنن، لەگەڵ ئەوەی سەرپەرشتی برایانی پلەی یەکەم دەکەن و سۆز و بەزەیی دەبەخشن پێیان.

**پلەی سێیەم:**

تایبەتە بەو ئەندامانەی کە تەمەنی چل ساڵیان تەواو کردووەو بەرەو پەنجا دەڕۆن و ناودەبرێن بە (الإخوان الفضلاء الكرام) ئەمانە خاوەن (ئەمرو نەهین) و چارەسەری ئەو کێشەو گرفت و جیاوازیانە دەکەن کە سەرهەڵدەدات لەنێوان برایاندا بەشێوەیەکی جوان و نەرم و لەسەر خۆ وە چاکی وباشی هەڵسوکەوت و بەڕێوەبردن.

لەگەڵ ئەوەی کاری رێکخستن و بانگەواز بەڕێوە دەبەن، هەر لەمانەش بەرپرسی ناوچەو لقەکان هەڵدەبژێرێت بۆ بەڕێوەبردنی ئەو بەش و لقانە.

**پلەی چوارەم:**

تایبەتە بەو ئەندامانەی کە تەمەنی پەنجا ساڵیان تەواوکردووە ئەوانەن کە (یشاهدون الحق عیانا) (حەق بەچاوی خۆیان و وەك خۆی دەبینن) کە هێزێکی بەدەست هاتووە لەپاش تەمەنی پەنجا ساڵی. ئەمە پلەی حەکیم و داناکانەو هەموو برایەك بانگ دەکرێ و بۆی هەیە بگاتە ئەم پلەیە وە بەرزترین پلەیە لە بۆچوون و تێروانینیاندا و هەچ کەسێك بگاتە ئەم پلەیە دەبێت بە (الواصلین) بەگوێرەی گوتەو دەربڕینی سۆفیەت، ئەمەش ئامادەکاری بۆ بەرزبوونەوە بۆ مەلەکوتی ئاسمانەکان و گەشتن بە راستییەکانی زیندووبوونەوەو پاداشت.

خاوەنی ئەم پلەیە ترۆپکی رێکخستن پێك دێنن و دەبنە سەرۆك و گەر تایبەتمەندی و خەسڵەتی پێغەمبەری تیادابوو گەر نا هەموویان پێکەوە دەبنە سەرۆك بە کۆمەڵی و ئەمەش پێی دەڵێن سەرکرایەتی جەماعی.

ماکدۆناڵد ئەم پلانەی ناو بردووە بە:- چینی مودید و خوێندەوارەکان پاشان مامۆستاکان پاشان سەرکردە یان مورشیدەکان پاشان نزیکەکان لە خودا یان (الواصلین).

کۆمەڵەی (إخوان الصفا)- بەپێی بۆچوونی د.فۆاد- لەم دابەشکردنەیاندا کاریگەری میتۆدەکەی ئەفلاتونیان بەسەرەوەبێت لە پەروەردەو زانستدا کە ئەویش پلەکان بە چەند قۆناغێك دیاری دەکات.

ئەم کۆمەڵەیە هەریەك لەو پلانەی باسکران بەڵگەی ئایینی بۆ دەبینێتەوەو پشت ئەستوری دەکات بە دەقێکی قورئانی بەم شێوەیە:-

١-بۆ قۆناغی یەکەم بەڵگەی قورئان دەهێننەوە کە دەفەرموێت "وإذا بلغ الإطفال منكم الحلم" بنورە:٥٩ ئەمەش پانزە ساڵییەوە دەبێت کە تاکەکان هەست بەهێزێکی ئەقڵانی جیاکەرەوە دەکەن.

٢-بۆ پلەی دووەم خودا دەفەرموێت "و لما بلغ أشدة أتيناة حكما وعلما" یوسف،٢٢ ئەمەش هێزێکی دانایيە لەسەر هێزە ئەقڵانییەکە لە پاش تەمەنی سی ساڵی.

٣-بۆ پلەی سێیەم: خودا دەفەرموێت "حتى إذا بلغ أشده وبلغ أربعين سنة قال رب أوزعني أن أشكر نعمتك التي انعمت على وعلى والدي وأن أعمل صالحا ترضاه"الاحقاف: ١٥

ئەمەش دەست پێ دەکات بە ئامادەیی هێزە (ناموسی)- شەرعی، یەکە لە پاش تەمەنی ٤٠ساڵی.

٤-بۆ پلەی چوارەم خودا دەفەرموێت "یا أیتها النفس المطمئنة إرجعي إلى ربك راضية مرضية فادخلي في عبادي وادخلي جنتي" الفجر: ٢٧-٢٨

ئەم پلەیەش دەست پێ دەکات بە ئامادەیی و بوونی هێزی (الملكية) بەهرەیی لە پاش پەنجا ساڵییەوە.

دەکرێ بڵێین ئەم رێکوپێکی و تەدەروجە لە پلەکانی (إخوان الصفا)دا پلەی بەرزبوونەوەیە لە رێکخستندا و نزیکبوونەوەیە لە پلەی باڵاو گەشتن بەراستییەکان(٢٥).

ئەوجا دێینە سەر کارەکانی (إخوان الصفا) و دابەشکردنی رێکخستنەکەیان.

**-بانگەواز:**

ئەم کۆمەڵەیە بە هەموو توانایەکیان هەوڵدەدەن بۆ جێبەجێ کردنی ئەو چەمکە تایبەتیەیان کە بڵاوکردنەوەی (الحكمة الخالدة) داناییەکی کۆتا نەبوو لەنێو تاکەکاندا یان ئەوەی کە (السهروردی) لەم دواییە دا ناوی دەبرد بە (الحكمة اللدينة) کە مرۆڤەکان ئەم حیکمەیان تێدایە بەشێوەیەکی بەردەوام.

لە پاش ئەو متبوون و شاراوەییەی لە "ئەشکەوتدا" بە درێژایی خولەکانی پێشووی مێژووی مرۆڤایەتی ئەم کۆمەڵەیە هەستان بە بڵاوکردنەوەی ئەو حیکمەیە و رێنمونی قوتابییەکانیان بۆ تەنیا راستییەك کە ئەو راستییە سەرچاوەو بنەڕەتە بۆ هەموو سەرچاوەو ژێدەرە جۆراو جۆرەکان کە زانست و ئیلهامەکانیان لێ وەرگرتووە هەروەکو باوەڕیان وایە کە بەرەکەت و خێری کۆتایی لە هەموو حاڵەتەکاندا لەوەوە سەرچاوە دەگرێت ئەویش ئاینی (ئیسلام)ە کە دابەزێنراوە بۆ حەقیقەت لەم خولەی ئێستای مرۆڤایەتیدا و گەشتنە بە مانا پڕ جوان و تێگەشتنی تەواو و دروستە لە مرۆڤایەتی.

لەو روانگەوە بوو ئەم کۆمەڵەیە سووربن لەسەر ئەوەی بانگەشە بۆ رێبازەکەیان بکەن و بڵاوی بکەنەوە لەنێو گەنجەکاندا نەك پیرەکان، چونکە باوەڕیان وابوو دەروونی گەنجەکان وەکو پەڕەیەکی سپی بێ گەردەو هیچ شتێکی لەسەر نەنووسراوە زووتر رێبازەکە قبولْ دەکەن و وەریدەگرن، لە پەیامەکاندا هاتووە..

(...لەسەرت پێویستە ئەی برا خۆت سەرقاڵ نەکەیت بە ئیسلاحکردنی پیرە پەککەوتووەکان کە لە منداڵییەوە هەڵگری چەندەها بیروباوەڕی خراپ و دابونەریتی نزم و خووڕەوشتی دڕندانەن. گەر دواتکەون چاك نابن، و ئەگەر کەمێکیش چاك بن سەرکەوتوو نابن، بەڵام دەست بگرە بە گەنجەکانەوە کە سنگ رولێکی پاك و تەندروستیان هەیە، ئامادەن و حەزیانە لە ئادابەکان و سەرەتان لە تێڕوانینیاندا بۆ زانستەکان) بەم شێوەیەش نەوەیەك دروست دەبێت کە رکەبەرایەتی و جەدەل و ئارەزوبازی نازانێت و دووردەبێت لە توندڕەوی مەزهەبی و بۆ ئەم بۆ چوونەشیان بەڵگەی قورئانی دەهێننەوە کە خودا دەفەرموێت (انهم فتية امنوا بربهم وزدناهم هدى) الكهف:١٣. و دەفەرموێت (قالوا سمعنا فتي يذكرهم يقال له إبراهيم) الأنبياء: ٦٠ و دةفةرموێت (واذقال موسى لفتاه) الكهف: ٦٠٠،(٢٦)

ئەم کۆمەڵە کاریان دەکرد بۆ ئەوەی ئەندامی تازە بهێننە ناو ریزی کۆمەڵەکەو ئامادەکردن و رێکخستنیان بە رێکخستنێکی پێویست و دروست بە جیاوازی چینەکانەوە.

شێوازی کارکردن و بانگەوازیان وەستاوە لەسەر باوەڕهێنان و باوەڕبونی بەرامبەر بەم کۆمەڵەیە سەرەتا شێواز و قەناعەتێکی هێمنانە بەکاردەهێنن و پاشانیش بەکارهێنانی هێز لە بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەیان لە قۆناغی کۆتاییدا، لەمەشدا پشت بە کاروکردەوەو قسەی پێغەمبەران دەبەستن و دەیانکەنە نموونەی کار بۆ خۆیان. (٢٧)

## شانەکان

وادیارە کۆمەڵەی (إخوان الصفا) کاریان بە سیستەمی (شانەی رێکخستن) کردووەو بەکارهێناوە کە ئەمڕۆ ئەم شێوەیە ناسراو و باوە لەلای پارتە هاوچەرخەکان، کە ئەندامانی هەموو شانەکە بەشێوەیەکی خولی بەسەر پەرشتی بەرپرسی شانەکە کۆدەبنەوەو بەیەك دەگەن بۆ گۆڕینیەوەی بارودۆخی گشتی و تاوتویٚ کردنی و باسکردنی، و دیراسەکردنی ئەو رێنمونیانەی کە لەسەرەوە دەهاتە خوارەوە بۆیان.

وەکۆبوونەوەی خولی پەیڕەودەکەن ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئیلتیزام و پەیوەستی رێکخستنی لەناو ئەم کۆمەڵەیەدا، بۆیە (برایان) لە هەر کوێیەکبن پێویستە هەستن بەم ئەرکەو جێبەجێی بکەن. و لەپەیامەکاندا هاتووە (پێویستە لەسەر برا کانمان خودا پاڵپشتیان بێت لە هەر شوێنێك بن لەم وڵاتەدا دەبێت شوێنکیان هەبێت بۆ کۆبوونەوە تیایدا لەکاتی دیاریکراوداو، کەسی بێگانە نەیەتە ناویان، و تیایدا باس لە زانستەکان بکەن و نهێنییەکانی تیادا باس بکەن).

(لە یەکەمەوە پەیام بە پەیام بخوینێتەوە تاکۆتایی..) و روونی بکاتەوەو راڤەی بکات بۆیان و گرنگی بدات بە پتەوکردن و بەهێزکردنی پەیوەندی لەنێوان ئەندامەکاندا. (٢٨)

## جفرەی نهێنی

ئەگەر سەیرێکی کاری ئەم کۆمەڵەیە بکەین دەبینین کە زۆر بەنهێنیانە کاریان کردووە هەتاکو ئەوەندە قوڵ بوونەتەوە لە نهێنی کاری رێکخستنیاندا نووسینێکی تایبەتی بەزمانی تایبەتی خۆیان داناوە وەکو هاتووە لە پەیامی (الجامعە)دا- و کاریان پیٚ کردووە، کە بەهۆیەوە پەیامەکانی نێوانیان دەگۆڕییەوە لەنێوان بانگەوازکەران و بنکەی سەرەکیان وەدەڵێن (وە بەباشمان زانی و بینیمان، کە ئەوەی دەمانەویٚ بینوسین..بە پیت و وشەیەك کە خۆمان رێکمان کردووەو ریزمان کردووە).(٢٩)

لەگەڵ ئەمەشدا کۆمەڵەی (إخوان الصفا) جفرەی تایبەتی خۆیان هەبوو کە ئاماژە بووە بۆ شتی تر نەك وشەکە وەك خۆی لە نووسینەکانیاندا و تەنیا خۆیان لەو جفرانە

تێدەگەشتن و کەسی تر تێ نەدەگەشت ئەمەش زیاتر ڕۆچوونە لە پاراستنی نهێنی یەکاندا.

لە ڕێکخستنەکانیاندا وادەردەکەوێت کە زۆر خۆیان پاراستووە لە هەموو شتێکدا بۆ ئەوەی نهێنییەکانیان ئاشکرا نەبێت لە ئارامی و ئاسایشدابن.

**بەڵام دەبێت هەڵوێستیان چۆن بێت ئەگەر ئەندامێك وازی هێنا لەو کۆمەڵە؟**

لێرەدا پێویستە بەرپرسی شانەکە پەیوەندی پێوە بکات و هەوڵبدات کاری تێبکات بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە ناوڕیزەوە (قسەی خۆشی لەگەڵ بکەن و بە نەرمونیان لەگەڵیدا بجوڵێنەوە..) ئەگەر سەرکەشی کرد (سزاکەی دەرچوونە لە هاوەڵێتی و پشتی پێ نابەسترێت و مامەڵەی لەگەڵ ناکرێت و قسەی لەگەڵ ناکرێت لە زانستەکانماندا.. و داوا لە براکانمان دەکەین دوورە پەرێزبن لێی..). (٣٠)

لەم قسانەش وا تێدەگەین کە ئەمانە بە سزا ئەدەبییەکە کۆتادێنن لە دەقەکانیشیاندا هیچ ئاماژەیەك نییە بۆ سەپاندنی سزای ماڵی بەسەریدا و پەنانابەن بۆ توندوتیژی..

لە کۆتایی ئەم بابەتەدا دەڵێین:- ئایا کۆمەڵەی (إخوان الصفا) ئەم ڕێکخستنە فراوانەیان هەبووە کە وەستاوە لەسەر بنەڕەتێکی پتەو و چالاکییەکی کارایان هەبووە، یاخود تەنیا دەرخستن و دەربڕینی وێنایەکی ڕێکخستنێکی نموونەییەو دەبێت وابێت؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە زۆر سەختە، چونکە نەبیستراوە کە ئەندامێکیان تۆمەتی ئەندام بوونی بۆ ئەم کۆمەڵە بەرەو ڕوو کرابێتەوە یاخود دادگایەك دادگایی یەکێك لە ئەندامەکانی کردبێت، وەلەلایەکی ترەوە دەکرێت کە ڕێکخستنەکەیان بەشێوەیەك پێك هاتبێت کە سیخوڕی دەسەڵات نەیتوانی بێت بچێتە ناوی و ڕێکخستنەکەیانی بە زاندبێت و بڕیبێتی. لەگەڵ ئەوەی کە ئەندامەکانیان زۆر ئاگاداربوون و هەڵسووکەوت و کاروچالاکیشیان جێی سەرنج و تێبینی نەبووە بەلایانەوە.(٣١)

## پەیامەکان

گەورەترین و مەزنترین کار کە ئەم کۆمەڵە کردبێتیان و بەجێیان هێشتبێت پاش خۆیان و بووبێتـە کولتوورێکی گرنگ لە مێژووی ئیسلامیدا و کۆکەرەوەی هەموو زانستەکان بێت و گشتگیر و هەمەلایەن بێت و بووبێتە سەرچاوەیەکی گرنگی زانست و مەعریفە و فەلسەفە، وتەنیا بلّندگۆ و نوسینێك بوو کە بتوانێت لەو سەردەمەدا باس لەو بارودۆخە زاڵە بکات بەسەر جیهانی ئیسلامیداو شیکردنەوەو رەخنەی لیّ بگرێت و نەخۆشییەکان دیاری بکات و چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە. ئەم کارو کردەوەو ئامۆژگاریانە کۆکرانەوەو کرانە فەرهەنگ و مەوسوعەیەکی گەورەو لەچەند کتێبێکی گەورەدا دانران و ناونرا (الرسائل)– (رسائل إخوان الصفا).

ئەم پەیامانە فەرهەنگێکی (مەوسوعە)یەکی، گەورەیە و فراوانە زۆربەی هونەرە رۆشنبیری و زانستییە ناسراو و باوەکانی ئەو سەردەمەو پێش خۆشی دەگرێتەخۆ لە پەنجاو دوو پەیام لە (هونەرەکانی زانست و سەیر و سەمەرەکانی دانایی و نوکتەو خورەوشت، راستێتی ماناکان لە قسەکانی ئەهلی تەسەوف پاکدا... ئەم پەیامانەش دابەشکراون بەسەر چوار بەشدا، لەوانە ماتماتیکی فێرکردن، و جەستەیی سروشتی، و دەروونی ئەقلانی، و شەرعی ئیلاهی). (٣٢)

بۆ زیاتر شارزابوون و ئاگابوون لە پەیامەکان و دابەشکردنی باشترە بگەڕێینەوە سەر پەیامەکان و تاوتوێکردن و دیراسەکردنی بەتایبەتی(الفهرست) ی پەیامەکان کە باس لەدابەش کردنی پەیامەکان دەکات.

### رێکخستنی پەیامەکان:

لەگەڵ ئەوەی سیفەتی دووبارەبوونەوە بوونی هەیە لە هەندێ فیکرەو بۆچوونی پەیامەکاندا، بەڵام شێوازی پێشکەشکردن و دەرخستنی بابەتەکان یەکدەگرێتەوە لەگەڵ فەلسەفەی (أخوان الصفا)دا ئەم کۆمەڵەیە زانستەکان دابەش دەکەن بەسەر سێ جۆردا:–

١–زانستەکانی ماتماتیك.

٢- زانستەکانی شەرع و دانراوەکان.

٣- زانستە فەلسەفییە رەواییەکان.

ئەم زانستانەش بۆ خۆی دابەش دەکرێت بۆ:-

أ-زانستە بنەڕەتییەکان:-

١-خوێندنەوەو نووسین

٢-سنتاکس و فەرهەنگەکان

٣-ژمێریاری و مامەڵە بازرگانییەکان.

٤-زانستی عروض و قیاس.

٥-بیروباوەڕی بەختی چاو بەختی خراپ.

٦-بیروباوەڕی سیحر و ئەستێرەناسی و دوعاو فێڵ و هاوشێوەکانی

٧-ئیش و کارو پیشەکان.

٨-بازرگانی و کشتوکاڵ و هاوشێوەکانی

٩-چیریك و ژیاننامەی کەسێتی.

ب-زانستە ئاینییە کان:-

١-زانستی تەنزیل (دابەزاندن).

٢-زانستی تەفسیر.

٣-زانستی فەرمودە.

٤-زانستی یاساو شەریعەت

٥-زانستی زوهد و تەسەوف

٦-راڤەکردنی خەون

ت-زانستەکانی فەلسەفە:-

١-ماتماتیکییەکان پێك هاتووە لە چوارگۆشەییەکان.

٢-زانستی(المنطق) لۆجیك.

٣-زانستەکانی سروشت ئەمیش حەوت بەشە:-

أ–زانستی بنەما جەستەییەکان:– گرنگی دەدات بەو بنەمایانەی کە تەحەکوم بە جەستەوە دەکات.

ب–زانستی ئاسمان:– پێکهاتووە لە زانستی ئەستێرەکان و جوڵەی هەسارەکان.

ت–زانستی گەردوون و خراپەکاری:– پێکدێت لە مەعریفەی هەر چوار بنەماکان و گۆڕانکارییەکانی، (ئاگر و ئاووهەواو زەوی) و کانزاو درەخت و گیانداران لێوەی دێتەبوون.

پ–زانستی رووداوە کەشییەکان:– پێکدێت لە ناسینی گۆڕانکارییەکانی کەشوهەواو کاریگەری ئەستێرەکان و رەشەباو هەورەبروسکە...هتد.

ج–زانستی کانزاکان.

ح–زانستی دارودرەخت (رووەك)

خ–زانستی گیانداران.

٤–زانستە ئیلاهییەکان:–لەمانە پێك هاتووە:–

أ–زانستە رۆحانییەکان.

ب–زانستە دەروونییەکان.

ت–ناسینی خوداو سیفاتەکانی.

ت–زانستی رامیاری:– پێکدێت لە زانستی پێغەمبەرایەتی. (٣٣)

پشت ئەستوری بەم شێوە دانان و رێکخستنە، کۆمەڵەی (إخوان الصفا) بە جۆرێك پەیامەکانیان رێکخستووە کە هەموو پرۆژە مەعریفی و زانستییەکان بگرێـەخۆ: بە زانستەکانی ماتماتیك و لۆجیك دەست پێدەکات و تێدەپەڕێ زانستەکانی سروشت و لاشەییەکان لەوێوە بۆ زانستەکانی دەروونی و کۆتاییدێت بە زانسەکانی لاهوتی.

لەپاش ئەم دابەشکردنە بۆ زانستەکان لەلایەن ئەم کۆمەڵەیەوە دێینە سەر چۆنیەتی دابەشکردنی پەیامەکان، جگە لە (الرسالە الجامعە) پەیامەکان لە پەنجاو دوو پەیام پێك دێت و لە پێرستی پەیامەکانیشدا، پەیامەکان کراوە بە چوار کۆمەڵەوە (کتێبەوە) بەم شێوەیەی خوارەوە:–

**یەکەم:- پەیامەکانی ماتماتیکی (فێربوونی ماتماتیك) ئەم بابەتانە دەگرێتەخۆ:-**

ژمارەیان چواردە پەیامە لە:-

١-ژمارەو تایبەتمەندی و ماهیەت و چەندێتی و چۆنیەتی ژمارە.

٢-لە ئەندازیاریداو روونکردنەوەی ماهیەتی چەندێتی جۆرەکانی و چۆنیەتی بابەتەکانی ئەندازیاری.

٣-لە ئەستێرەکاندا، نێواخنێك بۆ پێناسەی پێك هاتەی گەردوون و سوڕانی ئەستێرەکان...

٤-لە مۆسیقادا، و روونکردنەوەی ئەوەی کە ئاواز و سۆزەکان کاریگەرییان هەیە لە دەروونی گوێگرەکاندا.

٥-لە جوگرافیادا، مانای وێنەی زەوی و هەرێمەکان..

٦-نرخ و بەهای فێربوون بۆ ئەم بابەتانە.

٧-٨-لە پێشەییە زانستییە تیۆری و زانستی و پیشەییەکاندا.

٩-قسەو کرداری پێغەمبەران و حەکیم و داناکان و وتەکانیان.

١٠-١٤- لە لۆجیکدا (المنطق) (ئەمانە لەخۆدەگرێت:-

(لە ئیساگۆجیدا- ئەو شەش وشانەن کە فەیلەسووفەکان بەکاریانهێناوە لە (المنطق)دا.

لە دە وتەکاندا- کە هەریەکەیان رەگەزێکە لە بوونەکان، قاتیغوریاس.

لە باریمانیاسدا:- قسەکردنە لە دەستەواژەکان و دەربڕینی ماناکاندا بەڕاستێتی.

لە ئەنالوتیقای یەکەم و دووەم:- کە قیاس و بەڵگە دەگرێتەوە.

<u>کۆمەڵەی دووەم:- زانستە سروشتییەکان (جەستەییە سروشتییەکان)</u>

ژمارەیان حەڤدە پەیامە لە:-

١-هیولاو وێنەو ماهیەتیاندا، کات و شوێن و جوڵە چییە؟

٢-لە ئاسمان و جیهاندا، روونکردنەوەی چۆنیەتی چینەکانی ئاسمانەکان و چۆنیەتی پێکهاتەی گەردوون.

٣-لە گەردوون و خراپەکاریدا.

٤-لە شوێنەوارە بەرزییەکاندا، مەبەست لێی روونکردنەوەی چۆنیەتی رووداوی کەشوهەواو گۆڕانکاری هەوا لە روناکی و تاریکیدا، گەرمی و ساردی.

٥-لە چۆنیەتی پێکهاتنی کانزاکاندا، چەندێتی جەوهەرە کانزاییەکان، و چۆنیەتی دروستبوونی لە ناو زەویدا.

٦-لە ماهیەتی سروشت و چۆنیەتی کردارەکانی.

٧-لە رەگەزەکانی درەخت و رووەکدا و جۆرەکانی.

٨-لە رەگەزەکانی گیانلەبەر و مەبەست لێی روونکردنەوەی رەگەزەکانی گیانلەبەرانە و چەندێتی جۆرەکانی.

٩-پێکهاتەی جەستەیی و رۆشنکردنەوەی کە مرۆڤ جیهانێکی بچووکە.

١٠-لە هەست و هەست پێکراو، مەبەست لێی رونکردنەوەی چۆنیەتی دەرککردنی هەستەکان و هەست پێکراوەکان.

١١-لە شوێنی چاندنی نوتقە و چۆنیەتی پەیوەندی بە نەفسەوە.

١٢-لەمانای قسەی حەکیمەکانەوە کە (مرۆڤ جیهانێکی بچووکە).

١٣-چۆنیەتی بڵاوبوونەوەی گیانە پارچەییەکان لە جەستە مرۆییەنداو لە لەشە سروشتییەکاندا.

١٤-لە روونکردنەوەی توانستی مرۆڤ لە مەعاریفەکاندا تا چەندێکە.

١٥-لە ماهیەتی مردن و ژیان.

١٦-ماهیەتی چێژ و ئازاری جەستەیی و رۆحی.

١٧-لەهۆیەکانی جیاوازی زمانەکان وێنەی خەتەکان و دەستەواژەکان و چۆنیەتی بنەماکانی مەزهەب و ئاین و راو بیروباوەڕەکان..).

<u>کۆمەڵەی سێیەم:- زانستە دەروونییە ئەقڵانییەکان.</u>

لە کۆمەڵێك پەیام پێکهاتووەو ژمارەیان دە پەیامە لە:-

١-لە بنەما ئەقڵیەکاندا لەسەر رای فیساگۆرسییەکان.

٢-لە بنەما ئەقڵییەکاندا لەسەر رای (إخوان الصفا و خلان الوفا).

٣-لە مانای وتەی حەکیمەکان. کە جیهان مرۆڤێکی گەورەیە.

٤-لە ئەقڵ و مەعقولەکاندا.

٥-لە بازنەیی و سوڕانەوەو خولانەوەدا.

٦-لە ماهیەتی عیشق و خۆشەویستی دەروونییەکان و حەز و شەوقی بۆ یەك بوون (الاتحاد).

٧-لە ماهیەتی زیندووبوونەوەو (صور) و حەشرو قیامەت و حیساب.

٨-لە چەندێتی رەگەزی جوڵەکان و چۆنیەتی جیاوازی و بنەماکان و مەبەستی.

٩-لە هۆ و هۆکارەکان.. مەبەست لێی زانینی بنەماکانی زانستە و هۆکارەکانی.

١٠-لە سنوور و وێناکاندا. مەبەست لێی ناسینی راستی شتەکان و ماهیەت و رەگەز و جۆرەکانی کۆمەڵەی چوارەم:

لە زانستە ناموسییە ئیلاهییەکان و شەرعی ئاینییەکاندا، ژمارەیان یانزە پەیامە لە:-

١-لە بیروڕاو مەزهەبەکاندا، لە ئاینە شەرعییە ناموسی و فەلسەفییەکاندا..

٢-لە ماهیەتی رێگاو بۆ لای خودا، و چۆنیەتی گەشتن پێی.

٣-لە روونکردنەوەی بیروڕای (إخوان الصفا و خلان الوفا).

٤-لە چۆنیەتی پێکەوە ژیانی (إخوان الصفا)و هاریکاری یەکتری بە راستگۆیی و خۆشەویستی تەندروست و پاکێتی شەفەقەو بەزەیی.

٥-لە ماهیەتی باوەڕ و خەسڵەتی ئیمانداارانی راستەقینە.

٦-لە ماهیەتی ناموسی ئیلاهی و دانانی شەرعی، مەرجەکانی پێغەمبەرایەتی.

٧-لە چۆنیەتی بانگەواز بۆ خودا.

٨-لە چۆنیەتی کارەکانی رۆحانییەکان و جنۆکەو فریشتە نزیکەکان و شەیتانە دەرکراوەکاندا.

٩-لە چەندێتی جۆرەکانی سیاسەتدا.

١٠-چۆنیەتی ڕێکخستنەوەی جیهان.

١١-لە ماهیەتی جادو سیحر و تەلاسیمەکان.(٣٤)

## پەیڕەو ا مەنهەج ای پەیامەکان

هەر فیکرەو قوتابخانەیەکی سیاسی یان فەلسەفی، یا هەر قوتابخانەیەکی تر یاخود هەر دەستەو تاقمێك مەنهەج و پرۆگرامی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئەندامان و لایەنگرانی، و هەڵگری چەندەها مانشێت و لائیحە و سیماو خەسڵەت و ناوی تایبەتی خۆیەتی.

پەیامەکانیش خاوەن بەرنامەو پەیڕەو و پرۆگرامێکی تایبەتییەو ئامانج و مەبەست و ئاکامی خۆیان هەیە کە جودا دەکرێتەوەو جیاوازە لە نووسینە فەلسەفی و زانستییەکانی تر، پەیامەکان تەنها نوسینێك نین، بەڵکو لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەو رەخنەو خوێندنەوەی رەوشی ئەو سەردەمەیەو، فیکر و زانایی چەندەها زاناو فەیلەسووف و حەکیمی ئەو وەختەیە و کەتەلۆك و ڕێباز و قوتابخانەیە بۆ ئەندامان و دواکەوتوانی، هەر لەبارەی پەیامەکانەوە تەوحیدی دەڵێت:-

"پەیامەکان هەموو هونەرێکی بەبێ سنوور و تێروتەسەلی لەخۆ گرتووە، هەر لە پەیامەکاندا ئەفسانەو درکەو هەڵبەستراو لکێنراوی تیادایەو راستییەکان لە بەر زۆری هەڵە تیایدا نقوم بوون)(٣٥)

نزیك لەم بۆچوونە وتەیەکی (أبو سلێمان السبحستانی)یە کە دەڵێت: "ماندووبوون و شوێنی نەگرت، دایاننناو هیچیان دەست نەکەوت، لە دەورەی سوڕانەوەو نەگەشتنە ئاکام، گۆرانیان وت و سەماو هەڵپەڕکێ نەبوو، چنیانەوە، بەڵام بەتەنکی و نارێکی، دوورکەوتنەوە لەناوەند و لەچواردەوریدا بوون). (٣٦)

لێرەدا پرسیارێك دێتەگۆڕێ ئایا پەیامەکان تایبەت بوون بە کەسانی پسپۆڕ و شارەزا و یاخود بۆ کەسانی سەرەتایی و گشتی خەڵك بووە؟ یاخود بۆ ئەوکەسانەیە کە ڕۆچون لە فەلسەفەدا یان ڕێگای پسپۆڕیان گرتووەتەبەر لەم بوارەدا.. یان بۆ ئەوانەیە

کە تازە رێگای زانست و فێربوون دەگرنەبەر؟ کۆمەڵەی (إخوان الصفا)ش لە بارەی ئەم پرسیارانەوە وەلامی خۆیانیان هەیەو لە پەیامی پانزەدا دەڵێن:

"کارەکانمان پەیامەکانە، و نووسین و قسەکانمان کورتکردووەتەوە تیایدا وەکو دەلاقەو دەروازەو سەرەتایەك بۆ ئەوەی فێرخوازەکان تێبگەن لە پەیامەکان و تەماشاکردن و تێڕوانینی ئاسان بێت لای تازە پێگەیشتووەکان".

هەروەکو لە کۆتا پەیامیاندا دەڵێن: "ئێمە چ کارێك چاك و باش بێت بۆ کاروباری براکانمان حەزدەکەین و ئارەزوومەندین لەبەر ئەوەی زۆربەی ئامانجەکانمان لەوانە و بۆ وانە ئەم کتێبەمان بۆ راخستوون و والاکردن، و ناسین و زانینی بنەمای کاروپیشە زانستی و کردەییەکانمان تیادا باس کردووەو ئامادەمان کردووە بەپێی تواناو بەیارمەتی خودا، ئەوەی وای لێکردین لەسەر ئەم کارە ئەوەبوو کە تەنها یەك زانست و پیشەیەکمان باس نەکردووە، بەڵکو ئێمە دەزانین کە سروشت و کرۆکی خەڵکەکە جیاوازەو هەریەکەیان حەز لە کارو و زانستێك دەکات کە بگونجێت لەگەڵ سروشتیدا.. هەربۆیە لە پەیامەکاندا لە بنەمای پیشەو زانست و زانیارییەکانمان تیایدا باس کردووەو ببێتە یارمەتیدەر بۆ سەرەتاییەکان و وەرزشێکیش بۆ فێرخوازەکان.. (٣٧)

کۆمەڵەی (إخوان الصفا) لە پەیامەکانیاندا باسیان لە هەموو هونەر و رۆشنبیری و پیشەیەك کردووە و قسەیان لەسەر ئایین و فەلسەفەو میتافیزیك و ماتماتیك و زانستەکانی تر و رەوشت و هەڵسوکەوت و پەروەردەو شیعر و ئەدەبی و دەروونی مرۆڤ...هتد. کردووە. بەلام ئەگەر رۆشنبیری وەکو وتراوە:– شتێك لە هەموو شتێك بێت ئەوا پەیامەکان بەو شێوەیەن و هەوڵدانە بۆ پراکتیزەکردنی ئەو مەفهومە بۆ رۆشنبیری لە قۆناغی یەکەمدا. ئەم کۆمەڵەیە زیاتر بایەخیان دەدا بە بلاوکردنەوەی رۆشنبیرییەکی گشتگیری و هەمە بوار و هەمەلایەن.

هەروەکو یەکێك لە توێژەرەکان دەڵێت:–

"کە ماددە و موفرەداتی پەیامەکان زیاتر کورتە و پوختە و پراکتیزەکردنەکانە لەنێو پەیامەکاندا نەك تێڕوانینێکی قوڵ و رۆچوو لە زانست و فەلسەفەدا".

توێژەرێکی تر دەڵێ:– "پەیامەکان وەکو مەوسوعەو فەرهەنگێك وایە کە مەسەلە فەلسەفییە سەرەتاییەکانی بەشێوازێك واڵا کردووەو ئاسانی کردووە کە لەگەڵ ئەقڵیەتی گشتیدا بگونجێت و دوور نەکەونەوەو هەڵنەیەن لە فەلسەفە".(٣٨)

ئەم شێوازە لە نووسینەوەی پەیامەکان کەموکورتی نییە بۆ پەیامەکان بەڵکو دەلالەت و بەڵگەیە بۆ توانایيەکی بەرز بۆ وەرگرتنی و جێگیربوونی زانستی تیایدا.

**سەرچاوەی پەیامەکان**

کۆمەڵەی (إخوان الصفا) و پەیامەکانیان رۆڵێکی کاریگەر و باڵا گرنگیان هەبووە لە کۆکردنەوەو یەکخستنەوەو رێکخستنەوەی زۆربەی مەعاریف و زانستە ئیسلامییەکان بەشێوەی مەوسوعەیەکی کۆکراوە.

هەر توێژینەوەو نووسین و بابەتێکی فەلسەفی پشت دەبەستێ بە چەند سەرچاوەو ژێدەرێکی مەعریفی و باوەڕپێکراو سود لەو فیکر و بۆچوون و رایانە وەردەگرێت کە لە پێشخۆیدا هەبووەو هەندێ جاریش کاریگەری دەبێت و یاخود دووبارەبوونەوەی پێش خۆیەتی یان چاکسازی تیادا دەکات پەیامەکانیش وەکو نووسینێك و کاری مرۆڤەکان لەوەتێ ناپەڕێت کە سوود و کەڵکی لە هەندێ سەرچاوەو فیکر و ئایدۆلۆجیای پێشخۆی وەرگرتبێت و کاریگەری هەبێت بەسەر نووسەری پەیامەکانەوە.

لێرەدا باس لە راو بۆچوونی ئەو زاناو توێژەرانە دەکەین کە قسەیان لەسەر ئەم بابەتە کردووە، یاخود پەیامەکان ئاماژەیان بەو سەرچاوانە کردووە یان نەخێر..؟

زانایەکی ئەڵمانی بەناوی (فلوگل) لە نوسینێکیدا لە بارەی کۆمەڵەی (إخوان الصفا) و پەیامەکانەوە جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە سروشت و پێکهاتەی پەیامەکان ئەقلانیەت و موعتەزیلی پێوە دیارە. بەڵام ئەگەر سەیرێکی بیروڕا ئەقلانییەکانی موعتەزیلە بکەین لەلایەك، وەبیروبۆچوون و تێڕوانینەکانی ئەم کۆمەڵەیە لەبارەی زانستە گەردوونی و ئەو دیو سروشتییەکانەوە (میتافیزیکیا) لەلایەکی ترەوە، دەبینین

راکەی فلوگل زەحمەتە تێگەشتنی و وەرگرتنی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەندەها زانای هاوچەرخی سەدەی بیستەم ئەم رایەیان پێ قبوڵەو پشتگیری دەکەن، لەوانە:–

(براون Browne و نیکلسۆن Nicholson) هەمان بۆچوونیان هەیە.

لەکاتێکدا (میگل ئاتن بلاتیوس) پێیوایە کە پەیامەکان پێکهاتووە و بریتییە لە تێکەڵی نێوان (سروش و ئیلهام)ی هەریەك لە شیعەو موعتەزیلە.

و لەبەر پێویستی ژیان و بیروباوەڕی ئەوانەی کە (بورکلوس) ناویان دەبات بە زنجیرەی زێڕینی فەیلەسوفە فیساگۆرسییەکان، هەروەها "وەکو لەجیهانی ئیسلامیدا ناوزەد دەکرێت بە کۆمەڵەی جابرییەکان بۆ شایتمەندی مێژوویی وادەکات کە کاری بەدواداچوونی سەرچاوەی پەیامەکان وەربگیرێت لە سەرچاوە (فیساگۆرسییەکان و جابرییەکان) لە زۆربەی زانیارییە گەردوونییەکاندا.

ئەم کۆمەڵەیە پێیان وایە و چەند جارێك دووپاتیان کردووەتەوە لە پەیامەکاندا کە ئەوان لە دواکەوتووان و لایەنگرانی (فیساگۆرس و نیقوماخوسن) بەتایبەتی لەو بوارەی کە پەیوەندی هەیە بە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە لەسەر (ژمارەکان) کە دایدەنێن بە کلیلی تێگەشتنی سروشت و شرۆڤە و راڤەی رەمزی میتافیزیکی بۆ ژمێریاری و ئەندازیاری. ئەمانە لەگەڵ ئەوەشدا فیساگۆرسییەکان بەراورد دەکەن بە (حەڕانییەکان) کە پەیوەندییان هەیە بە(برایانەوە). ئەوەی پەیوەست بە پەیوەندی (إخوان الصفا) بە (جابری کوڕی حەییانەوە) رەنگدانەوەی نووسینەکانیەتی لە پەیامەکانداو سودیان لێوەرگرتووە.

کەواتە بەوپێیە پەیامەکان: "فەرهەنگێکی زانستییە خاوەن سروشتێکی فیساگۆرسییە، دەستی پێکردووە بەشێوازێکی (ئیسماعیلی– باطني).

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر (جابری کوڕی حەیان) خۆی پێیوابووە زانیاری و زانستەکانی داناکانی یۆنانی بەتایبەتی زانیاری فیساگۆرس و بالینوس نەبووەتە تەنها سەرچاوەو ژێدەر بۆ فەلسەفەو زانستەکەی بەڵکو ئەو حیکمەت و دانایی یەمەنییە

کۆنەکانی وەرگرتووەو لەگەڵ ئەوەشدا خوێندنە ئاگادار بووە بە زانستەکانی هێندۆسیش.

گرنگی ئەم سەرچاوانە هەرچۆنێك بێت، ئەوەی کە گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە کۆمەڵەی جابری ژمارەیەك لە رەگەز و بنەمای خاوەن بنەڕەتی فیساگۆرسی و هەرمەسی دەگرێتەوەو سودی لێوەرگرتووە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ فیکرە کە دەدرێتە پاڵ فورس و هیندییەکان و هەندێك لە چینییەکان کە سوودیش لەوانە وەرگیرابێت. (٣٩)

ئەم پەیوەندییە توندەی کە هەیە لەنێوان پەیامەکان و کۆمەڵەی جابریدا وادەکات سەرچاوەکانی جابری، هەروەها بەشێوەیەکی سروشتی ببنە سەرچاوە بۆ (إخوان الصفا)، و پێڕست و ناوەڕۆکی پەیامەکانیش ئەم راستییە لە بارەی سەرچاوە گشتییەکانەوە دووپات دەکاتەوە کە ئەگەر سەیرێکی پەیامەکان بکەین ئەو پەیوەندییە بەتینە دەبینین لە کاریگەری و شوێنەواری فیساگۆرسی– هەرمەسی لەسەر بیروباوەڕی حەرانییەکانەو هەڵسوکەوتیان. هەروەها کاریگەری فەلسەفەی (المشائیە) لە هەندێ بابەتدا، هەروەها هەندێ کاریگەری و شوێنەواری فارسی و هندی بە روونی دەبینرێت لە هەندێ بەشدا کە پەیوەندە بە بابەتە جوگرافی و ژینگە و مۆسیقاو زمانەوانییەکانەوە.

لەگەڵ ئەمانەشدا قورئان کاریگەری هەبووەو زۆربەی تێڕوانینەکانی (إخوان الصفا) دەگرێتەخۆو هەندێ لە بەشی زانستی گەردوونیان بە زاراوە قورئانییەکان راڤەکردووە.

ناکرێت سەرچاوەکانی (إخوان الصفا) دابنێت تەنها بە دەقێکی مێژوویی و بەس، چونکە ئەوان بەخوێنەرانی رادەگەیەنن لە یەکێ لە برگە درێژەکانی پەیامەکەیاندا کە سەرچاوەکانیان هەمەلایەن و گشتگیرە، لە دابەزێنراو و سروشتی و لەپاڵ دەقە نووسراوەکاندا ئەمانە هەمووی دەگرێتەخۆ.

لە پەیامێکیاندا دەڵێن:–

لە پەیامی دووەمدا باسمان کردووە کە زانستەکانمان بە گشتی لە چوار کتێب وەرگرتووە،

**یەکەمیان:** ئەو کتێبە نووسراوانەیە لەسەر زاری حەکیم و فەیلەسووفەکان دانراوە لە ماتماتیك و زانستە سروشتییەکان، **دووەمیان:** ئەو کتێبە دابەزێنراوانەیە کە پێغەمبەران هێناویانە وەکو (تەورات و ئینجیل و فورقان و قورئان)...هتد.

**سێیەم:** کتێبە سروشتییەکان، ئەویش وێنەی شێوەی بونەکانە بەو شێوەی کە ئەمڕۆ هەیە لە پێکهاتەی گەردوون و بەشەکانی بورجەکان جوڵەی ئەستێرەکان و هەسارەکان.

**چوارەم:** لە کتێبە ئیلاهییەکان وەرگیراوە کە کەس ناتوانێت دەستی لێبدات تەنیا فریشتە پاکەکان نەبن.

کەواتە چوار (کتێب) هەیە کە (إخوان الصفا) زانستەکانیان لێوەرگرتبێت ئەویش کتێبی ماتماتیك و زانستەکانی دیکە, کە پێشتر نووسراوەتەوە، و کتێبە پیرۆزەکان، و فیکر و را ئەفلاتونیەکان بۆ شکڵ و شێوەی سروشت، و کتێبی سروشت و نیگا لە فریشتەکانەوە یاخود ناو دەبرێت بە (الکشف العقلی) "ئاشکراکردنی ئەقڵی" لە زاراوەی هاوچەرخدا. (٤٠)

سەرچاوەو پەراوێزەکان:-


١-الفكر التربوي في الاسلام، د.محمد حسن العمايرة. ص١٦٩، و ظهر الإسلام، أحمد أمين ج٢ ص١٤٣.

٢-تاريخ الفلسفة في الإسلام،ص٩٥

٣-إخوان الصفا فلسفتهم وغايتهم،ص١٩.

٤-ظهر الإسلام، ج١ ص١٠-١١، إخوان الصفا فلسفتهم وغايتهم، ص٢٠-٢٣، تاريخ الإسلام السياسي، ج٣، ٤٢٣.

٥-الكامل في التأريخ ج٦/١٦١، تاريخ الإسلام السياسي ج٣ص٤٢٣، إخوان الصفا فلسفتهم و غايتهم، ص٢٦-٢٧.

٦-دراسات في العصور الإسلامية.ص٨٠

٧-ظهر الاسلام ج٢/٢٢٨ تأريخ الاسلام السياسي ج٣ ص٤٢٤ اخوان الصفا فلسفتم وغايتهم ص٢٦-٢٧.

٨-ظهر الإسلام، ج٢/ص٢٤٥-٢٤٦. إخوان الصفافلسفهم وغايتهم ص٣٤-٣٥.

٩- إخوان الصفا فلسفتهم وغايتهم، ص٣٩.

١٠-سەرچاوەی پێشوو ص٣٩-٤٠. ظهر الإسلام،ص٩٥.

١١-رسائل إخوان الصفا٤/١٦٥.

١٢-ئەکادیمیەی فەرەنسی، دامەزێنەرەکەی (کاردینال ریشیلیو)ی گەورەو وەزیرانی لویسی سیازدەهەم و حاکمی فەرەنسا بوو لەساڵی ١٦٣٥.. إخوان الصفا فلسفتهم وغايتهم،ص٦٨.

١٣-ظهر الإسلام ١٤٣/٢، إخوان الصفا،٥٦-٥٨.

١٤-رسائل إخوان الصفا هويتها و محتواها.

١٥-أخبار العلماء بأخبار الحكماء،٥٨.

١٦-گروهی ئیسماعیلی:- ئەم ناوە وەرگیراوە لەناوی ئیمامەکە یانەوە (إسماعيل بن جعفر الصادق) کە دەکاتە ئیمامی حەوتەمی شیعەکان، و ناوبراون بە (السبعية)، وە بە (التعليمية) لەبەر ئەوەی بنەمای رێبازەکەیان بریتییە لە پوچەڵکردنەوەی راو بۆچوونە ئەقڵییەکان و بانگەشەکردنی خەڵك بۆ فێربوونی زانست لە ئیمامە مەعصومەکانەوە، و تێگەیشتن لە زانستەکان لە رێگەی فێربوون و زانینەوە دەبێت لای ئەمان و (بروکلمان) پێی وایە:- کە بناغەو تەعالیمی ئەم رێبازە بونیاد نراوە لەسەر تێکەڵکردنی مەزهەبە ئاینییە جیاوازەکان و راوبۆچوونە سیاسی و کۆمەڵایەتی و بنەما فەلسەفی و زانستییە جۆراوجۆرەکان.

ئەم گروهە سەرەتا وەکو تاقمێکی میانڕەوی شیعی دەستیان بە بانگەشە کردن و کارکردن کرد، بەڵام ئەم گروهە گۆڕان هات بەسەریدا و گەشتە ئەوەی کە ئەم گروهە کۆکراوەبن لە نێوان ئیلحاد و ئیباحیەتداو داوای ئازادی رەها بکەن لە هەموو کار و هەڵسوکەوتێکدا) ئەم گروهە لە کۆتاییەکانی سەدەی (٣٠٠ك) کۆتایی سەدەی (٤٠٠ك)دابوون. سوود لە (دراسات ق الفرق و العقائد الآسلاميه)ی د.عرفان عبدالحميد وەرگیراوە.ل.٦٠.

١٧-رسائل إخوان الصفا هويتها و محتواها.

١٨- إخوان الصفا فلسفتهم وغايتهم٥٣-٥٤.

١٩-رسائل إخوان الصفا هويتها و محتواها.

٢٠- إخوان الصفا فلسفتهم وغايتهم٥٩٠-٦٠.

٢١-الرسالة ٢٢-٣٦١/٢، الرسالة ٣١-١٦١/٣.

٢٢-بغية المرتاد، إبن تيميه- مجموعة الفتاوي ٥٩/٥، تأريخ الإمم الإسلامية (الدولة العباسية)٣٨٩.

٢٣- إخوان الصفا فلسفتهم وغايتهم٦٤٠.

٢٤-سەرچاوەی پێشوو.٦٥-٦٦.

٢٥-ظهر الإسلام ١٤٧/٢، تأريخ الإسلام السياسي٣/، إخوان الصفا فلسفتهم وغايتهم٧٣-٧٦، رسائل إخوان الصفا هويتها ومحتواها.

٢٦-الرسالة ٤٥-٤١/٤.

٢٧- إخوان الصفا فلسفتهم وغايتهم،٨١.

٢٨-الرسالة٤٥-٤١/٤، الرسالة الجامعة ٣٩٧/٢-٣٩٨.

٢٩-الرسالة الجامعة٧٢٥/١.

٣٠-الرسالة الجامعة٤٠١/٢، الرسالة ٤٧-١٢٧/٤-١٢٨.

٣١- إخوان الصفا فلسفتهم وغايتهم،٨٥.

٣٢-الرسائل-الفهرست-٢١/١.

٣٣-رسائل إخوان الصفا هويتها ومحتواها.

٣٤-الرسالة ٢١/١.

٣٥-الإمتاع و المؤانسة،٥/٢.

٣٦-سەرچاوەی پێشوو.٦/٢.

٣٧-الرسالة الأخيرة ٣٩٤/٤.

٣٨- إخوان الصفا فلسفتهم وغايتهم،٩٧-٩٨.

٣٩-رسائل إخوان الصفا هويتها و محتواها.

٤٠- سەرچاوەی پێشوو.

**سەرچاوەکان:-**

١-قورئانی پیرۆز

٢-أخبار العلماء بأخبار الحكماء. جمال الدين القفطي، مطبعة السعادة، القاهرة، ١٣٢٦ه.

٣- إخوان الصفا فلسفتهم وغايتهم، د.فؤاد معصوم، دار المدى،١٩٩٨م.

٤-الإمتاع والمؤانسة، أبو حيان التوحيدي، صححه و ضبطه احمد أمين وأحمد الزين، المكتبة العصرية، بيروت.

٥-بغية المرتاد، ابن تيمية. مجموعة الفتاوي. دار المعارف، مصر١٩٦٧.

٦-تأريخ الإسلام السياسي والديني والثقافي و الإجتماعي، د.حسن ابراهيم حسن، دار أحياء التراث، العربي،ط٧، بيروت، ١٩٦٥م.